# زانستی میرات دابەشکردن






أمجد محمد زاهد



## زانستی

# میرات دابەشکردن


نوسینی

**أمجد محمد زاهد**


مامۆستا محمد طاهر محمد زین العابدین و
د. احمد بالیسانی و د. صباح بەرزنجی
پێشەکییان بۆ نوسیوە




بڵاوکردنەوە و ڕاگەیاندن

نـــاوی کتێـــب: زانستی میرات دابەشکردن

نـــاوی نوســـەر: امجد محمد زاهد

بڵاوکردنـــەوەی: نوسینگەی تەفسیر بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن/هەولێر

نەخـــشەسازی: جمعه صدیق کاکه

خـــــــەت: نـــەوزاد کۆیـــی

بـــــــەرگ: ئەمیـن مخـلـص

نۆرە و ساڵی چاپ: یەکەم ١٤٣٠ك ـ ٢٠٠٩ز

تـــــــیراژ: ١٠٠٠ دانە

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان ژمارەی سپاردن ( ٦٠٥ ) ساڵی ٢٠٠٩ ی پێدراوە

تفسیر

بۆ بڵاوکردنەوە و ڕاگەیاندن

هەولێر- شەقامی دادگا - ژێر ئوتێلی شیرین پالاس

ت : ٢٢٢١٦٩٥ - ٢٢٣٠٩٠٨- ٢٥١٨١٣٨

مۆبایل : ٠٧٥٠ ٤٦٠ ٥١ ٢٢ - ٠٧٧٠ ١٣٨ ٧٢ ٩١

tafseeroffice@yahoo.com
tafseeroffice@maktoob.com
altafseer@hotmail.com

## بەناوی خوای گەورەو میهرەبان

سوپاسی بێ پایان بۆ خوا، درود بۆ گیانی پاکی حەزرەتی محمد المصطفی وە بۆ گیانی سەرجەم یاران و پەیڕەوانی تا ژیان هەیە لەژێر ئەم گونبەزە شینە بەسەر ئەم تۆپە زەویە ڕەنگینەوە .

زانستی پەیوەند بە میرات بەشێکی گران و هەمەڕەنگی بایەخدارە لە شەریعەتی ئیسلامدا، بێ وێنەیە لە هەموو سەر زەویدا، لەلایەن زانایانی لێهاتووی بواری فیقهو شەریعەتەوە بایەخی زۆری پێدراوە، بە زمانی جۆراوجۆر و لەهجەی ڕەنگاوڕەنگ پەرتووکی تێدا دانراوە، زانایانی کوردی وەکو شێخی نۆدیهی و ئیبنو ئادەم بەشداری بەرچاویان تێدا کردوە .

وە بۆ ئاسان کردن و پاراستنی لە بیرەوەچوون و پشت گوێ خستن، وە بۆ کارپێکردن، زانایانی کورد بە زمانی شیرینی خۆیان چونەتەوە مەیدان، چ بە وەرگێڕان و چ بە پەرتووک دانان فرمانی (تعلَموا الفرائض و علَموها الناس)یان جێ بەجێ کردوە .

ئەم دانراوەی مامۆستا (أمجد محمد زاهد)ە نۆبەرە بەرهەمەکەیەتی، دوای چاو گەڕاندن بوە بە زۆربەی سەرچاوەکاندا، گردو کۆو ڕاڤە و شیکاری مەسەلەکانی دابەشکردنی میراتە، بە ئوسلوبی سەهل و ئاسان و حیسابیانە و زانستیانەی باوی سەردەم هەموو بابەتەکانی پێوە پێچاوە و ڕوونی کردونەتەوە، کە سەرنجی دەدەین لە دەسپێکەوە بۆ پێشەکی، و تادەگاتە بەشی یەکەم و دەڕوات تا حەوتەم و کۆتایی، دەبینرێت ڕیزبەندی بەشەکان و باسەکان و مەسەلە حیسابیەکان شاکارێکی بابەتیەیە، داگرەوەی سەرجەم (زانستی میرات دابەشکردن)ە، ناو و ناوەڕۆك جووتی یەکن، کەلێنێکی کتێبخانەی کوردی پڕ دەکاتەوە لەو زانستەدا .

نوسەر خۆی بۆ ماندوو کردوە، خزمەتێکی بەرچاوی کردوە بە پەیوەندداران و فێرخوازانی زانستی میرات دابەشکردن .

شیاوی ئافەرین و دەست خۆشییە لەم نۆبەرە بەرهەمەیدا، هیوا وایە لەگەڵ لێهاتوانی بوارەکانی زانستە شەرعییەکاندا باشتر خۆیان ماندو بکەن، سەرەڕای خزمەت بە زمانی کوردی، ماندوویەتی عەودالآنی زانستی دینی خوا دەربکەن، پاداشتیش لە خوا داوایە بۆیان .

لە سەرەتاو کۆتاییدا درودو سەلام بۆ حەزرەتی محمد (S)

وصلى الله وسلم عليه وعلى آله وصحبه وأمته وكل من اتبعه إلى يوم الدين .

محمد طاهر محمد زين العابدين

٢٠٠٩ / ٥ / ٦

بسم الله الرحمن الرحيم

سوپاس و ستایش بۆ خوا و سەلام و دروودی زۆر لەسەر پێغەمبەری خوا و یارەکانی و هەموو موسوڵمانان هەتا ڕۆژی دوایی.

ئەم کتێبە کە لە زانستی میرات و دابەش کردنی دا نوسراوە بە شێوەیەکی زانستییانە و پتەو لەسەر مەزهەبی ئیمامی شافیعی ڕەحمەتی خوای لێ بێت، و پایای بەرزبێت لای خوا.

بەڕاستی بۆم دەرکەوت کە کتێبێکی شایستەیە بۆ خوێندنەوە و سوود لێوەرگرتن لەلایەن فەقێ و مەلایان، یان قوتابی و مامۆستایان، و ئەوانەی کە ئەیانەوێ بە چاکی مەسەلەکانی میرات تێبگەن بە زوبانی شیرینی کوردی. و ئەمەش سەرنجمان ڕادەکێشێت بۆ ئەوەی کە پێویستە گشت زانایانی ئێمە ئەوەی کە لە توانایاندا هەیە بەگشتی زانستەکان بە هەموو جۆرەکانیەوە بکەنە کوردی بۆ پێشخستنی ڕۆڵی زانستی کورد.

هەروەها دانانی ئەم کتێبە گوێڕایەڵییە لە فەرموودەی پێغەمبەر کە ئەفەرموێ: (تعلَموا الفرائض و علَموها الناس )، جگە لەوەی کە بەشداربوونە لە پێشخستنی بزووتنەوەی زانستی ئیسلامی و گەیاندنی بە موسوڵمانانی کورد زوبان.

بۆیە خاوەنەکەی شایەنی سوپاسی ئێمەیە، وە سکالاشمان لای خوا ئەوەیە کە پاداشتی بداتەوە، و یارمەتی بدا بۆ بەرهەمی زیاتر.

د. أحمد الشيخ محمد الباليساني
٢٤ / ١١ / ٢٠٠٨

به ناوی خوای گەورەی میهرەبان

سوپاس و ستایشی بێ پایان هەر شایستەی زاتی بێچوونی خودایە، کە ژیان و مردن بە دەست ئەوە، و یاساکانی گەردوون و بوون ئەو داینـاون.

درووود و سلاوی نەبڕاوە لەسەر گیانی سەروەر و سالاری مرۆڤایەتی حەزرەتی موحەمەد بێت، کە نقێمی نگینی ژیان و سەردەستەی خێڵی خواپەرستانە بۆ گەیشتن بە مەبەستی ئەم جیهان و ئەو جیهان. هەروەها لەسەر گیانی یار و یاوەر و ئالویەیت و شوێن کەوتوانی.

ئاینی ئیسلام لە ڕووی ناوەڕۆکی یاسا و بەرنامەکانییەوە، بۆخۆی مەنزوومە و سیستەمێکی سەربەخۆیە، و لەبەرگری چەندین قوتابخانە و ڕێبازی تایبەتە.

یەك لەو ڕێبازانە مەدرەسەی ئیمامی شافیعییە، کە بە گەواهی مێژوونووسان و یاساناسان مەدرەسەیەکی میانەیە لە نێوان ئەهلی ڕەئی عێراق و ئەهلی حەدیسی حیجازدا، لە ئامێزی ئەم قوتابخانە فیکری و یاساییە چەندەها زانای بە توانای وەکو موزەنی و رافیعی و نەوەوی، و دواتر شیرازی و غەزالی و ئیبنو حەجەر و ڕەمەلی دەرکەوتوون و خزمەتیان بە بواری فیقهو یاسای ئیسلامی کردوە.

زانایانی کوردستانیش لەڕووی تێگەیشتن و داناییەوە بەشێکن لە برەوپێدەرانی ئەم مەدرەسەیە، کە لە کۆن و تازەدا بەرهەمی ناوازە و جوانیان پێشکەش بە کتێبخانەی فیقهو یاسا کردوە.

کافییە بۆ ئێمە لەم ڕەوتەدا ئاماژە بە مەلا ئەبووبەکری موسەننیفی چۆڕی و (وضوح) ەکەی بکەین، کە ئەگەر جەوری زەمانە نەبایە، هیچی لە (توحفە) ی ئیبنو حەجەر کەمتر نیە.

یاخود فەتاوا و بۆچوونەکانی (نۆدشی و پێنجوێنی و قەرەداغی) کە هەرکامێکیان لە ئاسۆی خۆیدا ئەستێرەیەکی درەوشاوەی عیلم و زانست و حیکمەت و فەقاهەت بوە.

زانایان لەبەر گرنگی عیلمی فرائض (مواريث) بەجیا لەوەی لە کتێبە

گشتی‌یەکانی فیقهدا باسیان کردوە، نوسراوی تایبەتیشیان لەسەر داناوە، بەتایبەت لە کوردستاندا ژمارەیەکی باش کتێبی (فرائض) بە کوردی نوسراوە، کە مەبەست لە نوسینیان ئاشناکردنی خوێندەواری کوردە بە مەبەستە گرنگەکانی ئەم زانستە.

نامەوێت لەم گوزەرەدا باس لە گرنگی ئەم زانستە بکەم، ئەوەندەی کە دەمەوێت ئەم کتێبەی برای ئازیز و زانای تێکۆشەرم (مامۆستا شێخ ئەمجەد شێخ محمد زاهد شێخ محمد) پێشکەش بە خوێندەواران بکەم.

ئەم کتێبە هەرچەند لە ڕووی مێژوویی‌یەوە نوێیە، بەڵام لە ڕووی ناوەڕۆك و باری مەعریفی و زانستی‌یەوە زۆر لە پێشە، نووسەر هەرچەند هێشتا لاوێکی کەم تەمەنە، بەڵام وەکو زانایەکی تیرازی پێشوو مەبەستەکانی ئەم زانستەی کۆکردوەتەوە و بە جوانی ڕیزی کردوون، و بە کوردی‌یەکی ڕەوان دایڕشتوون.

زۆرینەی زۆری مەسەلەکانی عیلمی میراتی لەسەر بنەمای مەزهەبی شافیعی هێناوە و بەڵگەی زانستی بۆ باس کردوون، و بەراوردی کردوون بەوەی لە مەزهەبی تردا هاتوە.

لەم کتێبەدا ڕەسەنایەتی کتێبە کۆنەکان و تازەگەری کتێبە هاوچەرخەکان بەدی دەکرێت، و هەم زانا و پسپۆڕ سوودی لێ دەبینێت، و هەم خوێندکاری تازە پێگەیشتوو.

ئەم کتێبە بە شانازی‌یەوە دەچێتە ڕیزی کتێبە باشەکانی عیلمی میرات، و بە دڵنیایی‌یەوە جێگەی خۆی لە کتێبخانەی کوردی و ئیسلامیدا دەکاتەوە.

لە خوای گەورە داواکارم نووسەری خۆشەویست تەمەن درێژ و پشوودارتر بکات بۆ خزمەتی زیاتر و بەرهەمی باشتر، پیرۆزبایی ئەم بەرهەمە ناوازەی لێ دەکەم، و الله من وراء القصد.

د. صباح بەرزنجی
پرۆفیسۆری یاریدەدەری
فیقھ و بنەماکانی یاسای ئیسلامی — زانکۆی سلێمانی
١٧ — ١ — ٢٠٠٩

## پێشکەشە بە:

- ○ ڕەحمەتی خوا بۆ بوونەوەر، هێنەری ئەم بەرنامە خواییە، سەرداری پێغەمبەران، حەزرەتی پێغەمبەری ئاخر زەمان (درودی خوای لێ بێت).
- ○ هاوەڵانی ئەو ڕابەرە، ئەستێرەکانی ئاسمانی خواناسی.
- ○ موجتەهیدەکان، و هەموو ئەو زانایانەی کە ماندوونەناسانە تێکۆشاون، لە پێناو گەیاندنی ئەم زانستەدا بە موسوڵمانان.
- ○ مامۆستا، و خاوەنی فەزڵی گەورە لەسەرم، جەنابی خوالێخۆشبوو عەللامەی مەریوانی مامۆستا مەلا حەمە ئەمینی کانی سانانی.
- ○ شێخانی هەورامان، پیرانی ڕێبازی خواپەرستی ڕاستەقینە، ڕابەرانی ڕێبازی تەصەوفی نەقشبەندی، بەتایبەتی: شێخ محمد عثمان سراج الدین، کە لە خانەقای بیارەی پیرۆزی ئەواندا خوێندنم دەست پێ کردوە و کۆتاییم پێ هێناوە، خوای گەورە پاداشتیان لە برێتی ئێمەو موسوڵمانانیش بداتەوە.
- ○ باپیرەی خۆشەویست و دڵسۆزم زانای ڕەببانی مامۆستا شێخ محمدی خۆراسانی، و باوك و دایکی بەسۆزم، کە بە منداڵی پەروەردەیان کردوم، و ڕەنجیان لەگەڵمدا بەردەوامە تاوەکو ئێستاش، خوای گەورە لەش ساغ، و عاقیبەت خێریان بکات.
- ○ هەموو زانست دۆستان.

# ئایەتەکانی میرات

بِسْمِ اللّٰهِ الرَّحْمٰنِ الرَّحِيمِ

﴿ يُوصِيكُمُ ٱللَّهُ فِىٓ أَوْلَٰدِكُمْ ۖ لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ ٱلْأُنثَيَيْنِ ۚ فَإِن كُنَّ نِسَآءً
فَوْقَ ٱثْنَتَيْنِ فَلَهُنَّ ثُلُثَا مَا تَرَكَ ۖ وَإِن كَانَتْ وَٰحِدَةً فَلَهَا ٱلنِّصْفُ ۚ وَلِأَبَوَيْهِ لِكُلِّ
وَٰحِدٍ مِّنْهُمَا ٱلسُّدُسُ مِمَّا تَرَكَ إِن كَانَ لَهُۥ وَلَدٌ ۚ فَإِن لَّمْ يَكُن لَّهُۥ وَلَدٌ وَوَرِثَهُۥٓ أَبَوَاهُ
فَلِأُمِّهِ ٱلثُّلُثُ ۚ فَإِن كَانَ لَهُۥٓ إِخْوَةٌ فَلِأُمِّهِ ٱلسُّدُسُ ۚ مِنۢ بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصِى بِهَآ أَوْ دَيْنٍ ۗ
ءَابَآؤُكُمْ وَأَبْنَآؤُكُمْ لَا تَدْرُونَ أَيُّهُمْ أَقْرَبُ لَكُمْ نَفْعًا ۚ فَرِيضَةً مِّنَ ٱللَّهِ ۗ إِنَّ ٱللَّهَ
كَانَ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴿١١﴾ وَلَكُمْ نِصْفُ مَا تَرَكَ أَزْوَٰجُكُمْ إِن لَّمْ يَكُن
لَّهُنَّ وَلَدٌ ۚ فَإِن كَانَ لَهُنَّ وَلَدٌ فَلَكُمُ ٱلرُّبُعُ مِمَّا تَرَكْنَ ۚ مِنۢ بَعْدِ
وَصِيَّةٍ يُوصِينَ بِهَآ أَوْ دَيْنٍ ۚ وَلَهُنَّ ٱلرُّبُعُ مِمَّا تَرَكْتُمْ إِن لَّمْ يَكُن
لَّكُمْ وَلَدٌ ۚ فَإِن كَانَ لَكُمْ وَلَدٌ فَلَهُنَّ ٱلثُّمُنُ مِمَّا تَرَكْتُم ۚ مِّنۢ بَعْدِ
وَصِيَّةٍ تُوصُونَ بِهَآ أَوْ دَيْنٍ ۗ وَإِن كَانَ رَجُلٌ يُورَثُ كَلَٰلَةً أَوِ ٱمْرَأَةٌ
وَلَهُۥٓ أَخٌ أَوْ أُخْتٌ فَلِكُلِّ وَٰحِدٍ مِّنْهُمَا ٱلسُّدُسُ ۚ فَإِن كَانُوٓا۟ أَكْثَرَ مِن ذَٰلِكَ
فَهُمْ شُرَكَآءُ فِى ٱلثُّلُثِ ۚ مِنۢ بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصَىٰ بِهَآ أَوْ دَيْنٍ غَيْرَ مُضَآرٍّ ۚ
وَصِيَّةً مِّنَ ٱللَّهِ ۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَلِيمٌ ﴿١٢﴾ ﴾

﴿ يَسْتَفْتُونَكَ قُلِ ٱللَّهُ يُفْتِيكُمْ فِي ٱلْكَلَٰلَةِۚ إِنِ ٱمْرُؤٌا۟ هَلَكَ لَيْسَ لَهُۥ وَلَدٌ وَلَهُۥٓ
أُخْتٌ فَلَهَا نِصْفُ مَا تَرَكَۚ وَهُوَ يَرِثُهَآ إِن لَّمْ يَكُن لَّهَا وَلَدٌۚ فَإِن كَانَتَا ٱثْنَتَيْنِ
فَلَهُمَا ٱلثُّلُثَانِ مِمَّا تَرَكَۚ وَإِن كَانُوٓا۟ إِخْوَةً رِّجَالًا وَنِسَآءً فَلِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ ٱلْأُنثَيَيْنِۗ
يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمْ أَن تَضِلُّوا۟ۗ وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌۢ ﴿١٧٦﴾ ﴾ سورة النساء

(صدق الله العظيم )

# هۆی دابەزینی ئەم ئایەتانە

جابیری کوڕی عەبدولاّی کوڕی عەمری خەزرەجی بۆمان دەگێڕێتەوە کە خێزانەکەی سەعدی کوڕی رەبیع دوو کچەکەی سەعدی هێنا بۆ خزمەتی حەزرەتی پێغەمبەر، و عەرزی کرد: ئەی پێغەمبەری خوا، ئەم دوانە کچی سەعدی کوڕی رەبیعن، باوکیان لە خزمەتی جەنابتدا لە غەزای ئوحود دا شەهید بوە، وە مامەکەشیان هەموو ماڵەکەی بردون، و هیچی بۆ بەجێ نەهێشتوون، خۆ جەنابیشت ئەزانیت کە ئەگەر ماڵیان نەبێت، کەس نایانخوازێت، حەزرەتیش فەرمووی: با خوای گەورە خۆی بڕیار لەمەدا بدات. ئیتر ئایەتەکانی میرات دابەزین، پاشان حەزرەتیش ناردی بەشوێن مامەکەیاندا، و پێی فەرموو: دووسێیەکی ماڵەکە بدە بە دوو کچەکەی سەعد، و هەشت یەکیشی بدە بە دایکیان، و هەرچیشی مایەوە بیبە بۆ خۆت. (١)

هەروەها جابیری بۆمان دەگێڕێتەوە: کە حەزرەتی پێغەمبەر و ئیمامی ئەبو بەکر بە پیادەڕەوی هاتن بۆ سەردانم، لەو کاتەدا نەخۆش بووم لە بەنی سەلەمە، کە حەزرەت بینیمی ئاگام لەخۆم نیە، و بێ هۆشم، داوای کرد کە ئاوی بۆ بهێنن، تاوەکو دەست نوێژ بشۆرێت، ئاوەکەیان بۆ هێنا، و دەست نوێژەکەی شۆرد، و هەندێك ئاوی لێ پرشاندم، ئیتر بە ئاگا هاتمەوە، بینیم کە حەزرەتە، عەرزم کرد: قوربان دەفەرموویت چی بکەم بە ماڵ و سەروەتەکەم؟ ئیتر ئایەتەکانی میرات دابەزین. (٢)

---

١)الترمذی ٢٠٩٢، ابن ماجة ٢٧٢٠، أحمد ١٤٨٤٠، المستدرك ٧٩٥٤، ٧٩٩٥، السنن الكبرى ١١٩٩٩.

٢)البخاري ٤٣٠١، مسلم ١٦١٦، السنن الكبرى ١١٩٨١، النسائي الكبرى ٦٣٢٣.

جا ئەگەرچی ئەم دوو ڕیوایەتە لە ڕواڵەتدا جۆرە نەگونجانێکیان پێــوە دیــارە، چونکە دوو ڕووداوی جیاوازن لەڕووی کات و شوێنەوە، بۆیە دەکرێت بپرسین: چۆن ئەم ئایەتانە لە هەردوو ڕووداوەکەدا دابەزیون؟!

زانایان دەفەرموون: ئایەتەکان سێ ئایەتن، سەرەتاکەیان کە بە (يُوصِيكُمُ اللَّهُ فِيٓ أَوۡلَٰدِكُمۡۖ) دەست پێ دەکات، لە ڕووداوەکەی کچەکانی سەعددا دابەزیوە، و کۆتاییەکەشیان کە بە ﴿ يَسۡتَفۡتُونَكَ قُلِ ٱللَّهُ يُفۡتِيكُمۡ فِي ٱلۡكَلَٰلَةِ ﴾ دەست پێ دەکات، لە ڕووداوەکەی جابیردا دابەزیوە.[1]

---

١) فتح الباري ٨ / ٢٤٤. عمدة القاري ١٨ / ١٦٧، تحفة الأحوذي ٦ / ٢٢٨. ابن كثير ١ / ٦٠٧.

## بسم الله الرحمن الرحيم

أحمدك اللهم مؤتي الحكمْ ووارث الخلق، وباعث الرِّممْ
و قاسم التراث بين أهله بمقتضى حكمته، و عدله
مصلّيا على نبيك الذي هَدى إلى منهج دينك الشذي
مَن حسنها مباين الخلائق بلا مماثل، ولا موافق
بل كلّ مَن شاهده بعينه حُجِب عن إبصار كلّ حسنه
مَن جاء بالقرآن خير ما نزل وملّة ناسخة كلّ الملل
وآله، و صحبه الكرام والعصبات وذوي الأرحام (١)

---

١) قطر العارض في علم الفرائض / شێخ مەعروفی نۆدی.

## پێشەکی:

یەکێك لەو زانستە هەرە گرنگانەی کە پێویستە هەمیشە و بەردەوام لە ناو موسوڵمانانداا کۆمەڵێك هەستن بە تەرخان کردنی بەشێك لە کاتی خۆیان بۆ فێربوونی، بریتیە لە زانستی چۆنێتی دابەش کردنی میرات (فرائض) بەپێی شەریعەتی ئیسلام، چونکە ئەم زانستە پەیوەندی بە بەشێك لە دونیا و واقعی مرۆڤەکانەوە هەیە، ئەویش بەوەی کە ئەگەر کەسێك بمرێت، ئایا ئەوەی کە لەپاشی بەجێ دەمێنێن چی بەسەر دێت؟، و بڕیاری شەریعەتی ئیسلام لەبارەیەوە چیە؟

خوای گەورە دەفەرموێت:

﴿ وَمَا كَانَ ٱلْمُؤْمِنُونَ لِيَنفِرُوا۟ كَآفَّةً فَلَوْلَا نَفَرَ مِن كُلِّ فِرْقَةٍ مِّنْهُمْ طَآئِفَةٌ لِّيَتَفَقَّهُوا۟ فِى ٱلدِّينِ وَلِيُنذِرُوا۟ قَوْمَهُمْ إِذَا رَجَعُوٓا۟ إِلَيْهِمْ لَعَلَّهُمْ يَحْذَرُونَ ﴿١٢٢﴾ ﴾ التوبة.

بۆیە دەبینین هەم لە فەرمودەکانی حەزرەتی پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت)، و هەم هاوەڵان و زانایانیشدا زۆر جەخت کراوەتەوە لەسەر فێربوونی.

عبد الله ی کوڕی عەمری کوڕی عاص بۆمان دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی:

العلم ثلاثة: و ما سوى ذلك فهو فضل: آية محكمة، و سنة قائمة، و فريضة عادلة.[1]

---

١) أبو داود ٢٨٨٥، ابن ماجة ١ / ٢١ / ٥٤، المستدرك ٧٩٤٩، السنن الكبرى ١١٩٥٢، دار قطني كتاب الفرائض / ٢، عمدة القاري ٢٣ / ٢٣١.

واتە: ئەو زانستەی کە لە پێش هەموو زانستەکانی ترەوە پێویستە مرۆڤ کاتی خۆی لەگەڵدا خەرج بکات بریتیە لەم سێ زانستە، ئیتر زانستەکانی تر جگە لەمانە زیادە زانستن _ خۆ ئەگەر بزانرێن باشە _، ئەو سیانەش بریتین لە: زانستی زانینی مانا و تەفسیری قورئانی پیرۆز، و زانستی مانا و لێکدانەوەی فەرموودەکانی پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت)، و زانستی دابەشکردنی میرات بە شێوەیەکی دادپەروەرانە لە نێوان میرات بەراندا.

عبدالله ی کوڕی مەسعود دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی:

تعلموا الفرائض و علموها الناس، فإني امرؤ مقبوض، و إن هذا العلم سيقبض، و تظهر الفتن حتى يختلف الرجلان في الفريضة، فلا يجدان من يفصل بينهما. (١)

واتە: زانستی دابەش کردنی میرات فێربن، و کەسانی تریش فێربکەن، چونکە منیش دەمرم و لەناوتان نامێنم، وە ئەم زانستەش بەرەو نەمان دەچێت، و ئاشوب و فیتنە پەیدا دەبێت، بەجۆرێك کە ئەگەر دوو کەس ناکۆك بن لە چۆنێتی دابەشکردنی میرات لەنێوان خۆیاندا، ئەوا کەسێکیان دەست ناکەوێت کە لەیەکیان بکاتەوە و بڕیاری دروست بدات لە نێوانیان دا.

ئەبو هورەیرە دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت) فەرموویەتی: تعلموا الفرائض فإنها من دينكم، و إنها نصف العلم، و إنها أول علم ينزع من أمتي. (٢)

---

١) ابن ماجة ٢٧١٩، المستدرك ٧٩٤٨، عمدة القاري ٢٣ / ٢٣١، فتح الباري ١٢ / ٥.

٢) سنن الدارمي ٢٨٥٨، المستدرك ٧٩٥٣،الكبير ٨٧٤٣، ابن أبي شيبة ٣١٠٣٢،السنن الكبرى ١١٩٥٩، ١١٩[illegible]٠.

واتە: زانستی دابەش کردنی میرات فێربن، چونکە بەشێکی ئاینەکەتانــە، وە نیوەی زانــستەکانە، و یەکــەم زانــستە کــە لــەناو ئومەتەکەمــدا هەڵــدەگیرێت و نامێنێت.

جا زانایان لە مانای (وإنها نصف العلم) دا لێکدانــەوەی جیاوازیــان هەیــە: هەندێك فەرموویانە: نیوەی زانستەکانە، چونکە هەموو مرۆڤــەکان بەگــشتی لــە یەکێك لەم دوو حاڵەتەدا دەبن: یان ژیان، یان مردن، جا ئەم زانستە پەیوەندی بــە حاڵەتی مردنەکەوە هەیە.

هەندێکی تر فەرموویانە: جۆرێك یان بەشێکی زانــستەکانە. وە لێکدانــەوەی تریشی بۆ کراوە.

ئیمامی رەحەبی وەك ئاماژەیەك بەو فەرموودانەی حەزرەت، دەفەرموێت:

وأن هــذا العلــم مخــصوص بمــا     قــد شــاع فيــه عنــد كــل العلمــا
بــأنها أول عــلم يــفــقد     في الأرض حتّــى لا يكــاد يوجــد

وە حەزرەتی عومەری کوڕی خەطــاب فەرموویــەتی: چــۆن هــەوڵ ئــەدەن بــۆ فێربوونی قورئان، هەرواش هەوڵ بدەن بۆ فێربوونی فرائض.

وە لە جێگەیەکی تــردا دەفــەرموێت: خۆتــان فێــری فــرائض بکــەن، چــونکە بەشێکە لە ئاینەکەتان.

وە عــبداللە ی کوڕی مــەسعود دەفەرموێت: خۆتــان فێــری قورئــان، و فــرائض بکەن، چــونکە نزیکــە کــە کەســێك پێویــستی بــە زانــستێك ببێــت کــە پێــشتر زانیویەتی، یان بکەوێتە ناو کۆمەڵە کەسێك کە هیچ شارەزاییان نەبێت.

وە لە جێگەیەکی تردا دەفــەرموێت: ئــەوەی کــە قورئــانی خوێنــدوە بــاوەکو (فرائض)یش فێر ببێت، چونکە ئەگەر گەیشت بە عەرەبێکی دەشتەکی و ئــەویش پرسیاری لێ کرد: ئەی کۆچەری، قورئان ئەزانی؟ جا ئەگەر وتــی بــەڵێ، دووبــارە دەپرسێت: ئەی فرائض؟ جا ئەگەر وتی: بەڵێ، ئەوا زۆر باشە، بەڵام ئەگــەر بڵــێ:

نەخێر، ئەوجا ئەویش پێی ئەڵێ: ئیتر چیت لە من زیادە و چی فەزڵێکت هەیە لەسەر من؟! [١]

ئەوجا هەر مەسئەلەیەکی (فرائض) کە لە سەردەمی حەزرەتدا خرابێتە ڕوو، ئەوا یان بە ئایەتی قورئان، یان بە فەرموودەی حەزرەت حەلکراوە و ڕوون کراوەتەوە، بەلاّم لەپاش وەفاتی حەزرەت زانا و شارەزایانی هاوەلاّن ڕوونیان کردوەتەوە، بەتایبەتی چوار کەسیان زۆر بەناوبانگ بون لە فرائض دا، کە بریتی بوون لەم چوار ئیمامە: (علي، و زید ی کوڕی ثابت، و عبدالله ی کوڕی عباس، و عبدالله ی کوڕی مسعود)، بۆیە ئەگەر لە هەر مەسئەلەیەکدا ئەم چوارە یەکدەنگ بووبن، ئەوا کەس ناکۆکی لەسەر نەبوە، وە هەر کاتێکیش ناکۆك بوونایە، ئەوا سیانیان لە لایەك، و ئەوی تریشیان لە لایەکی تر دەبوو. [٢]

بەلاّم بەگوێرەی فەرموودەیەکی حەزرەتی پێغەمبەر کە لە زۆرێك لە کتێبە حەدیسیەکاندا هاتوە، زیدی کوڕی ثابت، لە ناو ئومەتی حەزرەتدا لە هەموو کەس شارەزاترە لەم زانستەدا، وەك دەفەرموێت:

أرحم أمتي بأمتي أبو بكر. وأشدهم في دين الله عمر. وأصدقهم حياء عثمان. وأقضاهم علي بن أبي طالب. وأقرؤهم لكتاب الله أبي بن كعب. وأعلمهم بالحلال والحرام معاذ بن جبل. وأفرضهم زيد بن ثابت. ألا وإن لكل أمة أمينا. وأمين هذه الأمة أبو عبيدة بن الجراح. [٣]

---

١) الترمذي ٢٠٩١، المستدرك ٧٩٥٠، ٧٩٥١، السنن الكبرى ١١٩٥٣، النسائي الكبرى ٦٣٠٥، ٦٣٠٦.

١) مغني المحتاج ٣ / ٢، الكنوز الملية ١٥٠ ـ ١٥١.

٢) ابن ماجة ١٥٤، الترمذي ٣٧٩٠، ٣٧٩١، أحمد ١٤٠٢٢، ابن حبان ٧١٣١، المستدرك ٥٧٨٤، عبد الرزاق ٢٠٣٨٧، النسائي الكبرى ٨٢٤٢، هو حديث حسن أخرجه أحمد

له ناو تابعینیشدا کۆمەڵێك ناوبانگیـان دەرکردبـوو، کـه بـەناوبانگترینیان: سەعیدی کوڕی موسەیەب، و عوروەی کوڕی زوبەیر، و قاسمی کوڕی موحەمـەد، و خاریجەی کوڕی ئیمامی زەید، و ئەبو بەکری کوڕی حارث، و سـولەیمانی کـوڕی یەسار، و عوبەیدولاّی کوڕی عەبدولاّ .(١)

کاتێك که زانایانی ئیسلام لەپاش سەردەمی حەزرەتی پێغەمبەر باسیان لـەم زانسته کردوه، وەك زانستێکی سەربەخۆ له زانسته فیقهی‌یەکان باسـیان کـردوه، هەربۆیه هەندێکیان کتێبی تایبەت، و سەربەخۆیان تێیدا نوسیوه، که سەرەتاکەی دەگەڕێتەوه بۆ سەدەی دوەم و سێیەمی کۆچی، که له لایەن زانایـانی وەك: (ابـن شبرمة، و ابن أبي ليلى، و أبو ثـور)، بۆیه لەو دوو سەدەیەدا که زانایـان کتێبـی فیقهی‌یان داناوه، بابەتی (فرائض) ی تێدا نەبوه. وەك کتێبـی (الأم) ی ئیمـامی شافیعی، و هەردوو کتێبـی (الجـامع الكـبير، و الجـامع الـصغير) ی موحەمـەدی کوڕی حەسەن، بەپێچەوانەی کتێبی فەرموودەکانی حەزرەت، که وەك چۆن بابەته فیقهی‌یەکانیان لەخۆگرتبوو، هەروا بابەتی (فرائض) یشیان تێدابوو، وەك کتێبـی (موطأ) ی ئیمامی مالك، و (مصنّف) ی ابن أبي شـيبة، و صـحيحی بخـاري، و مسلم.(٢)

بەلاّم له سەرەتا و ناوەڕاستی سـەدەی چـوارەمدا ئـیتر کتێبـه فیقهی‌یـەکان، هەموو بابەته (فـرائض)یەکانیان لەخۆ دەگـرت، وەك (رسـالة ابـن أبـي زيـد) لـه مەزهەبی مالیکی، و (مختصر القدوري) له مەزهەبی حەنەفی، ئیتر هەر بەم شێوه

---

وأصحاب السنن وصححه الترمذي وابن حبان والحاكم من رواية أبي لبابة عن أنس فتح الباري / ١٢ / ٢٠.

٣) مغني ابن قدامة ٢ / ٦٧.

١) بڕوانه: الموسوعة الفقهية / حرف: الهمزة، كلمة: إرث، موضوع: علاقة الإرث بالفقه ٣ / ١٧ — ١٨.

هـەتاوەکو ئێـستەش زانایـانی شـەرع لـە کتێبەکانیانـدا بـاس لـە تـەواوی مەسئەلەکانی ئەم زانستە گرنگە دەکەن، ئەگەرچی هەنـدێکیان کتێبـی تایبـەتی لەسەر دادەنێن.

بێگومـان زانایـانی کـوردیش ڕۆڵـی بەرچـاویان بینیـوە لـەم بـوارەدا، بـۆ تێگەیاندنی موسوڵمانان، و پێگەیانـدنی مـیرات بـەرانی حـەزرەتی پێغەمبـەری سەروەرمان (درودی خوای لێبێت) چی بە دەرس وتنەوە، و چی بە نوسین، درێغی‌یان نەکردوە، شەو و ڕۆژی خۆیان خستوەتە سەریەك لەم پێناوەدا.

دەیان و سەدان زانای وەك: نۆدشی، و مـەلا ئەبوبـەکری موصـەنیف، ئیبنـو ئادەم، و قەرەداغی، و پێنجوێنی، و بالکی، و چروستانی، و مەلای گەلاڵە.... و زۆرێکی تریشیان تێدا هەڵکەوتوە.

جا ئەگەرچـی ئـەوەی کـە بەردەسـتی مـن کـەوتوە لـە نوسـراوی زانایـانی گەلەکەمان، چەند نوسراوێکی کەمە کە بـە پەنجـەی دەسـت دەژمێـررێن، بـەڵام بێگومانم کە زۆرێکی تریش هەیە من بە خزمەتیان نەگەیشتوم.

کتێبە کوردی‌یەکانیش ئەمانەن:

(١) فرائضی کوردی / دانراوی مامۆستا مەلا محمد ی کوڕی مـەلا أحمـد ی دێلێژەیی / کە پازدە لاپەڕەیە، لە چاپخانەی ژیـان لـە سـولەیمانی لـە سـاڵی / ١٩٣٨ ی زاینی چاپ کراوە.

(٢) شەریعەتی ئیسلام / دانراوی زانای خواناسی دەست نـورین، مامۆسـتا مەلا عبد الکریم ی مـودەڕیس (بیـارە)، کـە کتێبێکـی فیقهی‌یـە، یـەکێك لـە باسەکانی بریتیە لە باسی (میرات و فرائض).

(٣) بەشکردنی میرات لە شەریعەتی ئیسلام و یاسادا / دانراوی دکتۆر محمد أحمد گەزنەیی‌یە.

(٤) دەستوری میرات / ئەم کتێبە لە سەرەتادا بریتی بوە لە دەرسی فرائض شرح المنهج ی قاضی زکریا، کە مامۆستا مەلا (سید نجم الدین طه) وتوویەتی بە فەقێکانی، ئەوانیش لە کاسێت دا تۆماریان کردوە، لەپاش خۆی وەك وەفایەك لە ڕێگەی (جعفر محمد ألماس)ەوە ئامادە کراوە، و بەچاپ گەیەنراوە.

(٥) ڕووناکی (رب العالمین) ڕوونکردنەوەی (منهاج الطالبین) دانراوی زانای پایەبەرز جەنابی مامۆستا مەلا عەبدولآی هەرتەلیـیە، کە ڕوونکردنەوەی مینهاجی ئیمامی (نووي) ە، کە باس لە هەموو بابەتە فیقهیـیەکان دەکات، و کە بەشێکیشی بابەتی (فرائض) ە.

(٦) بەشکردنی میرات، ڕوونکردنەوەی (قطر العارض في علم الفرائض للشیخ معروف النودهي) دانراوی مامۆستا مەلا عەبدولآی هەرتەلیـیە.

خوای گەورە پاداشتی بەخێریان بداتەوە لە بەرانبەر ئەو هەموو خزمەتەدا کە کردوویانە، و ئەوانەشیان کە ماون و لە ژیاندان، بەرەکەت بخاتە تەمەن و پێنوسیانەوە.

جا ئەگەرچی من خۆم بە سواری ئەو مەیدانە نازانم، بەڵام سەرچاوەی هەموو ئەوەی کە دەینوسم بریتیـیە لە هەڵقوڵاوی کانی زوڵاڵ و ڕوونی ئەو ناودارە خواناسانە، کە بۆ ساڵانێك لە خزمەتیاندا چۆکی شاگردیمان داناوە، بە ئومێدی بەهرەداربوون، کە سوپاس بۆ خوا نائومێد نەبووین.

بۆیە داواکارم لە هەموو ئەو مامۆستا بەڕێزانەی کە ئەم کتێبە دێتە بەردەستیان، هەر هەڵەیەك کە دەیبینن چاکی بکەنەوە، چونکە هەموو کەسێك ڕووبەڕووی هەڵە دەبێتەوە تەنها سەرداری پێغەمبەران نەبێت.

لە هەمان کاتدا دەمەوێت ئەوە بڵێم کە: إنما العلم بالتعلم. جا ئامۆژگاری دۆستانەم بۆ هەموو برایەك ئەوەیە کە: ئەگەرچی ئەم نوسراوە یارمەتی دەرێکی باش دەبێت، بەڵام نابێت وەهایان لێ بکات کە پشت لە خوێندنی ئەم زانستانە

بکەن، بەڵکو دووبارە و دەبارەی دەکەمەوە کە بچنە خزمەتی مامۆستاکان، تاوەکو ئەوەی کە فێری دەبن جێگەی سودی خۆیان و موسوڵمانانیش بێت.

جا لەبەر ئەوەی کە ئیجتیهاد و فەتواکانی ئیمامی شافیعی لە فرائض دا لە زۆرینەی مەسئەلەکاندا بە وێنەی فەتواکانی زیدی کوڕی ثابتە.[١]

ئیمامی رەحەبی دەفەرموێت:

وأن زيـــدا خـــصّ لا محـــالة　　بـــما حبـــاه خـــاتم الرســـالة

مـــن قولـــه في فـــضله منبهـــا　　(أفرضكم زيد )، وناهيك بها

فـــكان أولى باتبـــاع التـــابعي　　لا سيّما، و قـد نحاه الـشافعي

بۆیە من دەمەوێت لەم کتێبەمدا هەموو بابەتەکانی ئەم زانستە گرنگە ڕوون بکەمەوە، بەو پێیەی کە ڕا و بۆچوونی ئەو دوو زانا موجتەهیدە پایە بەرزەی لەسەرە، بەڵام بە شێوەیەکی گشتی هەوڵم داوە کە لەم کتێبەدا لەسەر ئەم چەند خاڵە بڕۆم:

(١)بەهۆی ئەوەی کە یەکێك لە مەبەست و ئامانجەکانی هۆنراوەی فێرکاری (الشعر التعليمي) ئەوەیە کە بە ئاسانی لەبەر دەکرێت، بەڵام لەبەر ئەوەی کە هیچ نوسراوێکم لەم بارەیەوە بە زمانی کوردی بەردەست نەکەوت، بۆیە هاتووم لە هەر جێگەیەکدا کە بە پێویستم زانیبێت شیعری عەرەبیم تێهەڵکێش کردوە، لەبەر زیاتر ڕوونی، و سوود گەیاندن.

(٢)هەر ئایەتێك کە هێنابێتم، تەنها ژمارەی ئایەتەکە، و ناوی سورەتەکەم باس کردوە، ئیتر خۆم نەگەیاندوەتە تەفسیری ئایەتەکە، بەڵکو تەنها وەك سەرچاوەی بڕیارە شەرعییەکە هێناومە.

---

١) بۆ فەتواکانی ئیمامی (زید) بڕوانە: موسوعة زيد بن ثابت / كلمة: إرث / الدكتور محمد روّاس قلعةجي / دار النفائس / ط ١ / ١٤١٣ — ١٩٩٣.

(٣)هەر فەرموودەیەکی حەزرەتی پێغەمبەرم هێنابێت، لە خوارەوە ئاماژەم تەنها بە ژمارەی فەرموودەکە کردوە لەو سەرچاوانەی کە ناوم هێناون.

(٤)لە زۆر جێگەدا بە گوێرەی پێویست کلێشەی تایبەتیم بۆ بابەتەکان کردوە.

(٥)خاڵبەندی، و دابەش کردنی تەواوم بۆ هەمو ئەو باسانە کردوە کە لە زۆرێك لە کتێبەکاندا هەر بەشێوەیەکی درێژ و بە تێکەڵی باس کراون.

(٦)لە هەندێك جێگەدا درێژەم بە باسەکە داوە، تەنها لەبەر زیادە ڕوونی و ئاسانکاری، ئەگینا باسەکە بە لەوە کەمتریش هەر تەواو دەبوو.

(٧)ئەگەرچی ویستوومە ئەم کتێبە تەنها لەسەر مەزهەبی ئیمامی شافیعی بێت، بەڵام هەر بەوەوە نەوەستاوم کە تەنها بۆچوونی زانایانی ئەم مەزهەبە بخەمەڕوو، بەڵکو لە هەر جێگەیەکدا کە بە پێویستم زانیوە، ڕا و بۆچونی زانایانی موجتەهید، و مەزهەبەکانی تریشم هێناوە. بۆیە زۆرجار ئاماژە دەکەم بەو کتێبانەی کە زانیاریم لێوە هێناون، و دانەرەکانیشیان لەسەر مەزهەبی ئیمامی شافیعی نین.

(٨)ئەگەرچی بابەتی میراتی کۆیلەئازادکەر (معتق، و معتقة) بابەتێکە کە زانایان بەگشتی باسیان لێوە کردوە، چی بە کورتی، یان بە درێژی، بەڵام من تەنها لە هەندێك جێگەدا زۆر بە کورتی باسم لێوە کردوە، بەهۆی ئەوەی کە لەم کات و زەمانەدا و لەو وڵاتانەی کە کوردی لێ دەژی، و میرات دابەش کردن تێیاندا بە گوێرەی شەریعەتی ئیسلامە، ئەم بابەتە باسی نیە، و نەماوە، بۆیە منیش ئێستا بە پێویستی نازانم، ئەگەرچی بڕیارە شەرعیەکان نەگۆڕ و ڕوونن لەم بابەتەدا.

(٩)بەهۆی ئەوەی کە بابەتەکە ئیسلامیيە، بۆیە زۆرجار هەم ناوی حەزرەت، و هەم ناوی هاوەڵان، و زانایانی تێدەکەوێت، جا لەبەر درێژ نەبوونەوەی نوسراوەکە تەنها چەند جارێك (درودی خوای لێ بێت)، و (خوای لێ ڕازی بێت) م

بەکار هێناوە، بۆیە داواکارم لە هەموو بەڕێزێك کە لە هەرجێگەیەکدا گەیشت بە ناوی حەزرەت، یان هاوەڵان، یان زانایان، با ئەو ئەدەبەی کە پێویستە لەبەرچاوی بگرێت، و ڕەچاوی بکات دەرهەقیان.

هەزاران درووود لەسەر پێغەمبەری ئیسلام، و سۆز و ڕەزامەندی خوداش لە یار و یاوەر و زانایانی پایەبەرز بێت. آمین.

دانەر

أمجد محمد زاهد شێخ محمد

پێش ئەوەی کە بچمە ناو بابەتەکەوە، بەپێویستی دەزانم کە بۆ چەند ساتێك بچینە خزمەت ژیانی ئەو دوو ئیمامە پایە بەرزە، بە مەبەستی ئاشنا بوونمان بە هەندێك زانیاری پێویست سەبارەت بە هەوڵ و کۆشش و شارەزاییان، و شایەتیدانی زانایان لەسەر لێهاتوویی و هەڵکەوتووییان.

## زەیدی کوڕی ثابت

◊ ناوی زەیدی کوڕی ثابتی کوڕی ضەحاکی کوڕی زەیدی کوڕی لۆزانی کوڕی عەمری کوڕی عەوفی کوڕی مالیکی کوڕی نەجاڕی ئەنصاری خەزرەجییە. بە ئەبو خاریجە و ئەبو سەعید و ئەبو ثابت بانگ کراوە.

◊ (١١) ساڵ پێش کۆچ کردنی حەزرەتی پێغەمبەر بۆ شاری مەدینە لە دایك بوە، لە شاری مەکەی پیرۆزدا پەروەردە و گەورە بوە.

◊ تەمەنی شەش ساڵان بوە باوکی کوژراوە لە شەڕی نێوان ئەوس و خەزرەجدا.

◊ لە تەمەنی یازدە ساڵیدا، کاتێك کە حەزرەت بڕیاری کۆچ کردنی دا، ئەویش کۆچی کردوە بۆ شاری مەدینەی پیرۆز، ئیتر لەوێ بە تەواوەتی شارەزایی پەیدا کردوە لە زۆر بواردا، بەتایبەتی بە یەکێك لە زانا هەرە پایە بەرز و ناودارەکانی مەدینە ناسراوە لە بواری قەزاوەت و فەتوا و قورئان و فرائض دا.

◊ ئەگێڕنەوە کە هەمیشە ئیمامی عومەر و ئیمامی عوثمان لە هەموو کەس لە پێشتریان داناوە لەم بوارانەدا.

◊ یەکێك بوە لە نوسەرەوان و کۆکەرەوانی قورئانی پیرۆز لە سەردەمی حەزرەتدا، لە غەزای بەدردا بەشداری نەکردوە، چونکە تەمەنی کەم بوە لەو کاتەدا، بەلاّم لە غەزای ئوحود و لە غەزای خەندەقدا بەشداری کردوە، و بە دەستی خۆی لە غەزای خەندەقدا خۆڵ و خاکی دەردەدا و دەیگواستەوە، جا لەو کاتەدا حەزرەت چاوی لێبوو، و فەرمووی: ئەو کوڕە گەنجە کوڕێکی چاکە.

◊ لە پاش جەنگی یەمامە حەزرەتی ئەبو بەکر داوای لێکرد کە قورئان بە تەواوەتی بنوسێتەوە، وەك ئیمامی بوخاری بۆمان دەگێڕێتەوە.[1]

◊ لە سەردەمی خەلافەتی حەزرەتی عومەردا هەرکاتێك کە حەزرەتی عومەر سەفەری بکردایە، ئەوی دادەنا بە جێنشینی خۆی لە شاری مەدینەی پیرۆز.

◊ دەرسی قورئانی فەرموە بە عەبدولاّی کوڕی عەباس، بۆیە عەبدولاّی کوڕی عەباسیش لەگەڵ ئەو هەموو شارەزایی و ناوبانگەوە زۆرجار دەهات بۆ ماڵی ئەم ئیمامە، و دەیفەرموو: زانست دەبێت بگەڕێیت بە شوێنیدا، نەك ئەو بگەڕێت بە شوێنی تۆدا، وە جارێك دەیویست سواری ولاّغەکەی بێت، عەبدولاّی کوڕی عەباس هات و ڕەشۆی ولاّغەکەی بۆ گرت، ئەویش فەرمووی: وەها مەکە، ئیبنو عەباسیش فەرمووی: ئا بەم شێوەیە فەرمانمان پێ کراوە کە ڕێز لە گەورە و زانایانمان بگرین. ئەویش دەستی ئیبنوعەباسی گرت، و ماچی کرد، و فەرمووی: ئێمەش ئا بەم شێوەیە فەرمانمان پێ کراوە کە ڕێز لە خزم و خانەوادەی حەزرەتی پێغەمبەر بگرین.

◊ ئەبو داود و بەیهەقی لەخاریجەی کوڕی زەید بۆمان دەگێڕنەوە، ئەویش لە باوکییەوە کە فەرموویەتی: کاتێك کە حەزرەتی پێغەمبەر تەشریفی کۆچی کرد بۆ مەدینەی پیرۆز، منیان هێنایە خزمەتی، و عەرزیان کرد: قوربان، ئەم کوڕە لە هۆزی بەنی نەجارە، منیش حەڤدە سورەتی قورئانم خوێندبوو، وە لەبەرم کردبوو،

---

١) بخاري ٦٧٦٨

لەو کاتەدا بۆم خوێندەوە، حەزرەتیش سەری سوڕما، و فەرمووی: دەی خۆت فێری نوسین و زمانی جولەکەکان بکە، چونکە من لێیان بە گومانم، و ئەمین نیم کە شتێکیان بۆ بنوسم، ئەوجا زەید دەفەرموێت: منیش نەمهێشت نیو مانگ تێپەڕ بکات خۆم زۆر بە باشی فێری زمان و نوسینیان کرد، ئیتر هەموو جار من کاغەزم بۆ دەنوسین، و ئەگەر کاغزیشیان بهاتایە من دەمخوێندەوە.(١)

◊ کۆمەڵێك لە هاوەڵانی حەزرەتی پێغەمبەر لەم ئیمامەوە هەندێك فەرموودەی حەزرەتیان گێڕاوەتەوە، وەك: ئەبو هورەیرە، و ئیبنو عەومەر، و ئەنەس، و ئەبو سەعیدی خودری، و سەهلی کوڕی سەعد، و سەهلی کوڕی حەنیف، سەهلی کوڕی ئەبو حەثمە، و عەبدولاّی کوڕی یەزید، وە هەروەها کۆمەڵێکیش لە تابیعین فەرموودەی حەزرەتیان لێوە گێڕاوەتەوە، وەك: سەعیدی کوڕی موسەیەب، و قاسمی کوڕی موحەمەد، و سولەیمانی کوڕی یەسار، و دوو کوڕەکەی خۆی کە ناویان خاریجە و سولەیمان بوە، وە هەندێکی تریش.

◊ لە ساڵی (٤٥) ی کۆچی لە سەردەمی موعاویەی کوڕی ئەبو سوفیاندا وەفاتی کردوە.(٢)

---

١) أبو داود ٣٦٤٥، و السنن الكبرى ٢٠١٩٤.

٢) بڕوانە: الإصابة في تمييز الصحابة برقم ٢٨٨٢، أحمد بن علي بن حجر أبو الفضل العسقلاني الشافعي / دار الجيل – بيروت / ط ١ / ١٤١٢ / تحقيق: علي محمد الحاوي / عدد الأجزاء: ٨، الطبقات الكبرى٣٥٩ _ ٣٦١، محمد بن سعد بن منيع أبو عبدالله البصري الزهري / دار صادر – بيروت / عدد الأجزاء: ٨، المطلع على أبواب الفقه / محمد بن أبي الفتح البعلي الحنبلي أبو عبد الله / المكتب الإسلامي - بيروت، ١٤٠١ – ١٩٨١ / تحقيق: محمد بشير الأدلبي / ١ جزء. تذكرة الحفاظ / ١ / ٣٠ _ ٣٢ / محمد بن أحمد بن عثمان بن قايماز الذهبي أبو عبد الله / ٤ جزء. مشاهير علماء الأمصار / ١ / ١٠ / محمد بن حبان بن أحمد أبو حاتم التميمي البستي / دار الكتب العلمية - بيروت، - ١٩٥٩ / تحقيق: م. فلايشهمر / ١ جزء.

## پلەوپایەی لای زانایان

◊ ثابیتی کوڕی عوبەید دەفەرموێت: کەسم نەبینیوە وەك زەید لە ناو ماڵ و منداڵی خۆیدا ڕووخۆش و نەرموو نیان بێت، و لە ناو خەڵکیشدا بە ویقار بێت.

◊ ئەگێڕنەوە کە ئیمامی عومەری کوڕی خەطاب لە جێگەیەك دا بە ناوی (جابیة) وتاری دەدا، لە بەشێکی وتارەکەیدا فەرمووی: هەرکەسێك پرسیاری لەبارەی فرائض هەیە با بپرسێت لە زەیدی کوڕی ثابت.[١]

◊ عامری شەعبی دەفەرموێت: زەیدی لە دوو بواردا زانا بوو: قورئان، و فرائض.[٢]

◊ ئەبو ئیسحاق لە مەسروقەوە دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: کە هاتمەوە مەدینەی پیرۆز بینیم کە یەك لە هەرە زاناکانی ئەو شارە بریتیە لە زەیدی کوڕی ثابت.[٣]

◊ ئیبنو شەهابی زوهری دەفەرموێت: ئەگەر عثمانی کوڕی عەفان و زەیدی کوڕی ثابت لەناو بچن و نەمێنن، ئەوا زانستی فرائض لەناو دەچێت و نامێنێت.[٤] وە لە جێگەیەکی تردا دەفەرموێت: پێم وایە ئەگەر زەیدی کوڕی ثابت فرائضی نەنوسیبایەوە، ئەوا لە ناو خەڵکیدا نەدەما.[٥] دەگێڕنەوە: ئەو ڕۆژەی کە وەفاتی کرد، ئەبو هورەیرە فەرمووی: ئەمڕۆ زانای پایە بەرز و

---

١) المستدرك٥١٩١، المعجم الأوسط ٣٧٨٣، سنن سعيد بن منصور ٢٣١٩، ابن أبي شيبة ٣١٠٣٩، السنن الكبرى١١٩٦٩

٢) السنن الكبرى١١٩٧٩.

٣) مسند ابن جعد ٢٥١٤، علي بن الجعد البغدادي / مؤسسة نادر – بيروت / ط ١ / ١٩٩٠ / ت: عامر أحمد حيدر.

٤) الدارمي ٢٨٥٢، السنن الكبرى ١١٩٧١.

٥) السنن الكبرى ١١٩٧٠.

خواناسی ئەم ئومەتە وەفاتی کرد، ڕجامان وایە لە دەرگای پڕ سۆز و بەزەیی خودا کە بە ئیبنو عەباس جێگەکەیان بۆ پڕ بکاتەوە.(١)

◊ سالیمی کوڕی عەبدولا دەفەرموێت: ئەو ڕۆژەی کە زەید وەفاتی کرد: ئێمە لە خزمەت عەبدولای کوڕی عومەردا بووین، منیش وتم: ئەمڕۆ زاناترین کەس وەفاتی کرد. عەبدولاش فەرمووی: بەڕاستی زاناترین کەس بوو لە سەردەمی ئیمامی عومەردا، ئەو کاتەی کە موسوڵمانان بە زۆرێک لە ولاتاندا بلاو کرابوونەوە، ئیمامی عومەر فەرموبووی: کەس بە ڕەئی خۆی فەتوا نەدات. بەلام زەیدی دانابوو لەسەر شاری مەدینە، کە فەتوایان بۆ بدات، لەگەڵ ئەوەی کە زۆرێك لە زانا گەورە بە تەمەنەکانیش لەوکاتەدا لە ژیاندا بوون.(٢)

◊ دەگێڕنەوە کە ئەو ڕۆژەی کە وەفاتی کرد، عەبدولای کوڕی عەباس لەسەر گۆڕەکەی ڕاوەستابوو، و ئاماژەی کرد بە گۆڕەکە و فەرمووی: ئا بەم شێوەیە زانست نامێنێت، پیاوی وەك ئەم پیاوە وەفات دەکات، و زانیاری وەهای لەلایە کە لەلای کەسیتر نیە، ئیتر ئەوەی کە پێیەتی لەگەڵ خۆیدا دەیبات، بەڕاستی ئەمڕۆ زانستێکی زۆر کرایە ژێر خاکەوە.(٣)

---

٦) المستدرك ٥٨٠٥، المعجم الكبير ٤٧٥٠، الآحاد و المثاني ٣٩٣ _ ٢٠٤٣.

١) الطبقات الكبرى ٢ / ٣٦١ .

٢) المستدرك٥٨١٠، المعجم الكبير ٤٧٤٩، ابن أبي شيبة ١١٩٨٤، السنن الكبرى ١١٩٧٧، الآحاد و المثاني ٢٠٤٢.

# ئیمامی شافیعی

ناوی موحەمەدی کوڕی ئیدریسی کوڕی عەباسی کوڕی عوثمانی کوڕی شافیعی کوڕی سائیبی کوڕی عوبەیدی کوڕی عەبدولاّی کوڕی عەبدویەزیدی کوڕی هاشمی کوڕی عەبدومەنافی کوڕی قوصەی قورەیشی مەکەیییە. لە عەبدومەناف دا لەگەڵ پێغەمبەری خودادا دەگەن بە یەك.

پێی دەوترێت: شافیعی بە ناوی شافیع کە باپیرەی سێیەمە. کە لە غەزای بەدردا لەگەڵ سائیبی باوکیدا موسوڵمان بوون.

وە لە سەری دایکیەوە ناوی: موحەمەدی کوڕی فاطیمەی کچی عەبدولاّی کوڕی حەسەنی کوڕی حوسەینی کوڕی ئیمامی عەلی کوڕی ئەبو طالیبە.

یەك لە شاعیران دەفەرموێت:

نسب كأنّ عليه من شمس الضحى نورا، ومن فلق الصباح عمودا
ما فيه إلاّ سيد من سيد حاز المكارم، و التقى، و الجودا

## قۆناغەکانی ژیانی

◊ ساڵی (١٥٠) ی کۆچی لە شاری (غەزە) لە فەلەسطین لە دایك بوە، کە ڕێکەوتی ساڵی وەفاتی ئیمامی ئەبو حەنیفە دەکات.

◊ دوای ئەوەی کە باوکی وەفات دەکات، و ئەو کاتەی کە تەمەنی دوو ساڵ دەبێت، دایکی دەیباتەوە بۆ شاری مەکەی پیرۆز، ئیتر لەوێ بە هەتیوی گەورە دەبێت، و زۆرێك لە هۆنراوەکانیان لەبەر دەکات، و شارەزاییەکی زۆر پەیدا دەکات لە زمانی عەرەبیدا.

◊ لە تەمەنی (٧) ساڵیدا هەموو قورئانی پیرۆز لەبەر دەکات.

◊ لە تەمەنی (١٠) ساڵیدا (موطأ) ی ئیمامی مالیکیش لەبەر دەکات، پاشان دەچێتە خزمەتی زانای پایە بەرز و موفتی شاری مەکەی پیرۆز (موسلیمی کوڕی خالیدی زەنجی) بۆ فێربوونی زانستی شەریعەت.

◊ لەبەر لێهاتوویی و زیرەکی لە تەمەنی (١٥) ساڵیدا لەلایەن ئەم زانا پایەدارەوە ئیجازەی فەتوا دانی پێ دەدرێت، ئەگەرچی وەك وتمان هەتیو بوە، و زۆر نەدارا و کەم دەست بوە.

◊ پاشان دەچێت بۆ خزمەتی ئیمای مالیك لە شاری مەدینەی پیرۆز، و ماوەیەك لە خزمەتیدا دەمێنێتەوە، و (موطأ) ی لە خزمەتدا دەخوێنێت، و ئیمامی مالیك زۆر سەری سوڕ دەمێنێت لە توانا و زیرەکیەکەی، بۆیە ئامۆژگاری دەکات و دەفەرموێت: خوای گەورە نورێکی خستوەتە ناو دڵتەوە، ئاگات لێی بێت، و لە خوا بترسە، و خۆت لە تاوان بپارێزە، و ئەو نورە مەکوژێنەوە، بە یارمەتی خوا پلە و پایەت بەرز دەبێت. و بە خزمەتی سوفیانی کوڕی عویەینە و فوضەیلی کوڕی عەیاض و مامی خۆی موحەمەدی کوڕی شافیع گەیشتوە و هەندێك فەرموودەی حەزرەتی پێغەمبەری لێیانەوە گێڕاوەتەوە.

◊ لە ساڵی (١٨٣)ی کۆچی دەڕوات بۆ شاری بەغداد، لەوێ دوو ساڵ دەمێنێتەوە، و زۆرێك لە زانایانی ئەو کاتەی ئەو شارە لە دەوری کۆ دەبنەوە، واز لە مەزهەبی خۆیان دەهێنن، و دێنە سەر مەزهەبی ئیمامی شافیعی، چونکە ئەوەی کە لە لای ئەو دەستیان دەکەوت لای کەسێکی تر نەیان دەبینی، وە هەر لە ماوەی ئەو دوو ساڵەدا کتێبێك دادەنێت بە ناوی (الـحُجّة)، کە بە مەزهەبی کۆن دەناسرێت. پاشان دەگەڕێتەوە بۆ شاری (مكـة) ی پیرۆز، و ماوەیەکی تر دەمێنێتەوە، و پاشان دووبارە دەگەڕێتەوە بۆ بەغداد، و بۆ ماوەیەکی تر لەوێ

دەمێنێتەوە، و بە (ناصر الحدیث) دەناسرێت، و هەر لەو ساڵانەدا دوو جار ئیمامی ئەحمەدی کوڕی حەنبەل دێتە خزمەتی، و دەرسی شەریعەت و ئوصولی فیقهی لە خزمەتدا دەخوێنێت، ئەوانەی کە مەزهەبی کۆنیان گێڕاوەتەوە بریتی بوون لەم چوار ئیمامە: ئەحمەدی کوڕی حەنبەل، و ئەبو ثەور، و زەعفەرانی، و کەرابیسی.

◊ لە کۆتایی ساڵی (١٩٩) و سەرەتای ساڵی (٢٠٠) ی کۆچی تەشریف دەبات بۆ وڵاتی میصر، لەوێش کتێبەکانی مەزهەبی تازەی دادەنێت، و ئەوانەی کە ئەم مەزهەبەیان لێ گێڕاوەتەوە، بریتی بوون لەم ئیمامانە: موزەنی، و بوەیطی، و رەبیعی جیزی، و رەبیعی کوڕی سولەیمانی موورادی. ئیتر ناوی بە وڵاتاندا بڵاو دەبێتەوە، پۆل پۆل زانایان لە عیراق و شام و یەمەن و ناوچەکانی ترەوە دێن بۆ خزمەتی بۆ دەرس خوێندن. ئیمامی ڕازی لە کتێبەکەیدا بە ناوی (مناقب الشافعي) دەگێڕێتەوە کە موحەمەدی کوڕی حەمدانی کوڕی سوفیانی بەغدادی فەرموویەتی: جارێك هاتمە خزمەتی رەبیعی کوڕی سولەیمان، بینیم نزیکەی (٧٠٠) ئەسپ و وڵاغی سواری لەبەر دەرگای ماڵەکەیدا وەستا بوو، خاوەنەکانیان دانیشتبوون بۆ گوێگرتن لە کتێبەکانی ئیمامی شافیعی .

◊ لە ڕۆژی جومعە لە کۆتایی مانگی رەجەبی ساڵی (٢٠٤) ی کۆچی وەفات دەکات، و هەر ئەو ڕۆژە لە پاش نوێژی عەصر ئەسپەردەی خاکی دەکەن لە (قەڕافە).[١]

---

١) بۆ تەواوی ئەو زانیاریانەی کە لەسەر ئیمامی شافیعی نوسراوە بڕوانە: الفقه الإسلامي و أدلته / ١ / ٤٩ – ٥١، المجموع / ١ / ٢٢ – ٢٩، إعانة الطالبين / ١ / ١٦، حاشية الباجوري على شرح الشنشوري على الرحبية / ٣٨، تاريخ دمشق / المؤلف: ابن عساكر / ٨ / ٣٦٠ _ ٣٦١. مصدر الكتاب: ملفات وورد من على ملتقى أهل الحديث http://www.ahlalhdeeth.com ﴿ ترقيم الكتاب موافق للمطبوع والكتاب مذيل بحواشي المحقق علي شيري ﴾، و مختصر تأريخ دمشق لابن منظور. و المحمدون من

## حاڵەتەکانی ژیانی

◊ وەك باسمان کرد: ئەم ئیمامە پایە بەرزە بە هەتیوی گەورە بوە، زۆر نەدار و دەست کورت بوە، لەگەڵ ئەوەشدا زۆر بەهرەدار و سەرکەوتوو بوە لە ژیانیدا.

◊ خۆی دەفەرموێت: چومە خزمەتی ئیمامی مالیك و هەموو موەطئم لەبەر بوو، ئەویش فەرمووی: کەسێك بانگ بکە باوەکو بۆت بخوێنێتەوە. منیش وتم: خۆم دەیخوێنمەوە. ئیتر هەموویم بە لەبەر کراوی بۆ خوێندەوە، ئەویش زۆر سەری سوڕما، بۆیە فەرمووی: ئەگەر کەسێك بەختەوەر و سەرکوتوو بێت، ئەوە ئەم کوڕە گەنجەیە.

◊ لە تەمەنی پانزە ساڵیدا لەبەر لێهاتوویی و زیرەکی خۆی لە خزمەتی (موسلیمی کوڕی خالیدی زەنجی) دا دەبێت، ئەویش پێی دەفەرموێت لەو تەمەنە کەمەدا: فەتوا بدە، ئیستا کاتی فەتوادانت هاتوە.

◊ یەکەم کەس بوە کە کتێبی لە زانستی (أصول الفقه) دا نوسیوە.

◊ شەوی دابەش کردبوو بۆ سێ بەش: بەشێك بۆ زانست، و بەشێك بۆ نوێژ، و بەشێکیش بۆ خەو.

◊ هەموو ڕۆژێك قورئانی بە تەواوەتی خوێندوە، و لە مانگی ڕەمەزاندا شەست جار قورئانی بە تەواوەتی خوێندوە لەناو نوێژدا.

◊ خۆی دەفەرموێت: ماوەی شازدە ساڵ دەبێت تێر سکی خۆم نانم نەخواردوە، چونکە زۆر خواردن لاشە گران دەکات، و دڵ ڕەق دەکات، و ژیری زیرەکی کز دەکات، و خەو دێنێت بۆ مرۆڤ، و سستی دەکات لە خودا پەرستیدا.

◊ هەرگیز سوێندی نەخواردوە، نە بەڕاست، و نە بە درۆ.

---

الشعراء / ١/ ٤٢. للقفطي، مصدر الكتاب: موقع الوراق

◊ ئەگەر پرسیاری لە بارەی مەسئەلەیەکەوە لێ بکرایە، ڕادەوەستا، عەرزیان ئەکرد: قوربان بۆ وەلاّم نادەیەوە؟ ئەویش دەیفەرموو: با بزانم وەلاّم دانەوە باشە، یان بێ دەنگی.

◊ ئەگێڕنەوە کە سوفیانی ثوری ئەگەر پرسیارێکی تەفسیر، یان شەریعەتی لێ بکرایە، ئەویش لای دەکرد بەلای ئیمامی شافیعیەوە کە ئەو کاتە زۆر گەنج بوە، دەیفەرموو: بپرسن لەو کوڕە گەنجە.

◊ جارێك دەچێتە لای سەرتاشێك بۆ سەر چاك کردن، قژێکی درێژ و پۆشاکێکی تۆزاوی و کۆنی لەبەردا دەبێت، سەرتاشەکەش بە بێزێکەوە پێی دەڵێت: بچۆ بۆ لای یەکێکی تر. ئەویش کەسێکی لە خزمەتدا دەبێت، پێی دەفەرموێت: پارەت پێیە بیدە بەم سەرتاشە، ئەویش دە دیناری پێ دەبێت، دەیدات بە سەرتاشەکە، و ئیمامی شافیعیش بە دڵتەنگی و بێ تاقەتی یەکەوە دەفەرموێت:

عليَّ ثيابٌ، لو تُباع جميعُها بفلس، لكان الفلس منهن أكثرا
وفيهنَّ نفسٌ، لو يُقاسُ ببعضِها جميع الورى، كانت أجلَّ وأخطرا

## پلەو پایەی لای زانایان

◊ ئەم زانا پایە بەرزە موجتەهیدی موطلەقی سەربەخۆ بوە، زۆر شارەزا بوە لەم بوارانەدا: (الفقه، و الحديث، و أصول الفقه).

◊ ئیمامی ئەحمەد دەفەرموێت: ئیمامی شافیعی شارەزاترین کەس بوە لە قورئان و سونەتی پێغەمبەردا. وە لە جێگەیەکی تردا دەفەرموێت: هیچ کەس نیە کە دەستی قەڵەمی گرتبێت، و شتی نوسیبێت، و فەزڵی ئیمامی شافیعی لەسەر نەبێت. وە لە جێگەیەکی تردا دەفەرموێت: نەمدەزانی ناسیخ و مەنسوخی فەرموودەکانی حەزرەت لەیەك جیا بکەمەوە، تاوەکو هاتمە خزمەتی ئیمامی شافیعی.

◊ یونسی کوڕی عەبدولئەعلا دەفەرموێت: ئەگەر کۆمەڵێکی زۆر لە زانایان کۆبکەیتەوە، ئەوا زانست و ژیری ئیمامی شافیعی بەشی هەموویان دەکات.

◊ ئیسحاقی کوڕی راهەوەیهی دەفەرموێت ـ ئەحمەدی کوڕی حەنبەڵ پێی گەیشت، فەرمووی: وەرە با کەسێکت نیشان بدەم کە تاوەکو ئێستا کەسی وەهات بە چاو نەدیبێت. ئەوجا فەرمووی: بردمی بۆ خزمەتی ئیمامی شافیعی.

◊ ئەبو ثەور دەفەرموێت: وێنەی ئیمامی شافیعیم نەدیوە، و ناشی بینم. وە لە جێگەیەکی تردا دەفەرموێت: هەرکەس بڵێت: کەسێکی دیوە وەك ئیمامی شافیعی لە شەرع زانی، و ڕەوانبێژی، و شارەزایی، و لێهاتوویی‌دا، ئەوە درۆزنە، چونکە ئەم ئیمامە تاوەکو لە ژیاندا بوو هاووێنەی نەبوو، وە کاتێکیش وەفاتی کرد کەسێك نەبوو جێگەی بگرێتەوە.

◊ قاسمی کوڕی سەلام دەفەرموێت: زانای تەواو شارەزای وەك ئیمامی شافیعیم نەدیوە.

◊ عەبدولڵای کوڕی ئیمامی ئەحمەد دەفەرموێت: پرسیم لە باوکم: ئیمامی شافیعی چۆن پیاوێك بوو؟ چونکە زۆر دەتبینم دوعای خێری بۆ دەکەیت. ئەویش فەرمووی: کوڕی خۆم، ئیمامی شافیعی وەك خۆر وەهابوو بۆ دونیا، و وەك لەش ساغی وەها بوو بۆ لاشە، جا ئەم دووانە هیچ شتێك هەیە جێگەیان بگرێتەوە؟!، وە فەرمووی: (٣٠) سیساڵیش دەبێت من هیچ شەوێك ئیمامی شافیعیم لە بیر نەچوە لە دوعای خێردا.

◊ مەحفوظی کوڕی ئەبو تەوبەی بەغدادی دەفەرموێت: لە (المسجد الحرام) ئەحمەدی کوڕی حەنبەڵم دەبینی کە لە مەجلیسی ئیمامی شافیعی‌دا دادەنیشت، ڕۆژێك عەرزم کرد: ئەوە سوفیانی کوڕی عویەینەیە لەو گۆشەی مزگەوتەدا دەرس دەڵێتەوە، کەچی تۆ لای ئەم دادەنیشی؟! ئەویش فەرمووی: ئەمەی لای ئیمامی شافیعی لە دەست دەردەچێت، بەڵام ئەوەی لای ئەو لە دەست دەرناچێت.

◊ زەعفەرانی دەفەرموێت: زانایانی حەدیث نوستبوون، هەتاوەکو ئیمامی شافیعی هات، و خەبەری کردنەوە.

◊ حەزرەتی پێغەمبەر فەرموویەتی: " لا تسبوا قريشا فإن عالمها يملأ الأرض علما. [1]

واتە: جنێو مەدەن بە هۆزی قورەیش، چونکە زانای ئەو هۆزە بە زانست دونیا پڕ دەکات، واتە زانستی زانای قورەیش بە هەموو دونیادا بلاّو دەبێتەوە.

زۆرێك لە زانایان ئەو فەرموودەیەیان وەها لێکداوەتەوە کە ئەو زانایە ئیمامی شافیعی‌یە.

◊ هەموو زانایان یەکدەنگن لەسەر متمانە و ئەمانەت و دادپەروەری و لەخوا ترسی و پارێزکاری و پاکی و نەفس بەرزی و ڕەوشت جوانی و پایەداری و بەخشندەیی ئەم ئیمامە گەورەیە. بۆیە فەرموویانە: هەرچەند لە وەسفی‌دا بنوسیت، هێشتا هەر کەمتەرخەمی، و مافی خۆیت پێ نەداوە.

ئەوجا لەپاش ئاشنا بوونمان بە ژیانی هەریەك لەو دوو زانا پایەبەرزە خواناسە دڵسۆزە، دەچینە سەر ناوەڕۆکی بابەتەکە، بەشێوەیەك کە هەوڵ دەدەین تەواوی مەسئەلەکان و باسەکانی ئەم زانستە لە حەوت بەشی سەرەکی‌دا کۆبکەینەوە:

**بەشی یەکەم:** باس لە بنەما گشتی‌یەکانی ئەم زانستە دەکات، بە پێناسە، و بابەت، و مەبەست و ئامانج، و سەرچاوەی بڕیارەکان، و سەرەتایەکی مێژوویی، و بە پلەپلە هاتنی یاسای میرات، و حیکمەتەکانی دانانی ئەم یاسایە،

١) مسند الطيالسي ٣٠٩، معرفة السنن والآثار للبيهقي – باب ذكر مولد الشافعي رحمه الله تعالى وتاريخ وفاته ومقدار سنه: حديث: ٩٩، السنة لابن أبي عاصم – باب في فضل عالم قريش حديث: ١٣٠٤، حلية الأولياء ٦ / ٢٩٥.

و ڕوکنـەکان، و هۆیـەکان، و مەرجـەکان، و ڕێگرەکـانی مـیرات بـردن، وە لـە کۆتاییشدا ئەو مافانەی کە پەیوەستن بە میراتەوە.

**بەشی دوەم:** باس لە میرات بەر دەکات، چەند جۆری هەیە؟، چـۆن مـیرات دەبەن؟، ژمارەیان چەندە؟، خاوەن بەشەکان کێن؟، عەصەبە کـێن؟ چـەند جـۆری هەیە؟ بێبەش کردن لە میرات؟ و تەواوی ئەو حاڵەتانەی کە مـیرات بـەرانی تـێ دەکەوێت.

**بەشی سێیەم:** بـاس لـە حیـسابی فـرائض دەکـات، نیـسبەتی نێـوان ژمارەکان، ئەصڵی مەسئەلەکان، چەندیان عەولیان تێدا دەکرێت؟ عەول چییە؟ و چۆنێتی ساغ کردنەوەی مەسئەلەکان، و لە کۆتاییشدا باسی موناسەخات.

**بەشی چوارەم:** باس لە گەڕاندنەوە (ردّ)ی پاشماوەی بەشی میرات بـەرەکان بەسەریاندا دەکات.

**بەشی پێنجەم:** باس لە (ذوي الأرحام) دەکات، کێن؟ مـیرات دەبـەن، یـان نا؟ ئەگەر میرات ببەن، چۆنی دەبەن؟

**بەشی شەشەم:** باس لە میراتی هەندێك کەس دەکات کە حاڵەتی تایبەتیان هەیـە، وەك حاڵـەتی ون بـوو (المفقـود)، و کۆرپـەی ناوسـك (الحمـل، الجـنين)، و نێرەموك (الخنثى).

**بەشی حەوتەم:** باس لە هەندێك مەسئەلەی ناودار دەکات لە فرائض دا.

**لە کۆتاییشدا:** باس لە بابەتێکی زیندووی هەستیار دەکات، کە لە دونیـای ئێستادا ناحەزانی ئاینی پیرۆزی ئیسلام، وەك ڕەخنە بـەکاری دەهێـنن دژی ئـەم ئاینـە، کـە ئـەویش: تێگەیـشتنی هەڵەیـە لـە ئایـەتی ﴿ فَلِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ ٱلْأُنثَيَيْنِ ﴾.

# بەشی یەکەم
## سەرەتایەك بۆ چوونە ناو بابەتەکە

ئەم زانستە گرنگە وەك ئەوەی کە ناسراوە لەناو زانایاندا، باس لە چۆنێتی دابەش کردنی میرات دەکات لە نێوان میرات بەراندا، بە جۆرێك کە هەر خاوەن مافێك بگات بە مافەکەی خۆی لەو میراتەی کە بەجێ ماوە، وە دوو ناوی لێ نراوە:

(١) زانستی میرات: زانایان وەهایان پێناسە کردوە کە بریتیە لە کۆمەڵە یاسایەکی شەرعی و حیسابی، کە بە هۆیانەوە بەشی هەر میرات بەرێك دەزانرێت لەو میراتەی کە لەپاش مردوویەك بەجێ ماوە.

(٢) زانستی فرائض: زانایان وەهایان پێناسە کردوە کە بریتیە لە مەسئەلەکانی دابەش کردنی میرات، چونکە وشەی (فرائض) لە زمانی عەرەبیدا جەمعی (فريضة) یە، کە بە مانای شتێکی دیاری کراو هاتوە، جا لێرەدا شتە دیاری کراوەکان بریتین لەو بەشانەی کە بۆ میرات بەرەکان دیاری کراون.

ئەوجا ئەگەرچی هەموو میرات بەرەکان خاوەن بەشی دیاری کراو نین، بەلاّم لەبەرئەوەی کە هەندێکی زۆریان لە قورئانی پیرۆزدا بەشەکانیان دیاری کراوە، بۆیە بەم ناوەوە ناو نراوە، هەروەها خودای گەورەش لەپاش دیاری کردنی بەشی هەندێك لە میرات بەرەکان لە قورئاندا دەفەرموێت: ﴿فَرِيضَةً مِّنَ ٱللَّهِ﴾. وە حەزرەتی پێغەمبەریش کە هانی موسوڵمانانی داوە بۆ فێربوونی ئەم زانستە، فەرموویەتی: تعلموا الفرائض. جا لێرەدا هەموو ئەو یاسا و بنەمانە دەگرێتەوە، کە پەیوەندیان بە میرات بەرەکانەوە هەیە، لەو ڕووەوە کە ئایا خاوەن بەشن، یان عەصەبەن، یان (ذوي الأرحام) ن، یان میرات بەر لە چی کاتێکدا لە میرات بێبەش دەبێت، و بە کێ بێبەش دەبێت.

بەم پێیە ئەم زانستە بوو بە خاوەنی سێ ڕەگەزی سەرەکی:

(١) جیاکردنەوەی میرات بەر لە میرات نەبەر.

(٢) زانینی بەشە میراتی هەر میرات بەرێك.

(٣) حیساب کردنی مەسئەلەکان.

## سەرچاوەی بڕیارەکانی ئەم زانستە

ئەم زانستە پیرۆزەش وەك هەموو زانستە ئیسلامیيەکانی تر، بڕیارەکانی هەڵقولاوی چەند سەرچاوەیەکن، کە ئەوانیش:

أ. **قورئانی پیرۆز:** خودای گەورە دەفەرموێت:

• ﴿ يُوصِيكُمُ ٱللَّهُ فِيٓ أَوۡلَٰدِكُمۡۖ لِلذَّكَرِ مِثۡلُ حَظِّ ٱلۡأُنثَيَيۡنِۚ فَإِن كُنَّ نِسَآءٗ فَوۡقَ ٱثۡنَتَيۡنِ فَلَهُنَّ ثُلُثَا مَا تَرَكَۖ وَإِن كَانَتۡ وَٰحِدَةٗ فَلَهَا ٱلنِّصۡفُۚ وَلِأَبَوَيۡهِ لِكُلِّ وَٰحِدٖ مِّنۡهُمَا ٱلسُّدُسُ مِمَّا تَرَكَ إِن كَانَ لَهُۥ وَلَدٞۚ فَإِن لَّمۡ يَكُن لَّهُۥ وَلَدٞ وَوَرِثَهُۥٓ أَبَوَاهُ فَلِأُمِّهِ ٱلثُّلُثُۚ فَإِن كَانَ لَهُۥٓ إِخۡوَةٞ فَلِأُمِّهِ ٱلسُّدُسُۚ مِنۢ بَعۡدِ وَصِيَّةٖ يُوصِي بِهَآ أَوۡ دَيۡنٍۗ ءَابَآؤُكُمۡ وَأَبۡنَآؤُكُمۡ لَا تَدۡرُونَ أَيُّهُمۡ أَقۡرَبُ لَكُمۡ نَفۡعٗاۚ فَرِيضَةٗ مِّنَ ٱللَّهِۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمٗا ﴿١١﴾ ۞ وَلَكُمۡ نِصۡفُ مَا تَرَكَ أَزۡوَٰجُكُمۡ إِن لَّمۡ يَكُن لَّهُنَّ وَلَدٞۚ فَإِن كَانَ لَهُنَّ وَلَدٞ فَلَكُمُ ٱلرُّبُعُ مِمَّا تَرَكۡنَۚ مِنۢ بَعۡدِ وَصِيَّةٖ يُوصِينَ بِهَآ أَوۡ دَيۡنٖۚ وَلَهُنَّ ٱلرُّبُعُ مِمَّا تَرَكۡتُمۡ إِن لَّمۡ يَكُن لَّكُمۡ وَلَدٞۚ فَإِن كَانَ لَكُمۡ وَلَدٞ فَلَهُنَّ ٱلثُّمُنُ مِمَّا تَرَكۡتُمۚ مِّنۢ بَعۡدِ وَصِيَّةٖ تُوصُونَ بِهَآ أَوۡ دَيۡنٖۗ وَإِن كَانَ رَجُلٞ يُورَثُ كَلَٰلَةً أَوِ ٱمۡرَأَةٞ وَلَهُۥٓ أَخٌ أَوۡ أُخۡتٞ فَلِكُلِّ وَٰحِدٖ مِّنۡهُمَا ٱلسُّدُسُۚ فَإِن كَانُوٓاْ أَكۡثَرَ مِن ذَٰلِكَ

فَهُمْ شُرَكَآءُ فِي ٱلثُّلُثِۚ مِنۢ بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصَىٰ بِهَآ أَوْ دَيْنٍ غَيْرَ مُضَآرٍّۚ وَصِيَّةً مِّنَ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَلِيمٌ ﴿١٢﴾ ﴾ النساء

• ﴿يَسْتَفْتُونَكَ قُلِ ٱللَّهُ يُفْتِيكُمْ فِي ٱلْكَلَٰلَةِۚ إِنِ ٱمْرُؤٌا۟ هَلَكَ لَيْسَ لَهُۥ وَلَدٌ وَلَهُۥٓ أُخْتٌ فَلَهَا نِصْفُ مَا تَرَكَۚ وَهُوَ يَرِثُهَآ إِن لَّمْ يَكُن لَّهَا وَلَدٌۚ فَإِن كَانَتَا ٱثْنَتَيْنِ فَلَهُمَا ٱلثُّلُثَانِ مِمَّا تَرَكَۚ وَإِن كَانُوٓا۟ إِخْوَةً رِّجَالًا وَنِسَآءً فَلِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ ٱلْأُنثَيَيْنِۗ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمْ أَن تَضِلُّوا۟ۗ وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌۢ ﴿١٧٦﴾ ﴾ النساء

• ﴿وَأُو۟لُوا۟ ٱلْأَرْحَامِ بَعْضُهُمْ أَوْلَىٰ بِبَعْضٍ فِي كِتَٰبِ ٱللَّهِۗ إِنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَىْءٍ عَلِيمٌۢ ﴿٧٥﴾ ﴾ الأنفال

**ب. سونەت و فەرموودەکانی حەزرەتی پێغەمبەر:**

(١)عەبدولاّی کوڕی عەباس بۆمان دەگێڕێتەوە کە حەزرەت فەرموویەتی: (ألحقوا الفرائض بأهلها فما بقي فهو لأولى رجل ذكر) [(١)].

(٢)ئوسامەی کوڕی زەید بۆمان دەگێڕێتەوە کە حەزرەت فەرموویەتی: (لا يرث المسلم الكافر ولا الكافر المسلم) [(٢)].

(٣)عەمری کوڕی شوعەیب، لە باوکییەوە، ئەویش لە باپیرەیەوە، کە عەبدولاّی کوڕی عەمرە بۆمان دەگێڕێتەوە کە حەزرەت فەرموویەتی: لايتوارث أهل ملتين شتى [(٣)].

---

١) متفق عليه. بخاري ٦٣٥١، و مسلم ١٦١٥.

٢) متفق عليه. بخاري ٦٣٨٣، و مسلم ١٦١٤.

٣) أبو داود ٢٩١١، أحمد ٦٨٤٤، دار قطني / كتاب الفرائض ٢٥، سعيد بن منصور ١٣٧، عبد الرزاق ٩٨٥٧، السنن الكبرى ١٢٠٠٩.

(٤)عوبادەی کوڕی صامیت دەفەرموێت: یەکێك لە بڕیارەکانی حەزرەت ئەوەبوو کە: انه قضى للجدتين من الميراث بينهما السدس سواء[١].

(٥)لەبارەی ئەوەی کە کەسێك بمرێت: کچێك، و کچی کوڕێك، و خوشکێکی (باوکی) لەپاش بەجێ بهێنێت، عەبدولاّی کوڕی مەسعود فەرمووی: حەزرەت چۆنی بڕیار داوە، منیش هەروا بڕیار دەدەم، کچەکە نیوە دەبات، و کچی کوڕەکەش شەش یەك دەبات — وەك تەواو کردنی دووسێیەك -، و هەرچیش مایەوە خوشکەکە دەیبات[٢].

(٦)ئەگێڕنەوە لە میقدامەوە کە حەزرەت فەرموویەتی: من ترك مالا فلورثته وأنا وارث من لا وارث له أعقل له وأرثه والخال وارث من لا وارث له يعقل عنه ويرثه[٣].

(٧)دایکە عائیشە لەباسی میراتی سەرپەرشتیارا بۆمان دەگێڕێتەوە کە حەزرەت فەرموویەتی: الولاء لمن أعتق[٤].

ت. **کۆدەنگی و یەکدەنگی زانایان:** هەر مەسئەلەیەك کە دەقێکی ڕاشکاوی قورئانی پیرۆز، یان فەرموودەی حەزرەتی لەسەر نەبوویێت، ئەوجا زانا موجتەهیدەکان هەوڵیان داوە بڕیارێکی بۆ بدەن، و پاشان هەموویان یەکدەنگ

---

٤) أحمد ٢٢٨٣٠، المستدرك ٧٩٨٤، السنن الكبرى ١٢١٢٤.

٥) بخاري ٦٣٥٥، ابن ماجة ٢٧٢١، أحمد ٣٦٩١، الدارمي ٢٨٩٠، المستدرك ٧٩٥٨، دار قطني٧٩٥٨، المعجم الأوسط ٥٠١٢، ابن أبي شيبة ٢٩٠٥١، السنن الكبرى ١٢٠٩٠، النسائي الكبرى ٦٣٢٨.

١) أبو داود ٢٨٩٩.ابن ماجة ٢٨٩٩، أحمد ١٧٢٤٣، ابن حبان ٦٠٣٥، سعيد بن منصور ١٧٢، السنن الكبرى ١١٩٨٩

٢) البخاري ٣٧ - باب ذكر البيع والشراء على المنبر في المسجد. و مسلم ٢ - باب إنما الولاء لمن أعتق.

بون لەو بڕیارەدا. وەك یەكدەنگی زانایان لەسەر ئەوەی كە لەكاتی نەبوونی باوكدا باپیرە میرات دەبات.

پ. **ئیجتیهادی موجتەهیدەكان:** لە هەندێك بابەتدا زانا موجتەهیدەكانی هاوەڵانی حەزرەت، و زانایانی تابیعین بڕیاریان داوە بەگوێرەی ئیجتیهاد و هەوڵ و تێگەیشتنی خۆیان لەو بابەتانە، وەك بابەتی گەڕاندنەوە (ردّ)، و هەندێك لە مەسئەلەكانی بابەتی بێبەش بوون لە میرات (حجب)، و سێیەكی پاشماوە، كە نە لە قورئانی پیرۆز، و نە لە فەرموودەكانی حەزرەتدا نەهاتوە، لەگەڵ ئەوەشدا دانراوە وەك بەشی دیاری كراو بۆ هەندێك میرات بەر، لە هەندێك مەسئەلەدا، كە لە جێگەی خۆیدا ئاماژەی پێ دەكەین، و ڕوونی دەكەینەوە.

## یاسای میرات بردن لە پێش هاتنی ئیسلام

عەرەب لە پێش ئیسلامدا لە دوورگەی عەرەبیدا هەندێكی كەم دینداریان مابوو، كە لەسەر ئاینی حەزرەتی ئیبراهیم و ئیسماعیلی كوڕی بوون، پاشان لەو ماوەیەدا، و لە پێش هاتنی ئاینی ئیسلام، كۆمەڵێك بیرو بڕوا و داب و نەریتی نا شیاو و دوور لە عەقلیان هێنابوو كە لەسەری دەڕۆیشتن، و پێیانەوە پابەند بوون، وەك هاوبەش بڕیاردان بۆ خودای گەورە، و بت پەرستی، و زۆرێك لە داب و نەریتی بۆماوەی ناشیاو لە هەموو بوارەكانی كڕین و فرۆشتن، و ژن و ژنخوازی، و طەلاق، و میرات، و زۆری تریش.

بەڵام لە كاتێكدا كە خودای گەورە پێغەمبەری ئیسلامی ڕەوانە كرد، بەو ئاینە ڕاستە، و مایەی بەختەوەرییە، ئەوكات پێغەمبەریش بانگی كردن بۆ وەلاوەنانی هەموو ئەو گومڕایی و نەفامیانە، بەوەی كە لە هەموو بوارەكاندا بڕیاری پێویستی بۆ دان، و سنورەكانی بۆ دیاری كردن، و بنەما و یاساكانی بۆ داڕشتن، كە یەك لەو بوارانە بابەتی چۆنێتی میرات بردن بوو، چونكە ئەوان داب و

نەریتی تایبەتی خۆیان هەبوو، وەك ئەوەی کە ئەگەر چی میرات بردنیان لە ڕێگەی خزمایەتی و ژن و ژنخوازییەوە بوو، بەڵام میراتیان نەدەدا بە مێیینە، و بە منداڵ، بەڵکو تەنها میراتیان دەدا بەو نێرینانەی کە توانای جەنگ و شەڕیان هەبوو، بەو بڕوایەی کە هەرکەس توانای شەڕ کردنی نەبێت، و نەتوانێت بەرگری لە هۆز و خزمەکانی خۆی بکات، و نەتوانێت غەنیمە دەست بخات لە دوژمنان، ئیتر مافی میرات بردنی نابێت، و ئەمەشیان کردبوو بە بنەمایەکی سەرەکی بۆ میرات بردن.

## هۆیەکانی میرات بردن لە پێش هاتنی ئیسلام

وەك باسمان کرد میرات بردن لە سەردەمی نەفامی دا لەسەر هەندێك بنەمای دوور لە عەقل بوو، ئەگەرچی لەگەڵ عەقل و بیری خەڵکی ئەو سەردەمەدا زۆر گونجاو بوو، بۆیە بەلای ئەوانەوە هۆی میرات بردن بریتی بوون لە دوو شت:

(١) خزمایەتی: ئیتر لە ڕێگەی ژن و ژنخوازی دروست و ڕەواوە بوایە، یان لە ڕێگەی زینا و داوێن پیسیەوە.

(٢) بەکوڕکردن (التبني) ئەگەرچی بشزانرایە کە منداڵەکە منداڵی کێیە.

بەڵام هۆیەکی تریش هەبوو کە باسی لێوە کراوە، ئەگەرچی کەم بوە، ئەویش: پەیمان بەستن، و ڕێککەوتن. جا ئێستا بە درێژی دێینە سەر باسی هەریەك لەم هۆیانە:

### خزمایەتی

وەك باسمان کرد: بنەمای سەرەکی میرات بردن بریتی بوو لە خزمایەتی، بەڵام کام خزمایەتی؟ خزمایەتییەك کە لەسەر بڕوایەکی نەفامیانە، بڕوایەك کە میراتی دەدا بە نێرینەی جەنگاوەر و بەس، بەڵام مێیینە و منداڵی بێبەش

دەکرد، جا ئەم جیاکردنــەوە نەفامانــە وەك وتمــان سەرچــاوەی لــەو بــیرە بۆمــاوە سەقەتەوە گرتبوو کە دەیوت: دەبێت میرات بدرێت بە کەسێك کە توانای جـەنگ و دەست خستنی غەنیمە و تالآنی هەبێت. خۆ بێ گومان مێیینە بە گـشتی یـان توانایان نیە، یان هەندێکی کەمیان ئەگەر ئەم توانایەی هەبێت. وە منداڵیش بێ گومان ئەم توانایەی هەر نیە، دەی کەوابێت دەبێت میرات نەدرێت نە بە مێیینە، و نە بە منداڵ. بەڵام بە بیریاندا نەدەهات کە سەرچاوەی دەست کـەوتنی هـەموو ماڵ و سەروەتێك بریتیە لە ویستی خودای گەورە، هەروەها خۆیان بێئاگا کردبوو لەوەی کە مێیینە و منداڵ زیـاتر لـە هـەموو کـەس پێویـستیان بـە کۆمـەك و یارمەتی و چاودێری و سەرپەرشتیاری هەیە.(١)

## بەکوڕکردن

ئەم نیزامە زۆر باو بـوو لـەناو عەرەبـدا هـەتاوەکو سـەرەتای ئیـسلامیش، بەجۆرێك کە ئەگەر کەسێك کەسێکی تری بکردایە بە کوڕی خۆی ئـیتر ئـەم دوو کەسە میراتیان لە یەکتر دەبرد، ئەگەرچی هیچ جۆرە پەیوەندیەکی خزمایەتیش لە نێوانیاندا نەبووبێت.

وەك لە کتێبە تەفسیرەکاندا هاتوە: حەزرەتی پێغەمبەر لە پـاش ئـەوەی کـە زەیدی کەڕی حـارث کە کۆیلە بوو ئازادی کرد، دواتر بڕیاری دا کـە زەیـد کـوڕی خۆیەتی، بۆیە لە ناو هاوەڵانیشدا هەر بە زەیدی کوڕی موحەممەد بانگ دەکرا.(٢)

هەروەها (أبو حذيفة) ش سالمی کردبوو بە کوڕی خۆی، و ئـەویش بـە سـالمی کوڕی (أبو حذيفة) ناو دەبرا.(٣)

---

١) معالم التنزيل للبغوي ٢٠٥/١. التحرير و التنوير/٨٩٩/١. تفسير القرآن العظيم لابن كثير/٦٠٧/١.

٢) التحرير و التنوير/٨٩٩/١.

٣) المستدرك / ٥٠٠٠.

ئیتر ئەم حاڵەتە هەروا بەردەوام بوو هەتاوەکو موسوڵمانان بە تەواوەتی ئیسلامیان قەبوڵ کرد و پێی ڕازی بوون، و پلە بە پلە ئامادە بوون بۆ وەرگرتن و ڕازی بوون بە هەموو بڕیارێك کە شەریعەت بیدات، بۆیە زۆری نەخایاند خودای گەورە ئەم داب و نەریتەی هەڵوەشاندەوە بەم ئایەتانەی سورەتی ئەحزاب کە دەفەرموێت: ﴿ وَمَا جَعَلَ أَدْعِيَاءَكُمْ أَبْنَاءَكُمْ ذَٰلِكُمْ قَوْلُكُم بِأَفْوَاهِكُمْ ...(٤) ادْعُوهُمْ لِآبَائِهِمْ هُوَ أَقْسَطُ عِندَ اللَّهِ فَإِن لَّمْ تَعْلَمُوا آبَاءَهُمْ فَإِخْوَانُكُمْ فِي الدِّينِ وَمَوَالِيكُمْ (٥) ﴾

﴿ مَّا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَا أَحَدٍ مِّن رِّجَالِكُمْ وَلَٰكِن رَّسُولَ اللَّهِ وَخَاتَمَ النَّبِيِّينَ وَكَانَ اللَّهُ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمًا (٤٠) ﴾.

ئیتر ئەم نیزامە بەم ئایەتانە پوچەڵ بوویەوە، بەمەش ئەوەی کە لە سەری دەڕۆیشتن لە ڕووی میرات بردنەوە، ئەویش هەڵوەشایەوە، و ئەم داب و نەریتە سڕایەوە بۆ هەتا هەتایە.

## پەیمان بەستن و ڕێکەوتن

هۆیەکی تری میرات بردن بریتی بوو لە پەیمان بەستن و ڕێکەوتن لە نێوان دوو کەسدا کە بە ڕەزامەندی خۆیان ڕێك دەکەوتن و پەیمانیان دەدا بەیەکتر، بە جۆرێك کە یەکێکیان دەیگوت بە ئەوی تر: شەڕم شەڕی تۆیە، و ئاشتیم ئاشتی تۆیە، و میراتم لێ دەبەی و میراتت لێ دەبەم، و پشتیوانیم دەکەیت و پشتیوانیت دەکەم، و خوێنی پیاو کوشتنم بۆ دەدەی و خوێنی پیاو کوشتنت بۆ دەدەم.(١)

١) عبد الرزاق/١٩١٩٧، السنن الكبرى/٢٠١٦٥، سعيد بن منصور/٢٥٩، روح المعاني للآلوسي/٥/٢٢.

ئیتر بەمە دەبوون بە دۆست و هاوپەیمانی یەکتر، جا هەرکامیان لە پێشدا بمردایە، ئەوی تریان میراتی لێ دەبرد، ئیتر ئەم داب و نەریتەش هەروا بەردەوام بوو هەتا سەرەتای ئیسلامیش، وەك خوای گەورە ئاماژەی پێ دەکات لە سورەتی نیساء دا لە ئایەتی: ﴿وَٱلَّذِينَ عَقَدَتۡ أَيۡمَٰنُكُمۡ فَـَٔاتُوهُمۡ نَصِيبَهُمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَىٰ كُلِّ شَيۡءٖ شَهِيدًا ﴿٣٣﴾﴾

پاشان ئیسلام ئەم نیزامەشی هەڵوەشاندەوە، و میرات بردنی لەم ڕێگەیەوە سڕیەوە لە سورەتی ئەنفالدا بە ئایەتی: ﴿وَأُوْلُواْ ٱلۡأَرۡحَامِ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلَىٰ بِبَعۡضٖ فِي كِتَٰبِ ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمُۢ ﴿٧٥﴾﴾

## هۆیەکانی میرات بردن لە سەرەتای ئیسلام دا

هۆیەکانی میرات بردن لە سەرەتای سەرهەڵدان و بڵاو بوونەوەی ئیسلام دا بریتی بوون لە دوو هۆ:

(١) کۆچ کردن.

(٢) برایەتی.

حەزرەتی پێغەمبەر لە سەرەتای بڵاو بوونەوە و تەشەنە کردنی ئیسلام دا دەیویست کۆمەڵێکی بەهێز، و یەکگرتوو دروست بکات، بۆیە هەستا کۆچ کردنی موسوڵمانان لە مەکەی پیرۆزەوە بۆ مەدینەی پیرۆز، و برایەتی نێوان کۆچکەر و پشتیوانانی کرد بە دوو هۆ بۆ بردنی میرات لە نێوان موسوڵمانان دا. جا ئێستا بە درێژی باس لە هەردووکیان دەکەین.

## کۆچ کردن

لە پاش ئیعلان کردنی بانگەشەی ئیسلامی لە شاری مەکەی پیرۆز، سەرەتا عەرەبە موسوڵمانەکان لەسەر ئەوەی کە لەسەری بوون لە چۆنێتی میرات بردنیان لە یەکتری بۆ ماوەیەك مانەوە، بەڵام دواتر نیزامێکی کاتییان بۆ دانرا کە لەسەر کۆچ کردن لە مەکەوە بۆ مەدینە دامەزرابوو، چونکە ئەوکاتە موسوڵمانان ژمارەیان کەم بوو، و پێویستیان بە کۆمەکی و پشتیوانی یەکتر هەبوو، بۆیە کە حەزرەتی پێغەمبەر بڕیاری کۆچ کردنی دا، ئیتر پێویست کرا لەسەر موسوڵمانانیش کە کۆچ بکەن، بەمەش زۆرێك لە موسوڵمانان کۆچیان کرد، موسوڵمانەکانی مەدینەش پشتیوانیەکی زۆر کەم وێنەیان لێ کردن، بە جۆرێك کە لە زۆر شتدا لە پێش خۆیانەوە دایان دەنان، و فەزڵیان دەدان بەسەر خۆیان دا.

ئەوجا ئیتر ئەو ئایەتەی سورەتی ئەنفال دابەزی کە دەفەرموێت:

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَهَاجَرُواْ وَجَٰهَدُواْ بِأَمْوَٰلِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ وَٱلَّذِينَ ءَاوَواْ أُوْلَٰٓئِكَ بَعْضُهُمْ أَوْلِيَآءُ بَعْضٍۚ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَلَمْ يُهَاجِرُواْ مَا لَكُم مِّن وَلَٰيَتِهِم مِّن شَيْءٍ حَتَّىٰ يُهَاجِرُواْۚ .. ﴿٧٢﴾ ﴾

بەپێی ئەم ئایەتەش ئەگەر یەکێك لە کۆچبەرەکان وەفاتی بکردایە لە شاری مەدینە، وە خزمێکی نەبوایە لە ناو کۆچ بەران دا، ئەوا ئەو پشتیوانەی کە برایەتی دروست کرابوو لە نێوانیان دا میراتی لێ دەبرد، بە هۆی ئەو داڵدە دان و پشتیوانی کردنەوە کە لە کۆچ بەرەکەی کردبوو، بەمەش ئەگەر موسوڵمانە کۆچ بەرەکە برا و خزمی موسوڵمانی خۆشی هەبوایە هەر میراتی لێ نەدەبرد مادەم ئەمیش وەك ئەو کۆچبەر نەبوایە.[1]

---

١) السنن الكبرى ٢١٢٤٢، زاد المسير في علم التفسير، عبد الرحمن بن علي بن محمد الجوزي ٢ / ٧١ – ٧٣. روح المعاني/ ١٠ / ٣٩، إرشاد العقل السليم إلى مزايا القرآن الكريم لأبي السعود / ٧ / ٩١. التحرير و التنوير / ١ / ٨٩٩.

## برایەتی

ئەو برایەتییەی کە حەزرەتی پێغەمبەر لە نێوان کۆچ کەران و پشتیوانان دا دروستی کردبوو یەکێك بوو لەو هۆیانەی کە بە هۆیەوە موسوڵمانان میراتیات لە یەکتری دەبرد، ئەم نیزامەش بەردەوام بوو هەتاوەکو ئازاد کردنی شاری مەکەی پیرۆز، ئیتر لەو ڕۆژەوە کاری پێ نەکرا، و هەڵوەشایەوە، بەوەی کە حەزرەت بڕیاری دا کە لەمڕۆ بە دواوە کۆچ کردن نەما، بەمەش ئەو نیزامە هەڵوەشایەوە کە کۆچ کردن و برایەتی کردبوو بە هۆی میرات بردن لە نێوان موسوڵمانان دا، هەروەها خودای گەورە ئایەتی دابەزاند بۆ سڕینەوەی ئەو نیزامە، وەك لە سورەتی ئەنفال دا دەفەرموێت: ﴿وَأُوْلُواْ ٱلْأَرْحَامِ بَعْضُهُمْ أَوْلَىٰ بِبَعْضٍ فِي كِتَٰبِ ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمُۢ ۝٧٥﴾، ئیتر بۆ هەتا هەتایە ئەم نیزامە هەڵوەشایەوە و سڕایەوە[1]. بەلام سەبارەت بە خزمایەتی، ئاینی ئیسلام دانی نا بەوەدا کە یەکێکە لە هۆیەکانی میرات بردن، بەلام نەك وەك ئەو خزمایەتییەی کە لە زەمانی نەفامی دا باسمان لێوە کرد، بەڵکو هەموو ئەو هەڵە و ستەمانەی کە لە نیزامی نەفامی دا هەبوو ئیسلام هیچی نەهێشت، هەروەها ئیسلام هۆیەکی تریشی دانا بۆ میرات بردن، کە ئەویش ژن و ژنخوازیە، چونکە وەك باسمان کرد ژن میراتی نەدەبرد لە سەردەمی نەفامی دا، هەروەها هۆی سێیەمیشی زیاد کرد کە بریتی بوو لە: سەرپەرشتیاری (الولاء).

---

٢) السنن الكبرى ١٢٣٠٩، دار قطني ٩٧.

# بە پلە پلە هاتنی یاسای میرات

(١) سەرەتا ئەوەی کە عەرەبی لەسەر بوو لە سەردەمی نەفامی دا، هەر لەسەر ئەوە دەڕۆیشتن، تاوەکو ئامادە بکرێن بە شێوەیەك کە دڵ ئارام بن، و ئەگەر لەمەوپاش هەر گۆڕانکاریەك کرا، زۆر بە ئاسانی وەری بگرن، و پێی ڕازی بن.

(٢) پاشان میرات لە ڕێگەی بەکوڕ کردنەوە هەڵوەشێنرایەوە، میرات لە ڕێگەی کۆچ کردنەوە جێگەی گرتەوە.

(٣) پاشان کارەکە درایە دەست ئەو کەسەی کە کاتی مردنی نزیك بوەتەوە، بە جۆرێك کە گومان زیاتر بۆ مردنی دەچێت، نەك ژیانی، بەوەی کە ئەو کەسە وەسێتی دەکرد بۆ دایك و باوك و خزم و کەسوکاری هەرچۆن کە خۆی بیەوێت، بەبێ ئەوەی کە هیچ باسێکی بەشی دیاری کراو هەبێت بۆ هیچ کەسێك. وەك خودای گەورە لە سورەتی بەقەرەدا دەفەرموێت: ﴿ كُتِبَ عَلَيْكُمْ إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ ٱلْمَوْتُ إِن تَرَكَ خَيْرًا ٱلْوَصِيَّةُ لِلْوَٰلِدَيْنِ وَٱلْأَقْرَبِينَ بِٱلْمَعْرُوفِ ۖ حَقًّا عَلَى ٱلْمُتَّقِينَ ﴿١٨٠﴾ ﴾.

(٤) پاشان بە شێوەیەکی کورت باسی لە میرات بردن کرد، بە جۆرێك کە ڕوونی نەکردبوەوە کە هەر میرات بەرێك چەند میرات دەبات، و کام میرات بەر لە پێش کامی ترەوەیە، وەك خودای گەورە لە سورەتی نیساء دا دەفەرموێت: ﴿ لِّلرِّجَالِ نَصِيبٌ مِّمَّا تَرَكَ ٱلْوَٰلِدَانِ وَٱلْأَقْرَبُونَ وَلِلنِّسَآءِ نَصِيبٌ مِّمَّا تَرَكَ ٱلْوَٰلِدَانِ وَٱلْأَقْرَبُونَ مِمَّا قَلَّ مِنْهُ أَوْ كَثُرَ ۚ نَصِيبًا مَّفْرُوضًا ﴿٧﴾ ﴾.

(٥) پاشان بە درێژی ڕوونی کردەوە، و زۆر دادوەرانە بەشە میراتی هەر میرات بەرێکی دیاری کرد، بە چەند ئایەتێك لە سورەتی نیساء، وەك

دەفەرموێت: ﴿ يُوصِيكُمُ ٱللَّهُ فِيٓ أَوۡلَٰدِكُمۡۖ لِلذَّكَرِ مِثۡلُ حَظِّ ٱلۡأُنثَيَيۡنِۚ فَإِن كُنَّ نِسَآءٗ فَوۡقَ ٱثۡنَتَيۡنِ فَلَهُنَّ ثُلُثَا مَا تَرَكَۖ وَإِن كَانَتۡ وَٰحِدَةٗ فَلَهَا ٱلنِّصۡفُۚ وَلِأَبَوَيۡهِ لِكُلِّ وَٰحِدٖ مِّنۡهُمَا ٱلسُّدُسُ مِمَّا تَرَكَ إِن كَانَ لَهُۥ وَلَدٞۚ فَإِن لَّمۡ يَكُن لَّهُۥ وَلَدٞ وَوَرِثَهُۥٓ أَبَوَاهُ فَلِأُمِّهِ ٱلثُّلُثُۚ فَإِن كَانَ لَهُۥٓ إِخۡوَةٞ فَلِأُمِّهِ ٱلسُّدُسُۚ مِنۢ بَعۡدِ وَصِيَّةٖ يُوصِي بِهَآ أَوۡ دَيۡنٍۗ ءَابَآؤُكُمۡ وَأَبۡنَآؤُكُمۡ لَا تَدۡرُونَ أَيُّهُمۡ أَقۡرَبُ لَكُمۡ نَفۡعٗاۚ فَرِيضَةٗ مِّنَ ٱللَّهِۗ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلِيمًا حَكِيمٗا ﴿١١﴾ وَلَكُمۡ نِصۡفُ مَا تَرَكَ أَزۡوَٰجُكُمۡ إِن لَّمۡ يَكُن لَّهُنَّ وَلَدٞۚ فَإِن كَانَ لَهُنَّ وَلَدٞ فَلَكُمُ ٱلرُّبُعُ مِمَّا تَرَكۡنَۚ مِنۢ بَعۡدِ وَصِيَّةٖ يُوصِينَ بِهَآ أَوۡ دَيۡنٖۚ وَلَهُنَّ ٱلرُّبُعُ مِمَّا تَرَكۡتُمۡ إِن لَّمۡ يَكُن لَّكُمۡ وَلَدٞۚ فَإِن كَانَ لَكُمۡ وَلَدٞ فَلَهُنَّ ٱلثُّمُنُ مِمَّا تَرَكۡتُمۚ مِّنۢ بَعۡدِ وَصِيَّةٖ تُوصُونَ بِهَآ أَوۡ دَيۡنٖۗ وَإِن كَانَ رَجُلٞ يُورَثُ كَلَٰلَةً أَوِ ٱمۡرَأَةٞ وَلَهُۥٓ أَخٌ أَوۡ أُخۡتٞ فَلِكُلِّ وَٰحِدٖ مِّنۡهُمَا ٱلسُّدُسُۚ فَإِن كَانُوٓاْ أَكۡثَرَ مِن ذَٰلِكَ فَهُمۡ شُرَكَآءُ فِي ٱلثُّلُثِۚ مِنۢ بَعۡدِ وَصِيَّةٖ يُوصَىٰ بِهَآ أَوۡ دَيۡنٍ غَيۡرَ مُضَآرّٖۚ وَصِيَّةٗ مِّنَ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ عَلِيمٌ حَلِيمٞ ﴿١٢﴾ يَسۡتَفۡتُونَكَ قُلِ ٱللَّهُ يُفۡتِيكُمۡ فِي ٱلۡكَلَٰلَةِۚ إِنِ ٱمۡرُؤٌاْ هَلَكَ لَيۡسَ لَهُۥ وَلَدٞ وَلَهُۥٓ أُخۡتٞ فَلَهَا نِصۡفُ مَا تَرَكَۚ وَهُوَ يَرِثُهَآ إِن لَّمۡ يَكُن لَّهَا وَلَدٞۚ فَإِن كَانَتَا ٱثۡنَتَيۡنِ فَلَهُمَا ٱلثُّلُثَانِ مِمَّا تَرَكَۚ وَإِن كَانُوٓاْ إِخۡوَةٗ رِّجَالٗا وَنِسَآءٗ فَلِلذَّكَرِ مِثۡلُ حَظِّ ٱلۡأُنثَيَيۡنِۗ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمۡ أَن تَضِلُّواْۗ وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمُۢ ﴿١٧٦﴾ ﴾ بەمەش هەموو ئەو داب و نەریتانەی کە لەسەردەمی نەفامی، و لە سەرەتای ئیسلام دا لەسەری بوون هەمووی سڕایەوە ، بە جۆرێك کە هەر میرات بەرێك بەشی دیاری کراوی خۆی

دەزانێت، و هیچ جۆرە ستەمێکیش لە دابەش کردنەکەدا نیە، و موسوڵمانان هەموو دڵ ئارام بوون لەسەر ئەوەی کە هەموو کەس دەگات بە مافی خۆی، ئەو دابەش کردنە پڕ لە حیکمەتەی خودای گەورە، بوو بە هۆی نەمان و لاچوونی هەر ڕق و کینەیەك کە پێشتر لە دڵیان دا پەیدا بووبوو.

## حیکمەتەکانی دانانی یاسای میرات

خودای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا باسی میرات بردن، و میرات بەرانی بەشێوەیەکی درێژ و ڕوون هێناوە، کە بێگومان ئەم باسەش بەم شێوەیە خاڵی نیە لە حیکمەت، بۆیە دەکرێت بوترێت: هەندێك لە حیکمەتەکان ئەمانەن [1]:

(١) ڕێگە گرتن لە زاڵبوونی سۆز بەسەر بیر و عەقڵی مرۆڤەکان دا، و ڕێگە گرتن لە شوێن ئارەزوو کەوتن، و هەڵوەشاندنەوەی هەموو داب و نەریتەکانی نەفامی کە باو بوون لەناو خەڵکی ئەو کاتەدا، ئەمەش بوو بە هۆی فراوان بوونی بازنەی چاکەکاری و سوود وەرگرتن، بۆیە پێغەمبەریش (دروودی خوای لێ بێت) زۆری دووپات کردوەتەوە، و سوور بوە لەسەر ئەوەی کە پێویستە میرات بەرەکان بە دەوڵەمەندی بەجێ بهێلرێن، و فەرموویەتی: بەم شێوە باشترە لەوەی کە بە نەداری، و هەژاری بەجێ بهێلرێن، بەمەش موسوڵمانانی هان دا، و ڕای هێنان لە لایەك لەسەر ئەوەی کە: دەسهاتی خۆیان پەرە پێ بدەن، و زیادی بکەن، و لە لایەکی تریشەوە دادپەروەری دابین کرد لە نێوانیان دا. کەواتە: ئەوەی کە ڕژێم، و یاساکانی پێشتر لەسەری ڕۆیشتون، ئیسلام بەو شێوەیەی نەکردوە، کە هەموو دارایی، و سەر مایە بداتە دەست کوڕی گەورە بە تەنها، و لەلای ئەو قەتیسی

---

١) المجموع ٧٤ — ٧٦، الفقه المنهجي ٢ / ٢٧٠ - ٢٧١.

بکات، بەمەش یەك لە بنەما گشتیەکانی هێنایە دی کە ئەویش: ماڵ و موڵك نابێت تەنها قۆرخ بێت لە دەستی دەوڵەمەندەکان دا.

(٢) بە درێژی باس کردنی بابەتی میرات لە قورئان دا، لەبەر ڕێگە گرتن، و ڕێگە نەدانە بە هەر گۆڕانکاری‌یەك کە بکرێت لە چۆنێتی دابەش کردنی دا، بەهۆی گۆڕانی کات، و شوێن. ئەمەش ئەو حیکمەتەیە کە خودای گەورە مەبەستیەتی لە هەموو ئەو بابەتانەی کە هاوشێوەی بابەتی میراتن، وەك: (نکاح)، و (طلاق)، و شیر پێدان (رضاع)، و (حدود)، و تاوانەکان (جنایات)، و ...هتد. جا بێ گومان، ئەم بە درێژی باس کردنە یارمەتی دەرە لەسەر بلاّو بوونەوەی ئاسایش، و دادپەروەری لە ناو کۆمەڵگای موسوڵمانان دا، کە ئەمەش سەر دەکێشێت بۆ بەرەو پێش چوون، و گەشە کردن، و ئارامی، وجێگیری کۆمەڵگا، وە گومانیش لەوە دا نیە کە ترسناك ترین کێشەی کۆمەڵگا بریتیە لە: ناجێگیری، و دڵە ڕاوکێ لە مافە بنچینەییەکانی کۆمەڵ، جا لێرەوە ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە بۆچی حەزرەتی پێغەمبەر بایەخ، و گرنگیەکی زۆری داوە بە فێر بوونی (فرائض)، و ئێمەی لەسەر هانداوە.

(٣) بە درێژی باس کردنی میرات جۆرە کەش و هەوایەکی دیاری کراوی وەهای فەراهەم هێناوە بۆ پیاوان، کە بکەونە ژێر بەرپرسیارێتیەوە، تاوەکو بە باشی، و بەبێ کەم و کورتی بەم بەرپرسیارێتی‌یە هەڵسن، جا بەرپرسیارێتی‌یەکە چی بەرامبەر باوان بێت، یان نەوە، و وەچە، یان خزمانی سك، یان کۆمەڵگا، و موسوڵمانان بە گشتی، جا کە دەوترێت: بەشەکان بە درێژی، ئیتر بواری ئەوە نادرێت کە لەم جۆرە بەشانە دا بە بێ هوودە دەستی تێ بخرێت.

(٤) جێگیر کردنی ئەو ڕاستی‌یەی کە مرۆڤەکان لەکاتی ژیان، و زیندووییدا خۆیان خاوەنی ماڵ و موڵکی خۆیانن، وە خۆشیان ئەهلیەتیان هەیە بۆ هەر جۆرە تەصەڕوفێك لەو ماڵ و موڵکە دا، بەلاّم پاش ئەوەی کە دەمرن، بێ گومان ئەو توانایەیان نامێنێت، بۆیە پێویستە، کەسانێك کە نزیکن لێیانەوە (وەك کوڕ و

باوك بۆ نمونە) جێگەی ئەوان بگرنەوە، کەواتە ئەگەر کەسێك بمرێت، و هەر ماڵ و موڵکێکی لە پاش بەجێ بمێنێت، ئەوا شتێکی سروشتیە کە بدرێتە دەست نزیکترین کەسیەوە، کە تەصەڕوفی پێوە بکات، کەواتە ئەم جێگە گرتنەوە نیزامێکی سروشتی و پێویستە بۆ پاراستن و ئاگالێبوونی خزمانی ئەو مردوە.

(٥) یاسای میرات کە بە درێژی باس کراوە، ئەوە دووپات دەکاتەوە کە: ئاینی ئیسلام زۆر سوور، و بە پەرۆشە بۆ دابین کردنی بەردەوامی هاوسەنگ ڕاگرتن، و دادپەروەری لە نێوان بەشی پیاو، و ژن دا، بە شێوەیەك، کە بوار، و دەرفەت نادات بە ئارەزوو پەرستان کە دەروونی نەخۆشیان بسەپێنن، و بەمەش یان ستەم لە پیاو دەکەن، یان لە ژن، بە تایبەتی، دەوران، و خەڵکانی پێشوو ئەم جۆرە لایەن گیریەی تێدایە، جا چی لە لایەن دەسەلاّت دارەکانەوە بێت، یان لە لایەن بیر مەندەکانەوە، و بۆیە وەك دەبینین: هەندێك جار ستەم لە پیاو کراوە، و هەندێك جار لە ژن، جا بۆیە لێرە دا شەریعەتی ئیسلام بە درێژی ئەم باسەی کردوە، تاوەکو ئەم جۆرە ئارەزوو بازیە ڕیشە کێش بکات، و بێ بڕوایی تاوان بارانیش دەربخات دەربارەی دەقە قورئانیەکان، و بەمەش هیچ بوارێکی نەهێشتەوە بۆ کاسپی کردن بە پەیوەندیەکانی پیاو بە ژنەوە.

(٦) بە درێژی باس کردنی میرات بۆ ئەوەیە کە بزانرێت ئاینی ئیسلام ماف، و ئەرکەکان بە یەکەوە دەبەستێت، یان بە شێوەیەکی تر بڵێین: بەستنەوەی سوود، و دەسکەوت بە زیان، و لە دەست چوون، کەواتە بە ئەندازەی سوود، و دەسکەوتی میرات بەرێك لە میراتەکە بەر پرسیارێتی ئەو کەسە بەرامبەر بە بژاردنەوە، و دانەوەی قەرزی مردوەکە، و هەم بە خێو کردن، و ژیاندنی ئەو منداڵانەی کە پێویستیان بە داژیار، و بەخێوکەر درووست دەبێت، بۆیە هەرگیز نابینیت کە لە ئیسلام دا میرات بەر لە سوودو دەسکەوتی میراتەکەدا بەشدار

بێت، بەڵام لە بەرپرسیارێتی بەرامبەر بە زیان بژاردن بەشدار نەبێت، بەمەش جۆرە هاوسەنگیەکی درووست کرد، دوور لە زیاد ڕەوی، و کەم تەرخەمی.

## کێ میرات دابەش بکات؟

ئەو کەسەی کە دەیەوێت میرات دابەش بکات پێویستە شارەزاییەکی باشی هەبێت لە هەر سێ زانستی (فتوی، و نسب، و حساب) دا، واتە ئەو کەسەی کە دەیەوێت میرات دابەش بکات لە نیوان میرات بەران دا، پێویستە شارەزا بێت لەو بڕیارە شەرعیانەی کە سەبارەت بە میرات هاتوە، بۆ نمونە: کام لە میرات بەرەکان خاوەن بەشی دیاریکراون، و کامییان عەصەبەن، و کامیان بە کامیان لە میرات بێبەش دەبێت، ...وە هەروەها، وە دەبێت شارەزابێت لە چۆنێتی پەیوەندی نێوان مردوو، و میرات بەرەکانی، بۆ نمونە: پەیوەندی خزمایەتیە، یان ژن و مێردایەتی، وە دەبێت شارەزاییەکی باشی هەبێت لە حساب کردن بە تایبەتی دابەش کردن، بۆ ئەوەی بتوانێت بە ئاسانی ئەصڵی مەسئەلەکان دروست بکات، و لەکاتی پێویستدا ساغیان بکاتەوە، تاوەکو هەموو میرات بەرێك بەشی خۆی بێ زیاد و کەم بدرێتێ.[١]

وە بە شێوەیەکی گشتی کاتێك کە باس لە میرات بردن دەکرێت، ئەوا پێویستە باس لەمانەی خوارەوە بکرێت:

(١) روکنەکانی میرات بردن.
(٢) مەرجەکانی میرات بردن.
(٣) هۆیەکانی میرات بردن.
(٤) ڕێگرەکانی میرات بردن.

---

١) مغني المحتاج ٣ / ٣، نهاية المحتاج ٦ / ٤، شرح المنهج بحاشية الجمل ٦ / ٥٣.

# روکنەکانی میرات بردن

واتە ئەو پایانەی کە باسی میراتبردنی لەسەر ڕاوەستاوە بریتین لە:

(١) میرات دەر: بریتیە لەو کەسەی کە مردوەو میراتی لیٚ بەجیٚ ماوە.

(٢) میرات بەر: بریتیە لەو کەس و لایەنەی کە بە یەکێك لە هۆیەکانی میراتبردن لە مردوەکە نزیك دەبێتەوە.

(٣) میرات: بریتیە لەو ماڵ و مافانەی کە لە میرات دەرەکە بەجیٚ ماوە.

یەکێك لە زانایان دەفەرموێت:

وارث، مورّث، موروث أرکانها، ما دونها توریث

جا ئەگەر یەکێك لەم ئەرکانانە نەبوو، ئەوا باسەکە باسی میرات نیە، چونکە میرات بردن، بریتیە لە جێگە گرتنەوەی کەسێك یان لایەنێك بۆ کەسێکی تر لە ماڵ و ماف دا، کە واتە دەبێت:

أ. خاوەن ماڵێك هەبوبێت ئێستا مردبێت

ب. کەسێك یان لایەنێك هەبێت جێگەی ئەم مردوە بگرێتەوە، و ببێتە خاوەنی ئەو ماڵ و موڵکانەی کە لێی بەجیٚ ماوە.

ت. ماڵ و موڵکێك هەبێت کە ئەم جێگەگرتنەوەی لەسەر بێتەدی.

# مەرجەکانی میرات بردن

زانایان پێناسەی مەرجیان بەم شێوەیە کردوە: الشرط ما یلزم من عدمه عدم، و لا یلزم من وجوده وجود و لا عدم لذاته، بۆیە دەکرێت ئێمەش لە پێناسەی مەرجەکانی میرات بردن دا بڵێین: مەرجەکانی میرات بردن: بریتین لە کۆمەڵە مەرجێك کە ئەگەر بوونیان نەبێت، ئەوا ئێمە لە بەردەم بابەتی میرات دابەش کردندا نین، وە لە هەمان کاتیشدا ئەگەر بوونیان هەبوو، ئەوا پێویست ناکات بوترێت میرات دابەش کردن هەیە، چونکە: دەکرێت مەرجەکان هاتبنە جێ، بەڵام ڕێگر هەبێت لە دابەش کردنی میراتەکە، وەك لە باسی ڕێگرەکان دا ڕوونی دەکەینەوە.

مەرجەکانی میرات بردن سێ دانەن [١]، وەك یەکێك لە شاعیران لە دێڕە شیعرێکدا کۆی کردونەتەوە، وەك دەفەرموێت:

وهي تحقق وجود الوارث    موت المورث، اقتضاء التوارث

(١) دڵنیایی لە مردنی میرات دەر، یان بڕیاری مردنی لە لایەن دادوەری موسوڵمانانەوە بەسەردا درابێت.

(٢) زیندوویی میرات بەر لە کاتی مردنی میرات دەرەکەدا، با بۆ چاو تروکاندنێکیش بێت، جا بە دڵنیاییەوە بزانرێت کە زیندوە، یان بە زیندوو دابنرێت، وەك: منداڵ لە سکی دایکی دا، کە حیسابی زیندووی بۆ دەکرێت تاوەکو لە دایك دەبێت.

---

١) بڕوانە: حاشية الشرواني على تحفة المحتاج ٦ / ٣٨٦، المغني ٣ / ٥، حاشية الجمل على شرح المنهج ٦ / ٦٠، الكنوز الملية ١٥٤، حاشية الباجوري على شرح الشنشوري على الرحبية ٤٥، الفقه الإسلامي ١٠ / ٧٧٠٧، المفصل ١١ / ٢٤٥، الموسوعة الفقهية / شروط الإرث ٣ / ٢٢.

(٣) بە دوور و درێژی هۆی میرات بردنەکە بزانرێت. واتە بزانرێت کە ئایا هۆی میرات بردنەکە خزمایەتییە، یان ژن و ژنخوازییە، یان سەرپەرشتیارییە. جا ئەم مەرجەیان تایبەتە بە قاضي، واتە نابێت شایەتی ئەو کەسە وەربگرێت کە تەنها دەڵێت: فلان کەس میرات بەری فلان کەسە، و ئیتر باس لەوەوە ناکات کە هۆی میرات بردن لە نێوان ئەو دوو کەسەدا چیە.

بەڵام هەندێك لە زانایان دوو مەرجی تریشیان زیاد کردوە، وەك دەڵێن:

أ. بوونی یەکێك لە هۆیەکانی میرات بردن (خزمایەتی، مارەبڕین، سەرپەرشتیاری) لە نێوان میرات بەرەکە، و میرات دەرەکە.

ب.نەبوونی هیچ کام لە ڕێگرەکانی میرات بردن.

## هۆیەکانی میرات بردن

زانایان لە سیان لە هۆیەکانی میرات بردن دا یەکدەنگن [(١)]، ئەوانیش وەك ئیمامی رەحەبی دەفەرموێت:

أسباب ميراث الورى ثلاثة كلّ يفيد ربّه الوراثة

وهي نكاح، وولاء، ونسب ما بعدهنّ للمواريث سبب

(١) خزمایەتی (القرابة)، وەك: کوڕ، باوك، برا، ... هەتا کۆتایی ئەو کەسانەی کە لەمەولا بە درێژی باسیان دەکەین.

(٢) مارەبڕین (النكاح)، بە مەرجێك کە مارە بڕینێکی درووست، و دامەزراو بێت بە گوێرەی شەریعەتی ئیسلام، بەڵام مەرج نیە کە جیماع ڕووی دابێت لە نێوان پیاو، و ژنەکە دا.

---

١) التحفة ٣٨٧/٦، الفقه الإسلامي ٧٧٠٤، المفصل ٢٤٤/١١، شرح الرحبية ١٦، الكنوز الملية ١٥٤.

(٣) سەرپەرشتیاری ئازاد کەری کۆیلە (الولاء)، بەلاّم لێرەدا ئەم هۆیە تەنها بۆ ئەوەیە کە ئازاد کەرەکە میرات لە ئازاد کراوەکە دەبات، نەك بە پێچەوانەوە.

بەلاّم بەلای مەزهەبی ئیمامی مالیك و ئیمامی شافیعی یەوە [١] هۆیەکی تریشیان داناوە کە بریتیە لە: لایەنی ئیسلامەتی (جهة الإسلام ).

یەك لە شاعیران دەفەرموێت [٢] :

للإرث أسـباب بكـل قـد لـزم — وهو النكاح، والولاء، والرحم
والرابـع الإسلام فـاصرف ما وجـد — كلاّ لـبيت المـال إرثا إن فـقـد
أربـاب أسـباب الـثلاثـة الأول — أو كان غير حائـز فما فـضـل

بەوەی کە ئەگەر مردوویەك کەس نەبوو بە یەك لەو هۆیانەی سەرەوە میراتی لیّ ببات، ئەوا میراتەکەی (هەمووی، یان ئەوەی کە لە میرات بەرەکان دەمێنێتەوە) وەك میرات، بە عەصەبەگەرایەتی دەدرێت بە (بيت المال ئەگەر منتظم بوو بەلای شافعی یەکانەوە) نەك وەك بەرژەوەندی، و خاوەن بەش. بەلاّم لەم کاتەدا نابێت ئەم میراتە بدرێت بە کافر، و کۆیلە، و بکوژی مردوەکە. [٣]

## چەند تێبینییەك:

(١) رێ دەکەوێت کە میرات بەر دوو لەم هۆیانەی تێدابێت، جا لەم کاتەدا دەکرێت بە هەردوو هۆیەکە میرات ببات، وەك ئەوە کە ژنێك بمرێت، تەنها یەك میراتبەری هەبێت، کە مێردەکەیەتی، و لە هەمان کاتدا ئامۆزاشیەتی، ئەوا ئەو

١) الشرواني ٦ / ٣٨٧، الفقه الإسلامي٥ ٧٧٠.
٢) الكنوز الملية / ١٥٥.
٣) التحفة ٦ / ٣٨٨، المغني ٥، النهاية ١٠، حاشية الجمل ٦ / ٦٠.

مێردە نیوەی میراتەکە دەبات وەك خاوەن بەش، و نیوەکەی تریشی دەبات وەك عەصەبە.(١)

(٢) ئەم هۆیانە کاتێك کاریگەریان هەیە، کە مەرجەکانی میرات بردن هاتبنە جێ، و هیچ ڕێگرێکیش نەبێت لە ڕێگرەکانی میرات بردن.

(٣) ئەگەر پیاو و ژنێك بە مارەبڕینێکی نادروست بگەن بە یەك، وەك نیکاحی موتعە، یان نیکاحی پێنجەم ژن، و پاشان منداڵیش لە نێوانیاندا پەیدا ببێت، لەم کاتەدا پیاو و ژنەکە خۆیان میرات لە یەکتر نابەن، چونکە نیکاحەکەیان دروست نەبوە، بەلاّم منداڵەکەیان میراتیان لێ دەبات، و خۆشیان میرات لە منداڵەکە دەبەن، چونکە شەرع دان دەنێت بە نەسەبی ئەو منداڵەدا، ئەگەرچی لە ئەنجامی نیکاحێکی نادروستیش پەیدا بوە.

(٤) زانایانی هەرچوار مەزهەب کۆکن لەسەر ئەوەی کە ژن و مێرد لە ماوەی عیدەی طەلاّقی رەجعی دا میرات لە یەکتر دەبەن، هەروەها کۆکن لەسەر ئەوەش کە ئەگەر مێردەکە لەکاتی لەش ساغیدا ژنەکەی طەلاق دا بە طەلاقی بائینە، ئەوا میرات لەیەکتر نابەن، بەلاّم ئەو ژنەی کە مێردەکەی طەلاقی دەدات بە طەلاقی بائینە لەکاتی نەخۆشی مردندا بۆ ئەوەی کە لە میرات بێبەشی بکات

أ. بەلای مەزهەبی ئیمامی ئەبو حەنیفەوە لە ماوەی عیدەی طەلاقەکەدا میرات لە مێردەکە دەبات، بەلاّم کە ماوەکە بەسەرچوو ئیتر میراتی لێ نابات.

ب. بەلای مەزهەبی ئیمامی مالیکەوە هەر میرات دەبات، باوەکو ماوەکەش بەسەر چووبێت، وە شوویەکی تریشی کردبێت.

ت. بەلای مەزهەبی ئیمامی ئەحمەدیشەوە هەر میرات دەبات، ئەگەرچی ماوەی عیدەکەش بەسەر چووبێت، بەلاّم بەمەرجێك کە شووی نەکردبێتەوە، بەمەش دەردەکەوێت کە زۆرینەی زانایان لەسەر ئەوەن کە ئەو ژنەی کە طەلاق

---

٤) الفقه الإسلامي ٧٧٠٦.

دراوە بە طەلاقی بائینە، لە کاتی نەخۆشی مردندا، میرات لە مێردەکەی دەبات، وەك سزایەك بۆ مێردەکە کە ویستویەتی ژنەکەی لە میرات بێبەش بکات.

ث. بەلای مەزهەبی ئیمامی شافیعیەوە هەر بەوەی کە طەلاقی بائینە کەوتوەتە نێوانیان، ئیتر میرات لەیەکتر نابەن، چونکە طەلاقی بائینە پەیوەندی نێوان ژن و مێرد بە تەواوەتی دەبچڕێت، کەوابوو نابێت میرات لە یەکتر ببەن.[١]

## ڕێگرەکانی میرات بردن

وەك باسمان کرد، میرات بردن سێ مەرج ، و چوار هۆی هەیە "بەلای مەزهەبی ئیمامی شافیعی و ئیمامی مالیکەوە"، کەواتە ئەگەر یەك لەو هۆیانە، یان یەك لەو مەرجانە نەهاتنەدی، یان چەند سیفەتێك هەن، ئەگەر لە کەسێکدا هاتنەدی "باوەکو هۆیەکان، و مەرجەکانیش هاتبنەدی" ئەوا ئەو کەسە بێ بەش، و مەحروم دەبێت لە میرات بردن، جا ئێستا بە درێژی باسی هەر یەك لەو حاڵەتانە دەکەین کە یەك لە ڕێگرەکانی میرات بردنیان تێدایە، و یەکدەنگی زانایانیشی لەسەرە[٢]، کە ئەوانیش وەك ئیمامی رەحەبی دەفەرموێت:

ویمنع الشخص من الميراث     واحدة من علل ثلاث
رق، وقتل، واختلاف دين     فافهم، فليس الشك كاليقين

---

١) الفقه الإسلامي ٧٧٠٥، الشنشوری، مع الباجوري ٤٨، الدرّة البهية ١٦–١٧، المفصل ١١/ ٢٧٠–٢٧١.

٢) الفقه الإسلامي ٧٧١٠، شرح مسلم للنووي ١١ / ٥٢، و عون المعبود ٨ / ٨٥ – ٨٦، الموسوعة / موانع الإرث ٣ / ٢٢.

## حاڵەتی یەکەم: جیاوازی ئاین (إختلاف الدین)

زۆرینەی زانایانی هاوەڵانی حەزرەت، وەك ئەبو بەکر و عومەر و عوثمان و عەلی زەید و ئوسامەی کوڕی زەید و جابری کوڕی عەبدوڵا، و زانایانی هەر چوار مەذهەب لەسەر ئەوە یەکدەنگن کە: موسوڵمان میرات لە کافر نابات، و کافریش میرات لە موسوڵمان نابات [١] بەبەڵگەی ئەوەی کە حەزرەت فەرموویەتی: لایرث المسلم الکافر ولا الکافر المسلم. لایتوارث أهل ملتین شتی.

بەلام ئایا کافر لە نێوان خۆیاندا میرات لە یەکتر دەبەن یان نا؟ لێرەدا زانایان ڕای جیاوازیان هەیە: جمهوری زانایان (شافعی و حنفی و حنبلی)یەکان پێیان وایە کە: کافر میرات لە کافر دەبات، باوەکو شەریعەتەکەشیان جیاواز بێت، وەك: جولەکە، و گاور [٢]، چونکە خودای گەورە دەفەرموێت:

﴿ فَمَاذَا بَعْدَ ٱلْحَقِّ إِلَّا ٱلضَّلَٰلُ ﴿٣٢﴾ ﴾ یونس. وە حەزرەتی پێغەمبەریش دەفەرموێت: الکفر ملّة واحدة [٣].

بەلام ئەم بۆچونەی جمهور ڕەها نیە، کە بوترێت هەموو کافرێك میرات لە هەموو کافرێك دەبات، بەڵکو لە مەسئەلەی کافری (ذمي و حربي) دا، ئایا میرات لە یەکتر دەبەن، یان نا؟ ڕایان جیاوازە:

لە ناو هاوەڵانی حەزرەت دا: حەزرەتی عومەر و عەلی و زەید، و لە زانایانیش دا ئیمامی مالیك و ثوری و ئەبوحەنیفە، و ڕای مەشهوری مەزهەبی

---

١) الفقه الإسلامي ٧٧١٩، اللمع المغیث ٢٧–٢٨، الموسوعة/ موانع الإرث ٢٢/٣، الکنوز الملیة ٣٢١.

٢) الفقه الإسلامي٧٧٢٠، المغني ٢٥، النهایة ٢٨، الاستذکار / ٥ / ٣٧.

٣) الموطأ ٧٢٧ روایة محمد بن الحسن.

شافیعیش: پێیان وایە کە (ذمي و حربي) میرات لە یەکتر نابەن [١]. شێخی نۆدی لەم بارەیەوە دەفەرمویت:

الكافران يتــوارثـانِ ولو على تخالف الأديـانِ
لا مسلمٌ وكافرٌ شقيٌّ ولا سوى الحربيِّ والحربيُّ

## میراتی لە ئاینی ئیسلام هەڵگەڕاوە (المرتدّ )

مرتد: بە کەسێك دەوترێت کە بە ویست و ئارەزووی خۆی، و بەبێ زۆرلێکردن لە ئاینی ئیسلام هەڵگەڕابێتەوە، ئیتر گرنگ نیە ئایا چوەتە سەر ئاینێکی تر یان نا.

زانایان یەکدەنگن [٢] لەوەدا کە ئەم کەسە (نێر بێت یان مێ) میرات لە کەس نابات، نە لە موسوڵمان، و نە لە کافر، ئەگەرچی لە دوای مردنی میرات دەرەکە پەشیمانیش ببێتەوە، و بگەڕێتەوە سەر ئاینی ئیسلام (بەلاّم حەنبەلیەکان وتوویانە تەنها لەم حاڵەتەدا نەبێت).

بەلاّم لەوەدا کە ئایا کەس میرات لە مرتد دەبات، یان نا؟ ڕای جیاوازیان هەیە:

جمهوری زانایان (شافعی و مالکی و حنبلی)یەکان پێیان وایە کە وەك چۆن میرات لە کەس نابات، هەروا کەسیش میراتی لێ نابات،

جا لێرەدا دەکرێت کە باسی (زندیق ) واتە: بێ دین، بکەین کە لە هیچ ئاینێکدا جێگەی نابێتەوە، و وا خۆی دەخاتە ڕوو کە موسوڵمانە، بەلاّم لە دڵدا بێ بڕوایە. و جیاوازیشی لەگەڵ (منافق ) دا ئەوەیە کە (زندیق ) بە ئاشکرا

---

٤) المجموع ١٧ / ٥٦، الفقه الإسلامي ٧٧١٢.

١) الفقه الإسلامي٧٧٢٠–٧٧٢١، اللمع ٢٨، الموسوعة/ إرث المرتد ٢٥/٣، عون المعبود ٨ / ٨٦.

هەوڵی ڕوخاندنی ئیسلام، و ئاژاوە نانەوە، و گومان درووست کردن دەدات لە ناو موسوڵماناندا، ئەمیش "وەك هەڵگەڕاوە مامەڵەی لەگەڵدا دەکرێت" نە میرات دەبات، و نە میراتی لێ دەبرێت.[1]

**تێبینی**

(١)ئەگەر دوو برا بەجارێك لە ئاینی ئیسلام هەڵگەڕانەوە، ئەوا کەسیان میرات لەوی تریان نابەن.

(٢)کافرێك کە میرات بەری نەبێت، و (مرتد و زندیق ) یش ئەگەر مردن ئەوا میراتەکەیان دەدرێت بە (بیت المال ) وەك (فيء ) — نەك وەك (إرث ).[2]

## حاڵەتی دوەم: کۆیلایەتی ( رقّ )

واتە هەر کەسێك کە کۆیلە بێت ئیتر هەر ناوێکی هەبێت، نە میرات دەبات، و نە میراتی لێ دەبرێت، بەڵام لە فەرموودەی نوێی ئیمامی (شافعي ) دا هاتوە کە: ئەگەر ئەو کۆیلەیە (مبعّض ) بوو، واتە بەشێکی کۆیلە بوو، و بەشەکەی تری ئازاد، ئەوا ئەو ماڵەی کە بە بەشە ئازادەکەی پەیدای کردوە وەك میرات دەمێنێتەوە بۆ میرات بەرەکانی[3].

## حاڵەتی سێیەم: کوشتن ( قتل )

زۆرینەی زانایان چی لە هاوەڵانی حەزرەت، و چی لە شوێنکەوتوان، و زانایانی هەر چوار مەزهەبەکە یەك دەنگن لەوەدا کە ئەگەر کەسێك کەسێکی تر بکوژێت، ئەوا بکوژەکە میرات لە کوژراوەکە نابات، بەبەڵگەی ئەوەی کە

---

٢) المغني ٢٥، النهاية ٢٧، حاشية القليوبي على شرح المحلي ١٤٨.

١) المغني ٢٥، النهاية ٢٨، المجموع ٥٧، الفقه الإسلامي ٧٧٢١.

٢) الفقه المنهجي ٢ / ٢٧٨.

حەزرەت فەرموویەتی: القاتل لا یرث. لا یرث القاتل شیئا. واتە ئەو کەسەی کە کەسێکی کەشتوە میراتی لیّ نابات.

بەلاّم لەوەدا کە ئایا جۆری کوشتنەکە دەبێت چۆن بێت؟، و بکوژەکە تەمەنی چەند بێت؟ ڕای جیاوازیان هەیە:

زانایانی مەزهەبی ئیمامی شافیعی فەرموویانە: کوشتنەکە بە هەر جۆرێك بێت (عمد، شبه عمد، خطأ )، و بە هەق بێت یان بە ناهەق، و بە زۆر لیّ کردن بێت یان بە ویستی خۆی، و ڕاستەوخۆ بێت یان بە هۆیەکی دەرەکی، وەك ئەوەی کە شاهیدی لەسەر بدات، و بەو شاهیدیە بیکوژن، بۆ بەرژەوەندی بێت وەك باوك، و مێرد، و مامۆستا یان نا — واتە کوشتنەکە بەهەر شێوەیەك بێت، وە بکوژەکە منداڵ بێت یان گەورە، بکوژەکە لە میرات مەحرووم دەکات. [1] وەك یەك لە شاعیران دەفەرموێت [2]:

ومن قتل المورث فامنعه إرثه — على خطأ أرداه، أو بالتعمد
مباشرة، أو بالتسبب إن يجب — قصاص، أو تكفير، أو دية قد
وسيّان ذو التكليف فيه، وغيرُه — وذو شركة، أو قاتل بمنفرد

بەلاّم مفتی "واتە: ئەو کەسەی کە پرسیاری بڕیاری شەرعی لیّ دەکەن دەربارەی خزمێکی خۆی کە تاوانێکی کردوە، و ئەویش فەتوا دەدات کە دەبێت بکوژرێت" میرات دەبات لە کوژراوەکە، لەگەڵ ئەوەشدا کە بە فەتوای ئەو کەسەکە کوژراوە، چونکە فەتوا هێزی ئیلزامی نیە، بەڵکو دەکرێت کە بە پێچەوانەی ئەو فەتواوە ڕەفتار بکرێت. [3]

---

١) الفقه الإسلامي ٧٧١٧، المجموع٥٩، الشنشوري ٥٤، المغني ٢٦، النهاية ٢٨، الأنوار ٢ / ٤، فيض القدير شرح جامع الصغير ٥ / ٣٧٧، ٣٨٠.
٢) الكنوز الملية / ٣٥٣.
٣) القليوبي ١٤٩، الجمل ٦ / ٩٤، الشنشوري ٥٤.

**ئاگاداری**

(١) هەر كەسێك كە پاراستنی شتێكی لە ئەستۆدا بێت وەك: ولاغێك لێ بخورێ، یان ڕای بكێشێ، ئەوە ئەگەر بەهۆی ئەو ولاغە كەسێك بكوژێ میراتی لێ ناگرێ. ئەوەش وا دەگەیەنێ: ئەگەر شۆفێری ئۆتۆمبیلێك بە ئۆتۆمبیلەكەی خزمێكی خۆی بكوژێ، یان لەكاتی لێخوڕینی ئۆتۆمبیلەكەی وەربگەڕێ، و خزمەكانی ناو ئۆتۆمبیلەكەی بمرن، ئەوە میرات لەو خزمە مردوانە ناگرێ هەرچەندە كەمتەرخەمیشی نەكردبێ، یان بە خۆیشی بەم ڕوداوە بمرێ (لەپاش خزمەكانی، با بە چاو تروكاندنێكیش بێت )، جیاوازی نیە ئۆتۆمبیلەكە موڵكی خۆی بێ، یان نا، چونكە ئەو بوەتە هۆی كوشتن، و پێویستیش ناكات بوترێت خۆ زامین نیە ئیتر بۆچی مەحروم دەبێت، چونكە زامین بوون مەرج نیە.

(٢) ڕێ دەكەوێت كە كوژراوەكە میرات لە بكوژەكەی خۆی دەبات، وەك ئەوەی كە كەسێك خزمێكی خۆی، یان پیاوێك ژنەكەی خۆی بە چەقۆیەك بریندار بكات، پاشان خۆی بمرێت، و بریندارەكە هەر زیندوو بێت، بەڵام پاش ماوەیەكی تر بریندارەكە بەو برینە مرد، ئەوا ئەم بریندارە بە كوژراوی دەستی بكوژەكە دادەنرێت، و لە هەمان كاتدا میرات لە بكوژەكە دەبات، چونكە مردنەكەی كەوتوەتە پاش مردنی بكوژەكەیەوە.[1]

تا ئێرە باسی ئەو سیفەتانە بوو كە بوونیان لە هەر كەسێكدا دەبێتە هۆی مەحرووم بوونی لە میرات، وە زانایانیش تیایاندا یەك دەنگ بوون، وە لەمەولا باسی چەند حاڵەتێك دەكەین كە یان هۆیەك، یان یەك لە مەرجەكانی میرات بردن نەهاتوەتە دی بۆیە كەسەكە لە میرات مەحرووم دەبێت، وە هەر یەك لەم حاڵەتانەش بەلای هەندێك لە زانایانەوە بە ڕێگری میرات بردن دادەنرێت. حاڵەتەكانیش ئەمانەن:

---

١) المغني ٢٦، النهاية ٢٩، شرح الرحبية ٢٤، شرح المنهج ٦ / ٩٧.

## یەکەم: بوونی گومان لە کاتی مردن، یان نەزانینی مێژووی مردن

ئەگەر دوو کەس یان زیاتر کە میرات بەری یەکتر بوون لە ڕووداوێکدا مردن وەك ئەوەی کە لە پاپۆڕێکدابن و ژێر ئاو بکەوێت، یان لە سەیارەیەکدا بن وەربگەڕێت، یان لە تەیارەیەك بەربنەوە، یان بە تەقینەوە تیابچن، یان بە ئاگر بسوتێن، یان بە غاز بخنکێن، یان کارەبا بیانگرێت، یان لە بوومەلەرزەدا بن بەژێر خانوەوە، یان لە شەڕێکدا بەیەکەوە تیابچن، یان دەرمانخوارد بکرێن و بمرن، یان لە شوێنێکی دوورە ولاَت و غەریبایەتیدا بفەوتێن، ئەوا ئەگەری پێنج حاڵەت هەیە:

(١) دەزانرێت کامیان لەپێشدا مردوە. لەم حاڵەتەدا بە کۆدەنگی زانایان: ئەوەیان کە دواتر مردوە میرات لە وەی پێشتر دەبات.

(٢) دەزانرێت کە هەردووکیان لە یەك کاتدا مردون. لەم حاڵەتەشدا بە کۆدەنگی زانایان: هیچکامیان میرات لەویتر نابات.

(٣) زانیاری دەربارەی کاتی مردنەکە نیە.

(٤) زانراوە کامیان لە پێش کامیان مردوە، بەلاَم لە بیر نەماوە.

(٥) زانراوە کە یەکێکیان لە پێش ئەویتر مردوە، بەلاَم نازانرێت کامیانە.

جا لەم سێ حاڵەتەدا بەلای جمهوری زانایان (شافعی و حنفی و مالکی)یەکانەوە: کەسیان میرات لەوی تریان نابات، بەڵکو میراتی هەردووکیان دەدرێت بە میرات بەرەکانی تریان کە ماون [١].

ئیمامی رەحەبی لەم بارەیەوە دەفەرموێت:

وإن يمت قوم بهدم أو غـــرق     أو حادث عـم الجميع كالحـرق

---

١) الفقه الإسلامي ٧٩٠٣، اللمع ٢٠٨، الكنوز ٣١٥، المبسوط ٧ / ٥٨٣، الموسوعة / ميراث الغرقى و الحرقى و الهدمى ٣ / ٧٠، مغني ابن قدامة٧ / ١٩٢، النهاية ٢٩، المغني ٢٦، المجموع ٧١.

ولم يكن يعلم حال السابق فلا تورث زاهقا من زاهق
وعدهم كأنهم أجانب فهكذا القول السديد الصائب

ئەگێڕنەوە کە حەزرەتی ئەبوبەکر زەیدی کوڕی ثابتی نارد بۆ دابەش کردنی میراتی ئەوانەی کە لە (یەمامە) دا شەهید کران، ئەویش وەهای بڕیاردا کە کەسیان میرات لەوی تر نابات. هەروەها کاتێك کە حەزرەتی عومەر زەیدی کوڕی ثابتی نارد بۆ دابەش کردنی میراتی ئەوانەی کە لە طاعونی (عەمواس)دا وەفاتیان کرد، بە هەمان شێوە بڕیاری دا، وە بە هەمان شێوە بڕیاری دا بۆ ئەوانەی کە لە جەنگی (حرە) دا شەهید کران، هەروەها ئەگێڕنەوە کە حەزرەتی عەلی هەر بەم شێوە بڕیاری داوە بۆ ئەو کەسانەی کە لە (جەمەل و صەفین) دا کوژران، وە عومەری کوڕی عەبدولعەزیزیش هەر بە هەمان شێوە بڕیاری داوە [١] بۆیە زۆرینەی زانایانیش هەر ئەم بۆچوونەیان پێ پەسەندە.

جا لێرەدا بۆیە میرات لە یەکتر نابەن چونکە ئەو مەرجی میرات بردنە نەهاتوەتە دی کە دەبێت لە کاتی مردنی میرات دەرەکەدا بە دڵنیاییەوە بزانرێت کە میرات بەرەکە زیندوە با بۆ ماوەی چاوتروکاندنێکیش بێت، وەك لە مەرجی دوەمدا باسمان کرد.

---

١) باب ميراث الغرقى / الدارمي، سعيد ابن منصور، ابن أبي شيبة، شعب الإيمان، عبد الرزاق.

## دووەم: نەبوونی نەژادی شەرعی، بەلای هەندێك لە شافیعیەکان و مالیکیەکانەوە

واتە ئەگەر شەرع دان نەنێت بە بوونی نەسەب لە نێوان دوو کەسدا ئەوا میرات لە یەکتر نابەن. وەك ئەو منداڵەی کە بە هۆی (لعان ) ەوە — کە بابەتێکی دیاریکراوی شەرعە — حاشای لێ دەکرێت لە لایەن مێردی دایکیەوە، ئەوا نە منداڵەکە، و نە خزمەکانی مێردەکەی دایکی میرات لە یەکتر نابەن، یان منداڵی باوك نادیار (واتە: زۆڵ، بیژی ) کە لە ئەنجامی زیناکردنەوە پەیدا بوە، نە ئەم منداڵە لە زینا کەرەکە، و لە خزمەکانی میرات دەبات، و نە زینا کەرەکە، و خزمەکانیشی میرات لەم منداڵە دەبەن، بەلاّم منداڵەکە لە هەردوو حاڵەتەکەدا (لعان، زنا ) میرات لە دایکی، و لە خزمانی دایکی دەبات، و ئەمانیش لە ئەو میرات دەبەن، چونکە دیارە کە ئەم منداڵە نیسبەتی بە دایکیەوە هەیە. وەك شێخی نۆدی دەفەرموێت:

وولد الزنا عن الإرث حرم إلاّ من الأم ومن ولد الأم

جا لێرەدا بۆیە میرات نابرێت چونکە یەك لە هۆیەکانی میرات بردن، نەهاتوەتە دی کە ئەویش: بوونی خزمایەتی و نەسەبە لە نێوان مردوەکە، و میرات بەرەکە، وەك لە هۆی یەکەمدا باسمان کرد.

## سێیەم: خولانەوەی بڕیاری شەرعی (الدور الحکمی ) بەلای مەزهەبی شافیعیەوە

بریتیە لەوەی کە میرات دان بە کەسێك ببێت بە هۆی میرات پێ نەدانی. بۆ نمونە: ئەگەر برای مردویەك — کە تەنها ئەو میرات بەری بێت -- دانی نا (ئیقرار بە نەسەب ) بەوەدا کە ئەو منداڵە کوڕی برا مردوەکەیەتی، ئەوا نەسەبەکە جێگیر دەبێت، و دەبێتە برازای، بەلاّم ئەو برازایە نابێت میرات ببات

لە براکەی، چونکە ئەگەر منداڵەکە میرات ببات لە مردوەکە ئەوا برای مردوەکە حەجب دەبێت و میرات نابات، جا لەبەر ئەوەی بە میرات بردنی منداڵەکە مامەی (کە برای مردوەکەیە ) بێ بەش دەبێت لە میراتەکە، کەواتە منداڵەکەش نەسەبی جێگیر نابێت، چونکە یەك لە مەرجەکانی کاریگەری و تەئسیری دانپیانان (ئیقرار بە نەسەب ) ئەوەیە کە دەبێت ئەو کەسەی کە ئیقرارەکە دەکات دەبێت میراتبەر بێت، دەی مادام نەسەبی منداڵەکە جێگیر نەبوو کەواتە میرات نابات، دەرئەنجام ئەوەیە کە: مادام منداڵەکە میرات ببات، کەواتە دەبێت میرات نەبات، خۆ ئەمەش مەحاڵە و ناگونجێت.[١]

شێخی نۆدیش دەفەرموێت:

إذا أخو ميت أقرّ بنسب فذاك مانع من إرث النشب

## حاڵەتێکی تایبەت: پێغەمبەرایەتی.

بە لای هەندێك لە شافیعیەکان و حەنەفیەکانەوە.

پێغەمبەرانیش پاش کۆچی دوایی کردنیان میراتیان لێ نابرێت، چونکە پێغەمبەری خۆشەویست (دروودی خوای لێ بێت) دەفەرموێت: ئێمەی پێغەمبەران میراتمان لێ نابرێت.[٢]

شێخی نۆدی لەم بارەیەوە دەفەرموێت:

وكون من مات نبيا مانع للإرث والحديث فيه شائع

١) المغني ٢٦، ٧٧١٣، شرح المنهج ٦ / ٩٧، الدرة البهية ٢٦.

١) متفق عليه / بخاري و مسلم: باب قول النبي صلى الله عليه وسلم: لا نورث ما تركنا صدقة.

جا باس کردنی ئەم حاڵەتە تەنها لەبەر زانینە، و بۆ کاتی هاتنە خوارەوەی حەزرەتی (عیسا ) یە. [١]

بەلاّم ئەم حاڵەتە بە ڕێگری میرات دانانرێت، چونکە ڕێگری میرات بریتیە لە مانایەك کە لە میرات بەرەکەدا هەیە، و ڕێگەی میرات بردنی لیّ دەگرێت، بەلاّم لێرەدا لەبەر مانای پێغەمبەرایەتیەکەیە، کە سیفەتی میرات دەرەکەیە، نەك میرات بەرەکە. [٢]

کەواتە بەشێوەیەکی گشتی دەکرێت خەڵکی بە گوێرەی بردن و نەبردنی میرات بکەین بە چوار بەشەوە [٣]:

(١)میرات دەبات، و میراتیشی لیّ دەبرێت، وەك ئەو کەسانەی کە لەمەولا بە درێژی باسیان دەکەین

(٢)میرات دەبات، بەلاّم میراتی لیّ نابرێت، وەك پێغەمبەران (درودی خوایان لیّ بێت).

(٣)میرات نابات، بەلاّم میراتی لیّ دەبرێت، وەك کۆیلەی (مبعّض )، کە ئەو ماڵەی کە بە بەشە ئازادەکەی پەیدای کردوە دەبێت بە میرات بۆ میرات بەرەکانی.

(٤)میرات نابات، و میراتیشی لیّ نابرێت، وەك: لە ئاین هەڵگەڕاوە، و کۆیلە — جگە لە (مبعّض ).

---

٢) النهاية ٢٩، ابن آدم ٩٣.

٣) الباجوري على الشنشوري ٥٢، الفقه الإسلامي ٧٧١١.

٤) إعانة الطالبين ٢٢٣/٣، المغني ٢١/٣، ابن آدم ٩٢.

# ئەو مافانەی کە پەیوەستن بە میراتەوە

(میرات ) بریتیە لەوەی کە لەپاش مردنی کەسێك بەجێ دەمێنێت، جا چی ماڵ و موڵك بێت بە هەموو جۆرەکانیەوە (نەختینە، و ماڵی گواستراوە، و زەوی و زار، و خانوو و دووکان)، یان ماف بێت وەك مافی دەست بەسەردا گرتنی ماڵی فرۆشراو هەتاوەکو نرخەکەی وەردەگیرێت، یان (إختصاصات) بێت، وەك: زبڵ، و سەگی پاسەوانی، و سەگی ڕاوکردن، هەروەها خوێنێکیش کە وەردەگیرێت لە بکوژەکەی، واتە ئەگەر کەسێك کەسێکی کوشت، ئەوا هەرچەندە لە دوای مردنی کابرای کوژراو خوێن وەردەگیرێت، بەڵام ئەو خوێنە هەر لە حوکمی ئەوەدایە کە ماڵی کوژراوەکە خۆی بێت لە پێش کوژرانەکەی، و ئێستا لە پاش مردنی بوە بە میرات، و دەبێت دابەش بکرێت بەسەر میرات بەرەکاندا، هەر کەسەو بە گوێرەی بەشی خۆی بەشی بدرێت.

جا میرات هەر جۆرێك بێت، ئەوا دەکرێت لە پاش مردنی میرات دەرەکە پێنج مافی پێوە پەیوەست ببێت، کە ڕیزبەندی جێ بەجێ کردنی ئەم مافانەش بەم شێوە دەبێت یەك لە دوای یەك:

(١) ئەو مافانەی کە پەیوەستن بە خودی میراتەکەوە، بە بێ دانانی (حجر) لە لایەن قاضی یەوە، واتە مردوەکە لە کاتی ژیانیدا بەهۆی بێ پارەییەوە (إفلاس) تەصەڕوف کردنی لەماڵی خۆیدا لێ قەدەغە نەکرابێت.

(٢) مافی بەڕێ کردنی تەرمی خۆی، و ئەو مردوانەش کە نەفەقەیان لەسەر ئەو بوە، و لەپێش گیان دەرچوونی ئەمدا گیانیان دەرچوە.

(٣) ئەو قەرزانەی کە لە ئەستۆی مردوەکەدان، جا قەرزی خودایی بن، یان قەرزی ئادەمیزادی.

(٤) ئەو وەصیەتانەی کە کردوونی، بەمەرجێك کە لە سێ یەکی میراتیەکەی زیاتر نەبن.

(٥) مافی میراتبەرەکان، هەرکەسەو بەگوێرەی ئەوەی کە بۆی دانراوە.

جا بەم پێیە هەر کەسێك بمرێت، و میراتی لێ بەجێ بهێنێت، ئەوا بەر لە هەموو شتێك، و لە پێش ئەوەی کە بەرێ بخرێت بۆ گۆڕستان، دەست دەکرێت بە:

**یەکەم:**

جێ بەجێ کردنی ئەو مافانەی کە بەسراو و پەیوەستن بە خودی میراتەکەوە، بەبێ دانانی (حجر) لە لایەن قاضی یەوە، جا ئەم مافانەش زۆرن بەڵام لێرەدا تەنها باس لە شەش دانەیان دەکەین، کە ئەوانیش:

(١) مافی نیشتەجێ کردنی ئەو ژنەی کە عیدەی وەفاتی لەسەرە. لەم کاتەدا کرێی جێگای نیشتەجێ بوون، و ئیسراحەت، و شەو مانەوەی ئەو ژنە تا ماوەی عیدەکەی تەواو دەبێت دەخرێتە پێش تێچوونی بەرێ کردنی مردوەکە خۆی، و هەموو ئەو کەسانەی کە نەفەقەیان لەسەر ئەمە، و بەر لە ئەم مردوون.

(٢) مافی ئەو کەسەی کە بەقازانج بە شەراکەت کار دەکات. بۆ نمونە: ئەگەر خاوەن ماڵێك پارەی دا بە کەسێك کە کاسپی پێوە بکات بە قازانج بە شەراکەت، پاشان خاوەن ماڵەکە هەموو سەرمایەکە، و قازانجەکەی وەرگرت، و مرد، و تەنها ئەوەی وەك میرات لەپاش بەجێ ما، ئەوا پێویستە لە پێش هەموو شتێك بەشە قازانجی کرێکارەکەی لێ دەربکرێت، ئەوجا لێی سەرف دەکرێت بۆ بەرێ کردنی مردوەکە.[1]

---

١) المغني ٤، حاشية البجيرمي على شرح المنهج ٣ / ٢٤٥.

(٣) مافی خاوەن قەرز لە ماڵی قەرز کراودا. واتە ئەگەر کەسێك ماڵێك قەرز بکات، و پاشان بمرێت، و تەنها ئەو ماڵە قەرز کراوەی لە پاش بەجێ بێنێت، ئەوا ئەو ماڵە دەدرێتەوە بە خاوەنەکەی، و سەرف ناکرێت لە بەرێ کردنی مردوەکەدا.

(٤) ماڵێك کە فرۆشرابێت بە قەرز، و کڕیارەکەش بە نەبوویی (مفلس) مردبێت، پارەکەشی نەدابێت، لەم کاتەدا رێگە دەدرێت بە خاوەن ماڵەکە (فرۆشیارەکە ) کە ماڵە فرۆشراوەکەی خۆی داوا بکاتەوە، و وەری بگرێتەوە، پێش ئەوەی کە مردوەکە هیچ سەرفێکی بۆ بکرێت بۆ بەرێ کردنی بۆ گۆڕستان. بەڵام ئەگەر کڕیارەکە هەبوو بوو واتە مفلس نەبوو، ئەوا فرۆشیارەکە بۆی نیە مامەڵەکە هەڵوەشێنێتەوە، و داوای خودی ماڵە فرۆشراوەکەی خۆی بکاتەوە، بەڵکو لە میراتی مردوەکە پارەکەی پێ دەدرێت، و بە قەرزێك دادەنرێت کە لە ئەستۆی مردوەکەدایە نەك پەوەست بێت بە خودی میراتیەکەوە، و بەمەش لە پلەی ڕیز بەندیەکەدا دەکەوێتە سێ هەم پلەوە، وەك لەمەولا باسی دەکەین.

(٥) مافی ئەو کەسەی کە ماڵێکی لێ نەزر کراوە لە عەینی ماڵە نەزر کراوەکەدا. واتە ئەگەر کەسێك ماڵێکی نەزر کرد لە کەسێکی تر، جا کابرای نەزر کەر مرد، ئەوا پێویستە ئەو ماڵەی کە نەزر کراوە بدرێت بەو کەسەی کە لێی نەزر کراوە، و سەرف نەکرێت لە بەرێ کردنی مردوەکەدا.[1]

(٦) ئەو زەکاتەی کە لە پێش مردنی خاوەن ماڵێکدا لە خودی ماڵی ئەو کەسەدا واجب بوو بێت، و زەکاتەکەشی نەدابێت، وەك زەکاتی ئاژەڵەکانی نەدابێت، و زەکاتی دانەوێڵەکەی نەدابێت، ئەوەش واجبە پێش بەرێ کردنی

٢) البجيرمي ٣ / ٢٤٥.

مردوەکە زەکاتەکە بدرێت. [١]

بەلاٚم هەر مافێك کە بەسرابێت بە خودی میراتەکەوە بەهۆی ئەوەی کە قاضی حجری لەسەر ئەو ماڵە دانابێت لەبەر بەرژەوەندی بژاردنی قەرزی خاوەن قەرزەکان، ئەوا ئەم مافە دەکەوێتە پاش بەرێ کردنی مردوەکە بۆ گۆڕستان.

ئەوەی کە پێویستە لێرەدا باس بکرێت ئەوەیە کە دانەوەی ئەو مافانەی کە بەسراون بە خودی میراتەکەوە بەو مەرجە دەخرێنە پێش بەرێ خستنی مردوەکەوە کە ترسی گۆڕانی مردوەکە، و بۆگەن کردنیمان نەبێت، ئەگینا پێویستە لە پێشدا لاشەی مردوەکە بەرێ بکرێت، و بشارێتەوە، ئەوجا مافەکان بدرێنەوە. [٢]

جا ئەگەر ئەم جۆرە مافانە نەبوون، یان هەبوون، و جێ بەجێ کران، ئیتر نۆرەی جێ بەجێ کردنی مافی دوای ئەوە کە بریتیە لە:

**دوەم:**

خەرجی بەرێ کردن، و شاردنەوەی تەرمی مردوەکە، و تەرمی هەموو ئەو مردوانەی کە لە پێش ئەم [٣] یان لەگەڵ ئەمدا [٤] گیانیان لە دەست داوە و لە کاتی زیندوویاندا نەفەقەیان لەسەر ئەم بوە، وەك: ژن، باوك، دایك، منداڵ. واتە هەرچی خەرجیەك کە بکرێت لە هەڵگرتنی تەرمەکانەوە بۆ گۆڕستان، هەتا کفن کردنیان، و دەرمانی بۆن خۆش پێوە کردنیان، و هەتا کرێی گۆڕ هەڵکەن، و

١) شرح المنهج ٦ / ٥٥.
٢) شەریعەتی ئیسلام ٣ / ٣٧
٣) القليوبي ١٣٥خلافا لشيخنا فى المعية، شرح الارشاد ٢/٤٠٩، الشروانى ٦ / ٣٨٣ خلافا للبجيرمي ٣ /٢٤٦ و الجمل ٦ / ٥٦.
٤) النهاية ٤٦١، المغني ٣٣٨/١، القليوبي ٣٢٩، البجيرمي ٢٤٦، الإعانة ١١٤/٢

هەموو مەسروفێك كە پەیوەندی بە شاردنەوەیانەوە هەبێت، وە دەبێت ئەم مافە بە جۆرێك جێ بەجێ بكرێت كە شیاوی شان و ناوی مردوەكە بێت لە ڕووی دەوڵەمەندی، و گەدایی، و پلە و پایەی كۆمەڵایەتی، هەرچەندە خۆشی لە كاتێكدا كە زیندوو بوە بەو جۆرە نەژیابێت.

وە سەبارەت بەوەی كە ئەگەر چەند كەسێك لەوانەی كە نەفەقەیان لەسەر مردوەكەیە، و بەكاتێكی زۆر كەم لە پێش مردوەكەوە گیانیان لەدەست دابێت، ئایا كامیان لە پێشدا لە میراتی مردوەكە خەرجی بەڕێ خستنی گۆڕستانیان بۆ دەكرێت؟، لە نێوان زانایاندا بۆچوونی جیاواز هەیە كە هەندێكیان پێیان وایە كە ئەوەیان كە زووتر لەوانەیە بۆگەن بكات دەخرێتە پێش ئەوانی ترەوە. وە هەندێكی تر پێیان وایە كە باوك دەخرێتە پێش كوڕ، و هەندێكی تر بە پێچەوانەوە، و هەندێكی تر دەفەرموون: ڕیز بەندیەكەیان بەم شێوەیە: ئەو مردوەی كە ترسی گۆڕان، و بۆن كردنی هەیە لە پێشەوەیە، پاش ئەو ژن، پاشان منداڵی بچووك، پاشان باوك، پاشان دایك، پاشان كامیان زیاتر نزیكن لە مردوەكەوە. بەڵام یەكدەنگن لەوەدا كە ئەگەر مردوەكە لە ژنێك زیاتری هەبێت جیاوازیان نیە، بەڵكو تیر و پشكیان لە نێواندا دەكرێت.(١)

جا لێرەدا كە باس لە خەرجی بەڕێ كردنی تەرمی ژنی مردوەكە دەكەین كە پێویستە لە میراتی مێردە مردوەكەی جێبەجێ بكرێت، نەك لە میراتی ژنەكە خۆی، ئەویش بە چەند مەرجێكە:

(أ) لەكاتی مردنی ژنەكەدا مێردەكەی زیندوو بێت.

(ب) ژنەكە تەسلیم بە مێردەكەی كرابێت.

---

١) النهایة ٦، البجیرمي ٣ / ٢٤٦، الجمل ٦ / ٥٦، الشرواني٣٨٣-٣٨٤، شرح الارشاد٢/٤٠٩

(ت) ژنەکە (ناشزة ) نەبێت.

(پ) ژنەکە بە طلاق ی بائنە طلاق نەدرابێت.

ئەوجا کە ئەم مافەش جێ بەجێ کرا، هەم تەرمی مردوەکە، و هەم تەرمی ئەوانەی کە نەفەقەیان لەسەر مردوەکەیە بەڕێ کران بۆ گۆڕستان، ئیتر دەست دەکرێت بە جێ بەجێ کردنی مافی دوای ئەو کە بریتیە لە:

## سێ یەم:

دانەوەی ئەو قەرزانەی کە لە ئەستۆی مردوەکەدان، جا وەسێتی کردبێت، یان نا، و قەرزەکان قەرزی خودایی بن، یان قەرزی ئادەمیزادی.

بەڵام لێرەدا قەرزە خوداییەکان وەك: زەکاتێك کە قەرز بێت لە ئەستۆی مردوەکەدا بەهۆی ئەوەی کە لەکاتی خۆیدا نەیدابوو، و زەکاتی سەرفیترە (زکاة الفطر )، و کەفارەتی پیاو کوشتن، یان کەفارەتی (ظهار )، یان کەفارەتی درووست بوون لەگەڵ ژندا (جماع ) لە ڕۆژی ڕەمەزاندا، یان کەفارەتی سوێندی کەوتوو، و بەدەلی حەجی فەرز، ئەمانە هەموویان پێش دەخرێن بەسەر قەرزی ئادەمیزاددا[1] ، بەڵام بۆ پاش و پێش خستنی قەرزە خوداییەکان میراتبەر بە ئارەزووی خۆیەتی کە کامیان پێش دەخات بەسەر کامیاندا. [2]

ئینجا بزانە پاش ئەم قەرزانە دەست دەکرێت بە دانەوەی ئەو قەرزە ئادەمیانەی کە بە سەریەوەیەتی، و ئەو قەرزەی کە لەسەر مردوەکەیە کەم بێت، یان زۆر پەیوەستە بە میراتەکەوە، واتە: میراتەکە دەبێت بە بارمتەیەکی شەرعی بۆ گشت قەرزەکانی مردوەکە، کەوابوو تا بەشێکی قەرزەکە لەسەر مردوەکە

---

١) التحفة ٣٨٤، المغني ٣، النهاية ٧، القليوبي ١٣٥، الفقه الإسلامي٧٧٣٢.

٢) الشروانى٣٨٤، حاشية شبراملسي على النهاية ٧.

مابێت هیچ دەستکاریەکی میرات بەرەکان نە بە فرۆشتن، نە بە بەخشین، نە بە هیچ تەصەڕوفێکی تر -با بە ئیزنی خاوەن قەرزەکانیش بێت-[1] لە میراتەکەدا درووست نیە، بەلاّم ئەگەر قەرزەکان لە میراتەکە زیاتر بن، و میرات بەرەکەش وتی من بە نرخی ئێستەی هەڵی دەگرم بۆ خۆم، و کەسێك نەبوو -نە لە خاوەن قەرزەکان، نە کەسێکی تر- بە زیاتر لەو نرخە میراتەکە هەڵ بگرێت، ئەوا میرات بەرەکە دەتوانێت میراتەکە بکڕێت بۆ خۆی، و لە نرخەکەی قەرزەکان ببژێرێت.[2]

کەواتە بەمەرج گیراوە کە ئەگەر مارەیی ژنەکەی نەدابێت، واجبە پێش بەشکردنی میراتەکە مارەییەکە بدرێت بە ژنەکە، هەروەها پێش مارەیی دانیش واجبە قەرزەکانی خودای گەورە بدرێنەوە، وەك ئەو زەکاتەی کە لە ئەستۆی مردوەکەدایە بدرێت، و حەجی واجبی بۆ بکرێت — بەلای هەندێك لە زانایانەوە "یان کرێی حەج بۆ کردنی بدرێت بە یەکێك تاوەکو حەجی بۆ بکات... بەلای هەندێکی ترەوە".[3] ، و نەزر، و کەفارەتەکانیشی بۆ بدرێنەوە، ئینجا دەستکاری میرات بەرەکە لە میراتەکەدا درووستە، ئەگینا درووست نیە، واتە: تاوەکو ئەو مافانەی ڕابردوو هەمووی جێ بەجێ نەکرێن میرات بەر بۆی نیە دەستکاری میراتەکە بکات.

ئەوجا بزانە کە: زانایان کۆکن لەسەر ئەوەی کە میرات بەر دەتوانێت لە ماڵی خۆی قەرزی خاوەن قەرزەکان بداتەوە، و میراتەکە بە ئەندازەی بەشەکەی خۆی

---

٣) القليوبي ٢/٢٨٣.

١) المغني ٢/١٤٥، النهاية ٤/٣٠٨.

٢) الشبراملسی٤/٣٦٠.

هەڵبگرێت بۆ خۆی [١]، جا هەر میرات بەرێك کە بـە گـوێرەی بەشـەکەی خـۆی قەرزەکەی دایەوە، ئەوا دەتوانێت تەصەڕوف بکات لە بەشە میراتی خۆیدا[٢].

فەرموودەی ڕاستتر لەسەر ئەوەیە کە پەیوەندی قەرز بە میراتەوە ڕێگای ئەوە ناگرێت کە میرات بەرەکان ببن بـە خـاوەنی میراتەکـە، بـەڵکو تـەنها ڕێگـە لـە تەصەڕوف کردنیان دەگرێت لە میراتەکەدا، کەواتـە هـەر زیادەیـەك کـە لەسـەر عەینی میراتەکە پەیدا ببێت، چی ئەوانەی کـە لکـاون بـە میراتەکـەوە، وە چـی ئەوانەی کە جیان لێی، هەموویان دەبن بە مـوڵکی مـیرات بـەرەکان، وە قـەرزی مردوەکـە نابەسـرێت بـەم زیادانـەوە، بـەڵکو تـەنها دەبەسـرێت بـە ئەصـڵی میراتەکەوە.[٣]

بۆ نمونە: میرات بەرەکان دەتوانن تەصەڕوف بکەن لە خوری، و ڕۆن، و شیر، و بەچکەی حەیوانی میراتی، یان میـوەی بـاخی میراتـی، هەرچـەندە کـابراش بـە قەرزاری مردبێت، وە واجب نیە قەرز لـەم زیادانـەش بدرێتـەوە، هەرچـەندە کـە ئەصڵی ئەو ماڵە میراتیەی کـە ئـەم زیادانـەی لێ پەیـدا بـوە بەشـی قـەرزەکان نەکات.

ئەگەر دیار نەبوو کـە ئایـا مردوەکـە قـەرزی لـە لایـە یـان نـا، وە مـیرات بەرەکانیش تەصەڕوفیان کردبوو لە میراتەکەدا، کەچی دەرکەوت کـە پـێش ئـەوە بمرێت قەرزار بوە، یان ئێستا بە تازەیی قەرزێك پەیدا بوو بە هـۆی گەڕاندنـەوەی ماڵێکی عەیبداری فرۆشراو بەهۆی عەیبداریەوە، ئەوا ئەگەر میرات بەرەکان یـان هەرکەسێکی تر ئەو قەرزەیان دایەوە، یان خـاوەن قـەرزەکان مردوەکـەیان ئـازاد

٣) منهاج، إعانة ٦٥.
٤) المغني ٢/١٤٥، النهاية ٤/ ٣٠٦.
١) منهاج الطالبين، إعانة ٣/٦٥.

كرد، ئەوا دیارە كە هەر تەصەڕوفێك كە كردوویانە لە میراتەكەدا درووست بـوە، ئەگینا هەمووی پوچەڵە، و دەبێت لە پێشدا قەرزەكە بدرێتەوە. [١]

ئەگەر مردوەكە قەرزی كەسێكی ون بووی لەسەر بوو، و لە دۆزینەوەی خـاوەن قەرزەكەش بیّ ئومێد بووین، ئەوا مەسئەلەی قەرزەكە دەدرێتە دەست قاضی، جا ئەگەر نەبوو، یان هەبوو بەلاّم بە شەریعەتی ئیسلام ڕەفتـاری نـەدەكرد، ئەوكاتـە دەدرێتە دەست باوەڕ پێكراوێكی لێزان، تاوەكو بە ئەندازەی قەرزەكە لە میراتەكە بفرۆشێت، و بۆ (بیت المال ) سەرفی بكات، یان میرات بەرەكە خۆی ئەو كارە جیّ بەجیّ بكات، و بۆ بەرژەوەندی موسوڵمانان سەرفی بكات، واتـە: تـا ئـەو كـارە ئەنجام نەدات ئەوا هەر دەستكاریەك كە كردویەتی لە میراتەكەدا دروست نیە. [٢]

ئەوجا كە ئەم مافەش جیّ بەجیّ كرا، و مردوەكە نە قەرزی خودا نـە قـەرزی ئادەمی لەسەر نەما، ئیتر دەست دەكرێت بە جیّ بەجیّ كردنـی مـافی دوای ئـەو كە بریتیە لە:

## چوارەم:

جیّ بەجیّ كردنی ئەو وەصیەتانەی كە كردوونی، لە سنوری سیّ یەكی ئـەوەی كە لە میراتەكە ماوەتەوە تا ئێستا، واتە: ئەوەی كە لە میراتەكە دەمێنێتەوە لـە پاش لێدەركردنی ئەو مافانەی پێشوو كە باسمان كردن.

لە پاش جیّ بەجیّ كردنی ئەم مافەش دەست دەكرێت بـە جـیّ بـەجیّ كردنـی مافی كۆتایی كە بریتیە لە:

---

٢) المغني ٢/١٤٥، النهاية ٤/٣٠٧.
٣) النهاية ٤/٣٠٥، القليوبي ٢ / ٢٨٣.

## پێنجەم:

مافی دابەش کردنی پاشماوەی میراتەکە لەنێوان میرات بەرەکاندا بەگوێرەی شەریعەتی ئیسلام، و هەرکەسەو بەو ئەندازەیەی کە بۆی دیاری کراوە، کە لەمەولا بە درێژی باسی دەکەین.

شێخی نۆدی لە بارەی ئەو مافانەی کە پەیوەستن بە میراتەوە دەفەرمێت:

| | |
|---|---|
| يُبدأُ مِنْ تَرِكةٍ بِأَمرِ | عُلِّق بالعين بغير حجر |
| كَكسبِ عبدٍ، ومبيعٍ يَفنى | من اشتراه مفلساً و السكنى |
| لامْرأةٍ تَعتدُّ عن وفاةِ | والقرض و القراض و الزكاة |
| و الجانِ و النجومِ والمرهونِ | فمؤَن التجهيزِ للممونِ |
| بما يليقُ حالةَ المنيَّة | عُرفاً به، فالدَّين، فالوصية |
| من ثلث باق بعده، فالباقي | لأهل إرثٍ حسبَ استحقاقِ |

# بەشی دووەم

# جۆرەکانی میرات بەر
# چۆنێتی میرات بردنیان و ژمارەیان و حاڵەتەکانیان

## جۆرەکانی میرات بەر:

میرات بەرەکان بە شێوەیەکی گشتی دوو جۆرن:

(١) خاوەن بەشی دیاری کراو (ذو الفرض)، چی بە قورئان، یان بە فەرمایشتی پێغەمبەر (دروودی خوای لێ بێت)، یان بە کۆدەنگی زانایان (إجماع).

(٢) عەصەبە (عەصەبە کەسێکە کە بەشێکی دیاریکراوی شەرعی نیە بەڵکو یان هەموو ماڵەکە دەبات ئەگەر خاوەن بەش نەبوون، یان ئەوەی کە لە خاوەن بەشەکان دەمێنێتەوە دەیبات لەکاتێکدا کە خاوەن بەش هەبوون).

بەلاّم ئەم دابەش کردنە وا ناگەیەنێت کە میرات بەر دەبێت هەر بە یەکێك لەم دوو شێوەیە میرات ببات، و ناکرێت بە هەردوو شێوەکە میرات ببات، بەڵکو مانای وایە کە: میرات بەر تەنها ئەم دوو رێگەیە هەیە کە میراتی لێوە ببات، و دەشگونجێت کە بە هەردوو شێوەکە میرات ببات، چونکە میرات بەرەکان لە چۆنێتی میرات بردنیاندا دەکرێن بە چوار جۆرەوە:[1]

---

١) الشنشوري ١٠٩ – ١١٠، القليوبي ١٤٠، المجموع٥٠، الفقه الإسلامي ٧٧٣٧، اللمع ٤٤-٤٥.

## چۆنێتی میرات بردنی میرات بەران

(١) تەنها وەك خاوەن بەش. كە ژمارەیان حەوت (٧) كەسە: دایك، داپیرە – دایكی باوك، دایكی دایك --، ژن، مێرد، برای دایكی، خوشكی دایكی.

(٢) تەنها بە عەصەبە گەرایەتی. كە ژمارەیان دوازدە (١٢) كەسە: كوڕ، كوڕی كوڕ، برای باوك و دایكی، برای تەنها باوكی، كوڕی برای باوك و دایكی، كوڕی برای تەنها باوكی، مامی باوك و دایكی، مامی تەنها باوكی، كوڕی مامی باوك و دایكی، كوڕی مامی تەنها باوكی، پیاوی ئازاد كەری كۆیلە، ژنی ئازاد كەری كۆیلە.

(٣) جارێك وەك خاوەن بەش، و جارێكیش بە عەصەبە گەرایەتی، بەلاّم ناكرێت كە لەیەك مەسئەلەدا بە هەردوو شێوەكە میرات ببەن، كە ئەم جۆرە میرات بەرە تەنها مێیینەن، و ژمارەشیان چوار (٤) كەسە: كچ، كچی كوڕ، خوشكی دایك و باوكی، خوشكی باوكی، وەك لەمەولا ڕوونی دەكەینەوە گەر خودا بیەوێت.

(٤) جارێك وەك خاوەن بەش، و جارێكیش بە عەصەبە گەرایەتی، و دەكرێت كە لەیەك مەسئەلەدا بە هەردوو شێوەكە میرات ببەن، كە ئەم جۆرەیان تەنها نێرینەن، و ژمارەشیان دوو (٢) كەسە: باوك، باپیر، كە بەشی دیاری كراوی خۆیان هەیە، و ئەوەی كە لە خاوەن بەشەكانیش دەمێنێتەوە بە عەصەبە گەرایەتی دەیبەن وەك لەمەولا ڕوونی دەكەینەوە گەر خودا بیەوێت.

## خشتەی میرات بەران و ژمارەیان و ڕەگەزیان و چۆنێتی میرات بردنیان

| میرات بەرەکان | ژمارەیان | ڕگەزیان | چۆنێتی میرات بردنیان |
|---|---|---|---|
| (١) دایك، نەنك (دایكی باوك، دایكی دایك)، ژن، مێرد، برای دایكی، خوشكی دایكی | (٧)کەس | نێر، مێ | تەنها وەك خاوەن بەش |
| (٢) کوڕ، کوڕی کوڕ، برای باوك و دایكی، برای تەنها باوكی، کوڕی برای باوك و دایكی، کوڕی برای تەنها باوكی، مامی باوك و دایكی، مامی تەنها باوكی، کوڕی مامی باوك و دایكی، کوڕی مامی تەنها باوكی، پیاوی ئازاد کەری کۆیلە، ژنی ئازاد کەری کۆیلە. | (١٢)کەس | نێر، مێ | تەنها وەك عەصەبە |
| (٣) کچ، کچی کوڕ، خوشكی دایك و باوكی، خوشكی باوكی | (٤) کەس | مێ | أ. وەك خاوەن بەش.<br>ب. وەك عەصەبە. |
| (٤) باوك، باپیر | (٢)کەس | نێر | أ. وەك خاوەن بەش.<br>ب. وەك عەصەبە.<br>ت. بە هەردوو جۆرەکە. |

## ژمارەی میرات بەران

میرات بەرەکان لە نێرینە (بە کورتی ) (١٠) کەسن، بـەلاّم بـە درێـژی (١٥) کەسن وەك لە خوارەوە ڕوون کراوەتەوە:

(١) کوڕ.

(٢) کوڕی کوڕ.

(٣) باوك.

(٤) باوکی باوك (باپیرە)(با بڕوات بەرەو ژوور ).

(٥) برای:

أ. دایك و باوکی.

ب.تەنها باوکی.

ت.تەنها دایکی.

(٦) کوڕی برای:

أ. دایك و باوکی.

ب.تەنها باوکی.

(٧) مامی:

أ. دایك و باوکی.

ب.تەنها باوکی.

(٨) کوڕی مامی:

أ. دایك و باوکی.

ب.تەنها باوکی.

(٩) مێرد.

(١٠) پیاوی خاوەن کۆیلەی ئازاد کراو.

ئیمامی رەحەبی دەفەرمویٚت:

والوارثــون مــن الرجــال عــشرة / أســـماؤهم معروفـــة مـــشتهرة

الابــن وابــن الابــن مهــما نــزلا / والأب والجـــد لـــه وإن عـــلا

والأخ مـــن أي الجـــهات كانـــا / قـــد أنـــزل الله بـــه الـــقرآنا

وابــن الأخ المــدلي إلــيه بــالأب / فـــاسمع مقـــالا لـــيس بـــالمكذب

والـــعم وابــن الــعم مــن أبيـــه / فاشـــكر لـــذي الإيجـــاز والتنبيـــه

والـــزوج والمعتـــق ذو الـــولاء / فجملـــة الـــذكور هـــؤلاء

جا ئەگەر ژنێك بمرێت، و هەموو ئەم پانزە میرات بەرە نێرینانەی لەپاش بەجێ بهێنێت، ئەوا تەنها سیانیان میراتی لێ دەبەن، كە بریتین لە: مێرد، و كور، و باوك، كە پێیان دەوترێت: میرات بەری هەمیشەیی، و دوازدەكەی كە ماون بە بوونی كور، و باوك لەمیرات بێ بەش دەبن.

خاوەنی سیراجیە دەفەرمویٚت:

و في اجتماع للذكور الوارثُ الأب، و الابن، و زوج ماكث

وە میرات بەرەكان لە مێیینە (بە كورتی ) (٧) كەسن، بەلاّم بە درێژی (١٠) كەسن وەك لە خوارەوە ڕوون كراوەتەوە.

(١) كچ.

(٢) كچی كوڕ (با بڕوات بەرەو خواریش، وەك كچی كوڕی كوڕ، و كچی كوڕی كوڕی كوڕ ).

(٣) دایك.

(٤) نەنك:

أ. دایكی باوك.

ب. دایكی دایك.

(٥) خوشكی:

أ. دایك و باوكی.
ب.تەنها باوكی.
ت.تەنها دایكی.
(٦) ژن.
(٧) ژنێك كە خاوەنی كۆیلەیەك بوو بێت و كۆیلەكەی ئازاد كردبێت.

ئیمامی رەحەبی دەفەرموێت:

والوارثـات مـن النـساء سـبع — لم يعـط أنثـى غيـرهن الـشرعُ
بنـت، و بنـت ابـن، و أم مـشفقة — وزوجـة، و جـدة، و معتقـة
والأخـت مـن أي الجهـات كانـت — فـهـذه عـدتـهن بانـت

لێرەشدا ئەگەر پیاوێك بمرێت، و هەموو ئەم میرات بەرە مێیینانەی لە پاش بەجێ بمێنێت، ئەوا تەنها پێنجیان میراتی لێ دەبەن، كە بریتین لە: ژن، و كچ، و كچی كوڕ، و دایك، و خوشكی دایك و باوكی، چونكە بە بوونی دایك نەنكەكان — دایكی باوك، و دایكی دایك — بێ بەش دەبن، و بە بوونی خوشكی دایك و باوكی خوشكی باوكی، و ئازاد كەری كۆیلە بێ بەش دەبن، و بە بوونی كچیش خوشكی دایكی بێ بەش دەبێت.

بەڵام ئەگەر لە نێر، و لە مێ ئەوانە كۆ بوونەوە كە دەگونجا بە یەكەوە كۆ ببنەوە، ئەوا ئەوانەی كە میرات دەبەن تەنها بریتین لە: ژن یان مێرد، و دایك، و باوك، و كوڕ، و كچ، چونكە ئەوانی تر بەم چوارە (دایك، و باوك، و كوڕ، و كچ ) بێ بەش دەبن، وەك لە باسی (حجب ) دا ڕوونی دەكەینەوە.

خاوەنی سیراجیە دەفەرموێت [1]:

---

١) الكنوز ١٦٢.

وفي النســاء الوارثــات خمــس بنــت وبــنت ابــن لــه، والــعرس
والأم، و الأخــت الــشقيقة ولــو كــانوا جميعــا، فلــخمس قــد نجــوا
الــوالدين، يــا فتــى، والولــدين وأحــد الــزوجين، فــاعلم دون مــين

ئەوجا ئەگەر کەسێك بمرێت:

(١) هیچ لەم مـیرات بەرانـەی سـەرەوەی نـەبوو، ئـەوا ئەصـڵی مەزهـەب ئەمەیە کە: (ذوي الأرحام) هیچ لە میراتەکەیان ناکەوێت.

(٢) خـاوەن بەشــە دیـاری کراوەکـان هەنـدێکیان هـەبوون، و هـەموو میراتەکەشیان نەدەبرد، بەڵکو هەندێك لە میراتەکە زیاد بوو لـە بەشـەکانیان، و دەمایەوە، ئەوا ئەصڵی مەزهەب وایە کە: پاشماوەی بەشی خـاوەن بەشـەکان ڕەد ناکرێتەوە بۆیان.

بەڵکو لە هەردوو شێوەکەدا میراتەکە دەدرێت بە (بيت المال ) بـە عەصـەبە گەرایەتی، وەك میرات بەر نەك وەك بەرژەوەندی.

بەڵام ئەگەر (بيت المال ) ڕێك و پێـك نـەبوو، وەك ئـەوەی کـە موسـوڵمانان ئیمامیان نەبوو، یان ئیمام هەبوو بەڵام داد پەروەر نەبوو، و ئەهلیـەتی لەدەسـت دابوو، یان ماڵی موسوڵمانانی لە جێگەی خۆیدا سەرف نـەدەکرد، ئـەوا بـە کـۆ دەنگی زانایان [1] لە شێوەی یەکەمدا -کە مردوەکە میرات بەری نەبوو- ماڵەکە دەدرێت بە (ذوي الأرحـام ). وە لە شـێوەی دووەمـدا -کـە هەنـدێك لـە خـاوەن بەشەکان هەبوون- ئەوەی کە زیادە لە بەشـی خۆیـان هـەر کەسـەو بـە گـوێرەی بەشەکەی خۆی بۆیان ڕەد دەکرێتەوە، تەنها مێرد، و ژن نەبێت، کە هیـچیان بـۆ ڕەد ناکرێتەوە. چونکە خزمایەتی نیـە لـە نێوانیـان دا، بـەڵام ئەگـەر ئـەو ژن و مێردە بێجگە لەوەی کە ژن و مێردی یەکترن، خزمایەتی هـەبوو لـە نێوانیانـدا،

---

١) المغني ٣/٧، النهاية ١٢/٦.

وەك ئەوەی کە ئامۆزا بن، ئەوا لەم کاتەدا ماڵەکە ڕەد دەکرێتەوە بەسەریاندا بەپێی ئەو خزمایەتیە، نەك بەپێی ئەوە کە ژن و مێردی یەکترن.[1]

بەڵام بەلای حەزرەتی عثمان ی کوڕی عەفانەوە (خوای لیٚ ڕازی بێت) وەك چۆن بۆ خاوەن بەشەکانی تر پاشماوەی میراتەکەیان بۆ ڕەد دەکرێتەوە، هەر بەو شێوەیەش بۆ ژن، و مێردیش ڕەد دەکرێتەوە .[2]

دکتۆر وەهبە زوحەیلی، فەتوای هەندێك لە زانایانی موتەئەخیرینی مەزهەبی ئەبو حەنیفەی هێناوە کە فەرموویانە: لەم کاتەدا کە پێشەوای داد پەروەر نیە، دەکرێت ژن و مێردیش میراتیان بۆ ڕەد بکرێتەوە، ئەمیش لە کاتێکدا کە ژنەکە یان مێردەکە بە تەنها بن و مردوەکەش کەسی تری نەبێت.[3]

ئەوجا ئەگەر خاوەن بەش دەست نەکەوت لەوانەی کە زیادەکە ڕەد دەکرێتەوە بەسەریاندا ئەوا میراتەکە دەدرێت بە (ذوي الأرحام ).

شێخی نۆدی لەم بارەیەوە دەفەرموێت:

وإن تجد نظامه مختلاّ ... فلردد على أهل الفروض فضلا
بنسبة الفروض قصد العدل ... غير حليلة، وغير بعل
إن كان كلّ من له فرض عدم ... وجب صرفها إلى ذوي رحم

هەروەها ئەگەر کەسێك بمرێت، و هیچ کەس میرات بەری نەبوو، نە خاوەن بەش، و نە عەصەبە، و نە (ذوي الأرحام)، وە پێشەوای موسوڵمانانیش دادوەر نەبوو، ئەوا میراتەکەی دەدرێتە دەست کەسێکی دادوەر، تاوەکو لە بەرژەوەندی

---

٢) المغني ٣/٧، المحلى ٣/١٣٨.
١) الدرة البهية٣٥، المفصل ١١ / ٣٣٠، الموسوعة / الإرث بالردّ ٣ / ٤٩ — ٥٠.
٢) الفقه الإسلامي٧٨٢٧ — ٧٨٢٨.

موسوڵمانانندا خەرجی بکات، بەڵکو هەندێك لـە زانایـان دەفـەرموون: پێویـستە (واجب) لەسەر ئەو کەسە دادوەرە کە بەو کارە هەڵبسێت. [1]

## باسی بەشە دیاری کراوەکان (الفروض المقدرة)

ئەو کەسانەی کە وەك خاوەن بەشی دیاری کراو مـیرات دەبـەن - ئەگەرچـی هەندێکیان هەندێك جار بە عەصەبە گەرایەتیش مـیرات دەبـەن- سـیانزە (١٣) کەسن:

چوار (٤) نێرینە:

١) مێرد.

٢) برای دایکی.

٣) باوك.

٤) باپیرە.

نۆ (٩) مێیینە:

١) دایك.

٢) دایکی باوك.

٣) دایکی دایك.

٤) ژن.

٥) خوشکی دایکی.

٦) کچ.

٧) کچی کوڕ.

٨) خوشکی دایك و باوکی.

٩) خوشکی باوکی.

---

٣) المغني ١١، القليوبي ١٤٠، إعانة ٢٣٢، الأنوار ٢ / ٣.

واتە: هەموو ئەو مێیینانەن کە لە ژماردنی میرات بەرە مێیینەکاندا باسمان کردن، تەنها ئازاد کەری کۆیلە نەبێت کە تەنها بە عەصەبە گەرایەتی میرات دەبات.[١]

ئەوجا ئەو بەشانەی کە بە دیاری کراوی لە قورئـانی پـیرۆز دا باسـیان لێـوە کراوە شەش (٦) جۆرن:

(١) دووسێیەك. واتە: لە سێ بەش، دوو بەشی.
(٢) نیوە. واتە: لە دوو بەش، یەك بەشی.
(٣) چوار یەك. واتە: لە چوار بەش، یەك بەشی.
(٤) هەشت یەك. واتە: لەهەشت بەش، یەك بەشی.
(٥) سێیەك. واتە: لە سێ بەش، یەك بەشی.
(٦) شەش یەك. واتە: لە شەش بەش، یەك بەشی.

جا لێرەدا بە درێژی دەچینە سەر باسی هەموو ئەو کەسانەی کە بەشی دیاری کراویان هەیە:

ئەوجا لە بۆ ئاسانی ئەگەر ئەم دێڕە شیعرە لە بەر بکرێت زۆر باشە:

ضبط ذوي الفروض من هذا الرجز خذه مرتّباً، و قل: (هبا دبز)

پیتی (هاء) لە بەرامبەر ژمارە پێنجە بـەگوێرەی پیتـە ئەبجەدییـەکان کـە دەکاتە ژمارەی ئەو کەسانەی کە نیوە دەبەن، و پیتی (باء) لە بەرامبـەر ژمـارە دووە کە دەکاتە ژمارەی ئـەو کەسـانەی کـە چـواریەك دەبـەن، و پیتـی (ألـف) بەرامبەر ژمارە یەکە کە دەکاتە ژمارەی ئەو کەسەی کە هەشت یـەك دەبـات، و پیتی (دال) بەرامبەر بە ژمارە چـوارە کـە دەکاتـە ژمـارەی ئـەو کەسـانەی کـە دووسێیەك دەبەن، و پیتی (باء) دووبارە لە بەرامبـەر ژمـارە دووە کـە دەکاتـە

---

١) التحفة ٦ / ٣٩٢، القليوبي ٣ / ١٣٨، إعانة ٣ / ٢٢٥.

ژمارەی ئەو کەسانەی کە سێیەك دەبەن، و پیتی (زاي) لە بەرامبەر ژمارە حەوتە کە دەکاتە ژمارەی ئەو کەسانەی کە شەش یەك دەبەن.[١]

## نیوە:

ئەوانەی کە نیوە دەبەن پێنج کەسن وەك ئیمامی رەحەبی دەفەرموێت:

النصف فرض خمسة أفراد    الزوج، والأنثى من الأولاد
وبنت الابن عند فقد البنت    والأخت في مذهب كل مفتي
وبعدها الأخت التي من الأب    عند انفرادهنّ عن معصب

(١) مێرد بە مەرجێك کە ژنەکەی منداڵی نەبێت، جا چی لەم مێردە بێت یان لە مێردێکی تر.

(٢) یەك کچ. ئەویش بە دوو مەرج:

أ. تەنها یەك کچ بێت.

ب. لەگەڵ کەسێکیشدا نەبێت کە بیکات بە عەصەبە.

(٣) یەك کچی کوڕ.

(٤) یەك خوشکی دایکی و باوکی.

(٥) یەك خوشکی باوکی.

ئەم سیانەی کۆتاییش بە سێ مەرج نیوە دەبەن

أ. دوان یان زیاتر نەبن، چونکە لەم کاتەدا دوو سێ یەك دەبەن، نەك نیوە.

ب. لەگەڵ کەسێکدا نەبن کە بیانکات بە عەصەبە چونکە لەم کاتەشدا نیوە نابەن، بەڵکو بە یاسای (للذكر مثل حظ الأنثيين) وەك لە باسی (عصبة بالغير)دا ڕوونی دەکەینەوە.

---

١) الشنشوري مع حاشية الباجوري عليه ٢٦ – ٢٧، و الكنوز ١٦٣.

ت.لەگەڵ کەسێکیشدا نەبن کە بێ بەشیان بکات لە میرات، وەك لە باسی حەجب دا باسی دەکەین.

## دووسێیەك:

ئەوانەی کە دووسێیەك دەبەن چوار کۆمەڵن، وەك ئیمامی رەحەبی دەفەرموێت:

والثلثان للبنات جمعا ما زاد عن واحدة فسمعا
وهو كذاك لبنات الابن فافهم مقالي فهم صافي الذهن
وهو للأختين فما يزيد قضى به الأحرار والعبيد
هذا إذا كن لأمّ و أب أو لأب، فاعمل بهذا تصب

(١) دوو کچ، یان زیاتر. بە دوو مەرج:

أ. ژمارەیان دوو یان زیاتر بێت.

ب.لەگەڵ کەسێکیشدا نەبن کە بیانکات بە عەصەبە.

(٢) دوو کچی کوڕ، یان زیاتر، جیاوازی نیە لەوەدا کە خوشك بن، یان ئامۆزا.

(٣) دوو خوشکی دایك و باوکی، یان زیاتر.

(٤) دوو خوشکی تەنها باوکی، یان زیاتر.

ئەم سێ کۆمەڵەش بە سێ مەرج:

أ. ژمارەیان دوو یان زیاتر بێت.

ب.لەگەڵ کەسێکدا نەبن کە بیانکات بە عەصەبە.

ت.لەگەڵ کەسێکیشدا نەبن کە بەشەکەیان کەم بکاتەوە، یان بێ بەشیان بکات لە میرات.

## چوار یەك:

ئەوانەی کە چوار یەك دەبەن دوو کەسن وەك ئیمامی رەحەبی دەفەرموێت:

والربع فرض الزوج إن كان معه — من ولد الزوجة من قد منعه
وهو لكل زوجة، أو أكثرا — مع عدم الأولاد فيما قدرا

(١)مێرد، بەمەرجێك کە ژنەکەی منداڵی هەبێت (چ لەم پیاوە یان لە پیاوێکی تر ).

(٢)ژنێك (یان زیاتر ) بەمەرجێك کە مێردەکەی منداڵی نەبێت.

## تێبینی:

ئەگەر چی دایك لە یەکێك لە دوو مەسئەلەکەی (غرّاوین ) دا چوار یەك دەبات، بەلاّم بەشەکەی لەو مەسئەلەیەدا پێی ناوترێت: چوار یەك، بەڵکو پێی دەوترێت: سێ یەکی ماوە (ثلث الباقي )، وەك لە جێگەی خۆیدا ڕوونی دەکەینەوە.

## هەشت یەك:

بۆ ژنێك (یان زیاتر ) بە مەرجێك کە مێردەکەی منداڵی هەبێت، چ لەم ژنە یان لە ژنێکی تر وەك ئیمامی رەحەبی دەفەرموێت:

والثمن للزوجة، و الزوجات — مع البنين أو مع البنات
أو مع أولاد البنين فاعلم — ولاتظن الجمع شرطا فافهم

## سیٚ تێبینی گرنگ لەسەر میراتی ژن و مێرد:

(١) لێرەدا بە کۆ دەنگی زانایـان [١] منـداڵی کـوڕی مردوەکـە هـەر وەکـو منداڵی مردوەکە خۆی وایە، واتە کاتێك کە باس لە بوونی منـداڵ یـان نـەبوونی دەکرێت ئەوا مەبەست کوڕەزاشە، چونکە منداڵ بەکار هێنانی بۆ منداڵی مـردوو حەقیقەتە، و بەکار هێنانی بۆ منداڵی کوڕ مەجازە، وە هـەردوو شێوەکەش لـە زمانی عەرەبیدا بەکار هاتوە [٢].

یەکێك لە شاعیران وتوویەتی:

بنونا بنو أبنائنا وبناتنا    بنوهنّ أبناء الرجال الأباعد

ئیمامی رەحەبیش لەم بارەیەوە دەفەرموێت:

وذكر أولاد الـبنين يـُعتمد    حيث اعتمدنا القول في ذكر الولد

(٢) کاتێك کە باس لە بوونی منداڵ دەکرێت، ئەوا مەبەست منداڵێکە کـە میرات ببات، ئەگینا ئەگەر منداڵ هەبوو، بەڵام میراتـی نـەدەبرد، وەك منـداڵی کچ (کچەزا)، یان وەك ئەوە کە ئەو منداڵە کـافر بێـت، یـان کۆیلـە بێـت، یـان بکوژی مردوەکە بێت، ئەوا: هەر وا دادەنرێت کە مردوەکە منداڵی نیە [٣].

(٣) میرات لەیەك بردن لە نێـوان ژن و مێـرد دا هـەر بەردەوامـە تـاوەکو (عدة) ی تەڵاقی رەجعیش بەسـەر دەچـێت، ئـیتر لـەپاش بەسەرچـوونی (عـدة)، تەڵاقەکە بائینە دەبێتەوە و میرات لەیەکتر نابەن [٤].

---

١) التحفة ٣٩٥، النهاية ٦/١٤، المغني ٣/٩.
٢) النهاية ٦/١٤، المغني ٣/٩، الشرواني ٣٩٥.
٣) التحفة ٣٩٦، النهاية ٦/١٤، المجموع ١٧/٧٣، إعانة ٣/٢٢٩.
٤) شرح المنهج ٦ / ٦٨، الدرة البهية ١٦، المفصل ١١ / ٢٦٩.

## سێ یەك:

ئەوانەی کە سێ یەك دەبەن دوو جۆر میرات بەرن وەك ئیمامی رەحەبی دەفەرموێت:

والثلث فرض الأم حيث لا ولد ولا من الإخوة جمع ذو عدد
كاثنين أو ثنتين أو ثلاث حكم الذكور فيه كالإناث
ولا ابن ابن معها أو بنته ففرضها الثلث كما بينته
وهو للاثنين أو ثنتين من ولد الأم بغير مين
وهكذا إن كثروا أو زادوا فما لهم فيما سواه زاد
ويستوي الإناث والذكور فيه كما قد أوضح المسطور

(١) دایك. ئەویش بە سێ مەرج:
أ. مردوەکە منداڵی نەبێت.
ب. مردوەکە دوان یان زیاتر براو خوشکیشی نەبێت، جا جیاوازی نیە لەوەدا کە دوو باری هەبێت، یان دوو خوشك، یان براو خوشکێك، وە جیاوازیش نیە لەوەدا کە برا و خوشکی باوك و دایکی بن، یان تەنها باوکی، یان تەنها دایکی.
ت. مەسئەلەکە هیچکام لە دوو مەسئەلەی (غرّاوین) نەبێت.
(٢) دوو برا و خوشکی دایکی یان زیاتر، جائیتر دوو برابن، یان دوو خوشك، یان برا و خوشکێك.

# دوو مەسئەلەی پرشنگدارەکە (الغرّاوين)

بە کۆدەنگی زانایان هەر کاتێك دایك لەگەڵ باوك، و ژن یان مێرد دا کۆ ببێتەوە ئەوا: سێ یەکی پاشماوەی بەشی ژنەکە یان مێردەکە دەبات (ثلث الباقي)، نەك سێ یەکی هەموو میراتەکە. وەك ئیمامی رەحەبی دەفەرموێت:

وإن يكن زوج وأم وأب فثلث الباقي لها مرتب

وهكذا مع زوجة فصاعدا فلا تكن عن العلوم قاعدا

هەروەها ئەم مەسئەلەیە بە (العمريتين)یش ناودەبرێت.[1]

مەسئەلەکانیش ئەمانەن:

(١) ئەگەر ژنێك بمرێت: دایك، باوك، مێردی لەپاش بەجێ بمێنێت، ئەوا مەسئەلەکەیان لە دوە (٢). نیوەی کە بریتیە لە یەك (١) مێردەکەی دەیبات، و یەکیشی دەمێنێتەوە، دایکەکەش سێیەکی ئەم یەکە دەبات، بەڵام لەبەر ئەوە کە ژمارە یەك (١) بەشی دروست و ساغی نیە، بۆیە دەبێت ئەصڵی مەسئەلەکە لێکدانی سێ (٣) بکەین بۆ ساغکردنەوەی مەسئەلەکە، بەمەش ئەصڵی مەسئەلەکە دەبێت بە شەش (٦)، جا ئێستا ئەم شەشە، نیوەی بۆ مێردەکە کە دەکاتە سێ (٣)، وە سێیەکی ئەوەشی کە دەمێنێتەوە بۆ دایکەکە، کە دەکاتە یەك، بەمەش دوو بەش دەمێنێتەوە بۆ باوکەکە.

| ئەصڵی مەسئەلە | | ٢ ← ٣ × | ٦ | ٦ |
|---|---|---|---|---|
| مێرد | نیوە | ١ | ٣ | ٣ |
| پاش ماوە | | ١ | ٣ | ٠ |
| دایك | | (؟) | سێیەکی پاشماوە | ١ |
| باوك | | (؟) | عەصەبە | ٢ |

١) النهاية ١٥، المغني ١٠، إعانة ٢٣١، شرح الرحبية ٤٧، الفقه الإسلامي ٧٨٠٥.

(٢) ئەگەر پیاوێك بمرێت: دایك، باوك، ژنـی لـەپاش بـەجێ بهێنێـت، ئـەوا مەسئەلەکەیان لە چوارە (٤)، چوار یەکی کە دەکاتە یـەك (١) ژنەکـە دەیبـات، دوانی (٢) بۆ باوکەکەیە، و یەکێکی (١) بۆ دایکەکەیە.

| | | | |
|---|---|---|---|
| ئەصڵی مەسئەلە | | ٤ | ٤ |
| یەك ژن | چواریەك | ١ | ١ |
| پاش ماوە | | ٣ | ٠ |
| دایك | | سێیەکی پاشماوە | ١ |
| باوك | | عەصەبە | ٢ |

**ئاگاداری:**

(٣) لەم دوو مەسئەلەدا بۆیە دایك سێ یەك نابات — لەگـەڵ ئەوەشـدا کـە دەبوو سێ یەکی بکەوێت — چونکە یاسایەکی گشتی لە (فرائض ) دا هەیـە کـە دەڵێت: هەموو مێیینەیەك نیوەی ئەو نێرینەیە میرات دەبات کە لە هەمان پلەی خۆیدایە .[1] جا ئەگەر دایکەکـە سـێ یـەك ببـات، و باوکەکـەش سـێ یـەکی بردبێت، ئەوا بەشەکانیان یەکسان دەبـن، و ئەمـەش پێـچەوانەی ئـەو یاسـایەی سەرەوەیە. وە ئیبنو عەباس تەنها زانایە کە فەرموویەتی: سێ یـەکی دەکـەوێت، نەك سێیەکی پاشماوە.[2]

(٤) ئەگەر کەسێك بپرسێت: تۆ لە سەرەتای ئەم باسەوە وتت: ئەو بەشانەی کە دیاری کراون شەش جۆرن. کەچی ئێستا باسی جۆرێکی ترت کرد کە ئـەویش:

---

١) التحفة ٤٠٤، المجموع ٨٤/١٧، شرح الرحبية ٤٦، المغـني ١٤، الفقـه الإسلامي٧٧٧٤، الفقه المنهجي / ٢ / ٢٦٩، الكنوز ١٧٢.

٢) الفقه الإسلامي ٧٧٨٩، موسوعة زيد بن ثابت ٦٥، الكنوز ١٧٢، اللمع ٦١.

سێ یەکی پاشماوەیە (ثلث الباقي )، کەواتە بەشە دیاری کراوەکان بوون بە حەوت جۆر، نەك شەش؟! لە وەلاّمدا دەڵێین: ئەگەر بە وردی سەیری ئەم دوو مەسئەلەی (غـرّاوین )ە بکەیت، دەبینیت کە دایکەکە لە مەسئەلەی یەکەمدا شـەش یـەکی بردوە، وە لە مەسئەلەی دوەمدا چوار یەکی بردوە، کەواتە بەشی دایکەکـە هـەر دەگەڕێتەوە سەر شەش بەشە دیاری کراوەکە. [1] بەلاّم لەبەر ڕێز گرتن لـە دەقـی قورئانی پیرۆز کە بەشی دایکی بە سێ یەك ناو بردوە، لێرەدا زانایانیش هـەر بـە سێ یەك ناوی دەبەن، بەلاّم دەڵێن: سێیەکی پاشماوە. شێخی نۆدی لـەم بارەیـەوە دەفەرموێت:

ترث مع أحد زوجين، وأب ثلث ما يبقى و من أجل الأدب

بـــه يعبـرون عـما يـدفع للأم و هـو ســدس، أو ربـــع

(٥) هەندێك جار ئەم سێ یەکە دادەنرێت بۆ باپیرە — ئەم بەشە لە قورئان و فەرمایشتی پێغەمبـەردا نـەهاتوە، بـەڵکو کـۆدەنگی زانایـانی لەسـەرە، و بـە ئیجتیهادی هاوەلاّن چەسپاوە --، ئەویش کاتێکە کە لەگەڵ براکانی مردوەکـەدا کۆ ببێتەوە وەك لەباسی کۆبوونـەوەی بـاپیرە لەگـەڵ خوشـك و براکانـدا ڕوونـی دەکەینەوە (إن شاء الله ).

جا کەوابوو دەکرێت بڵێین: ئەوانەی کە سێ یەك دەبەن سێ جـۆرن، نـەك دوو جۆر. [2]

---

١) التحفة ٤٠٤، النهاية ١٥، المغني ١٠، إعانة٢٣١، شرح الرحبية ٤٦.

٢) النهاية ١٥، المغني ١٠، شرح المنهج ٦ / ٦٩، التحفة ٣٩٦.

## شەش یەك:

ئەوانەی کە شەش یەك دەبەن حەوت جۆر میرات بەرن وەك ئیمامی رەحەبی دەفەرموێت:

والسدس فرض سبعة من العدد أب، وأم، ثم بنت ابن، وجد
والأخت، بنت الابن، ثم الجدة وولد الأم تمام العدة

(١) باوك. بەمەرجێك مردوەكە منداڵی هەبێت.
(٢) باپیرە. ئەویش بەم سێ مەرجەی خوارەوە :
أ. مردوەكە منداڵی هەبێت.
ب. مردوەكە باوكی نەبێت، چونكە بە بوونی باوك باپیرە بێ بەش دەبێت.
ت. باپیرەی باوكی بێت، چونكە باپیرەی دایكی خاوەن بەش نیە، بەڵكو لە (ذوي الأرحام )ە.
(٣) دایك. ئەویش بە یەكێك لەم دوو مەرجە:
أ. مردوەكە منداڵی هەبێت.
ب. مردوەكە دوان یان زیاتر برا و خوشكی هەبێت. جیاوازی نیە هەموویان برا بن، یان هەموویان خوشك بن، یان خوشك و برا بن بە یەكەوە.
(٤) نەنك (داپیرە). لێرەدا جیاوازی نیە لەوەدا كە ئەو نەنكە: دایكی باوك بێت، یان دایكی دایك، یان بەرەو ژوورتر، وەكو: دایكی دایكی باوك یان دایكی دایكی دایك. وەك ئیمامی ڕەحەبی دەفەرموێت:

والسدس فرض جدة في النسب واحدة كانت لأم وأب

هەروەها ئەگەر هەردوو نەنكەكەش بەیەكەوە كۆ ببنەوە ئەوا شەش یەكەكە بە یەكسانی دابەش دەكرێت لە نێوانیاندا. لەم بارەشەوە دەفەرموێت:

وإن تساوي نسب الجدات وكن كلهن وارثات
فالسدس بينهنّ بالسوية في القسمة العادلة الشرعية

هەروەها لێرەدا جیاوازی نیە لەوەدا کە مردوەکە منداڵی هەبێت یان نا.

نەنك کاتێك شەش یەك دەبات کە ئەم دوو مەرجە هاتبنەجێ:

أ. مردوەکە دایکی نەبێت.

ب.ئەو نەنکە نەگات بە مردوەکە بە هۆی نێرینە لە نێوان دوو مێیینـە، جـا ئەگەر ئەو نەنکە گەیشت بە مردوەکە بە هـۆی نێرینـە لـە نێـوان دوو مێیینـە، وەکو: دایکی باوکی دایك، ئەوا دەبێت بە (ذوي الأرحام).

کەواتە نەنك کاتێك میرات بەرە کە نزیك ببێتەوە لە مردوەکەوە بە:

(أ) مێیینەی ڕووت، وەك: دایکی دایکی دایك.

(ب) نێرینەی ڕووت، وەك: دایکی باوکی باوك.

(ت) مێیینە تا دەگات بە نێرینە، وەك: دایکی دایکی باوك.

(٥) کچی کوڕ، یەکێك بێت یان زیاتر.

ئەویش بەم سێ مەرجە:

أ. مردوەکە یەك کچی هەبێت.

ب. مردوەکە یەك کچی کوڕی هەبێت، کە لەسەر ئەمەوە بێت (واتە لـە پلـەی گەیشتنی بەمردوەکە نزیکتر بێت )، وەك کچی کـوڕی کـوڕ لەگـەڵ کـچی کـوڕ. ئیمامی رەحەبی دەفەرموێت:

وبنت الابن تاخذه السدس إذا كانت مع البنت مثالا يحتذى

ت.کەسێکی لەگەڵدا نەبێت کە بیکات بە عەصەبە، ئەگینا لەم کاتەدا شەش یەك نابات، بەڵکو دەکەوێتە یەکێك لەم دوو حاڵەتەوە:

١) ئەوەی کە لە خاوەن بەشەکان دەمێنێتەوە بـە عەصـەبەگەرایەتی دەیبـەن، بەپێی یاسای: (للذكر مثل حظ الأنثيين).

بۆ نمونە: پیاوێك دەمرێت، و کچێك، کچی کوڕێك، کوڕی کوڕێکی لە پاش بەجێ دەمێنێت، ئەوا: کچەکە نیوە دەبات، و نیوەکەی تـری بـۆ کـوڕی کوڕەکـە

لەگەڵ کچی کوڕەکە، بەشێوەیەك کە کوڕی کوڕەکە دوو بەرامبەری کچی کوڕەکە دەبات. جا ئێستا بۆ ڕاست کردنەوەی مەسئەلەکە ئەصڵی مەسئەلەکە کە دوە (٢) لێکدانی سێ (٣) ی دەکین، و دەبێتە شەش (٦)، ئەوجا نیوەی شەش (٦) کە سێ (٣) یە کچەکە دەیبات، و نیوەکەی تریشی کە سێ (٣) یە دوو (٢) بەشی کوڕی کوڕەکە دەیبات، و یەك (١) بەشیشی کچی کوڕەکە دەیبات.

| | | | |
|---|---|---|---|
| ئەصڵی مەسئەلە | | ٢ ← × ٣ | ٦ |
| یەك کچ | نیوە | ١ | ٣ |
| یەك کوڕی کوڕ | عەصەبە | ١ | ٢ |
| یەك کچی کوڕ | | | ١ |

٢) کوڕی کوڕەکە دەبێت بەهۆی ئەوەی کە کچی کوڕەکەش هیچ نەبات. ئەویش لە کاتێکدا کە میراتەکە هیچی لە خاوەن بەشەکان نەمێنێتەوە.

بۆ نمونە: ژنێك دەمرێت، باوك، دایك، مێرد، کچێك، کچی کوڕێك، کوڕی کوڕێکی لەپاش بەجێ دەمێنێت، ئەوا: باوك شەش یەك دەبات، و دایکیش شەش یەك دەبات، و مێردیش چوار یەك دەبات، و کچیش نیوە دەبات، کوڕی کوڕەکەش کچی کوڕەکە دەکات بە عەصەبە، بەم پێیە ئەصڵی مەسئەلەکە دوازدەیە (١٢)، باوکەکە دوو (٢) دەبات، و دایکەکەش دوو (٢) دەبات، و مێردەکەش سێ (٣) دەبات، و کچەکەش شەش (٦) دەبات، وەك دەبینین مەسئەلەکە دەبێت عەولی تێدا بکرێت، و بکرێتە سیازدە (١٣)، و بەمەش خاوەن بەشەکان هەموو میراتیەکەیان برد، وە هیچ نەمایەوە بۆ کوڕی کوڕ، و کچی کوڕەکە، و لە میراتەکە بێ بەش بوون.

بەڵام لەم کاتەدا ئەم کچی کوڕە ئەگەر کوڕی کوڕی لەگەڵدا نەبوایە ئەوا شەش یەکی دەبرد، و بەشدار دەبوو لە میراتەکە، بۆیە لێرەدا بەم کوڕی کوڕە

دەوترێت برای نەگبەت (الأخ المشؤوم)، چونکە بە هۆی ئەوەوە کچی کوڕەکە لە میرا‌تەکە بێبەش دەبێت.[1]

| ئەصڵی مەسئەلە | | ١٢ ← ١ + | ١٣ |
|---|---|---|---|
| باوك | شەش یەك | ٢ | ٢ |
| دایك | شەش یەك | ٢ | ٢ |
| مێرد | چواریەك | ٣ | ٣ |
| یەك كچ | نیوە | ٥ (؟) | ٦ |
| یەك كوڕی كوڕ | عەصەبە | ٠ | ٠ |
| یەك كچی كوڕ | | | |

(٦) خوشكی باوكی یەكێك بێت یان زیاتر،

ئەویش بە سێ مەرج:

أ. مردوەكە یەك خوشكی دایك و باوكی هەبێت. وەك ئیمامی رەحەبی دەفەرموێت:

و هكذا الأخت مع الأخت التي بالأبوين يا أخي أدلت

ب. كەسێكی لەگەڵدا نەبێت كە بیكات بە عەصەبە.

ت. كەسێكیشی لەگەڵدا نەبێت كە لە میرات بێ بەشی بكات.

(٧) منداڵی دایك، چی نێر بێت یاخود مێ (واتە: براو خوشكی دایكی).

ئەویش بە دوو مەرج وەك ئیمامی رەحەبی دەفەرموێت:

و ولد الأم ينال السدسا والشرط في إفراده لا ينسى

ژمارەیان یەك دانەبێت.

أ. كەسێكیان لەگەڵدا نەبێت كە لە میرات بێ بەشیان بكات.

---

١) القليوبي ١٤٤، الفقه الإسلامي ٧٧٧٨.

## تێبینی:

ئەگەر دوو کەس لە زگماکدا پێکەوە نوسابوون، ئەوا بە دوو میرات بەر دادەنرێن، بەو مەرجەی کە دوو سەریان هەبێت، بەڵام مەرج نیە کە هەموو ئەندامەکانی تریان بە ژمارەی ئەندامەکانی دوو کەس بێت.[1]

## خشتەی ئەو میرات بەرانەی کە خاوەن بەشی دیاریکراون، و جۆری بەش بردنیان و بەڵگەی میرات بردنیان بەو جۆرە

| میرات بەران | جۆری بەش بردن | بەڵگەکان |
|---|---|---|
| (١)مێرد | أ. نیوە: ئەگەر ژنەکەی منداڵی نەبێت<br>ب. چواریەک: ئەگەر ژنەکەی منداڵی هەبێت | أ. وَلَكُمْ نِصْفُ مَا تَرَكَ أَزْوَاجُكُمْ إِن لَّمْ يَكُن لَّهُنَّ وَلَدٌ<br>ب. فَإِن كَانَ لَهُنَّ وَلَدٌ فَلَكُمُ الرُّبُعُ مِمَّا تَرَكْنَ |
| (٢)ژن | أ. چواریەک: ئەگەر مێردەکەی منداڵی نەبێت<br>ب. هەشت یەک: ئەگەر مێردەکەی منداڵی هەبێت | أ. وَلَهُنَّ الرُّبُعُ مِمَّا تَرَكْتُمْ إِن لَّمْ يَكُن لَّكُمْ وَلَدٌ<br>ب. فَإِن كَانَ لَكُمْ وَلَدٌ فَلَهُنَّ الثُّمُنُ مِمَّا تَرَكْتُم |
| (٣)دایک | أ. شەش یەک دەبات، کاتێک کە مردوەکە منداڵ یان کوڕەزای هەبێت، یان مردوەکە دوو براو خوشک یان زیاتری هەبێت.<br>ب. سێ یەکی هەموو میراتەکە دەبات، کاتێک کە مردوەکە هیچ کام لەوانەی سەرەوەی نەبێت.<br>ت. سێیەکی پاشماوەی خاوەن بەشەکان، لە دوو مەسئەلەکەی غەڕاوەین دا. | أ. وَلأَبَوَيْهِ لِكُلِّ وَاحِدٍ مِّنْهُمَا السُّدُسُ مِمَّا تَرَكَ إِن كَانَ لَهُ وَلَدٌ<br>ب. فَإِن كَانَ لَهُ إِخْوَةٌ فَلأُمِّهِ السُّدُسُ<br>ت. فَإِن لَّمْ يَكُن لَّهُ وَلَدٌ وَوَرِثَهُ أَبَوَاهُ فَلأُمِّهِ الثُّلُثُ<br>بڕیاری حەزرەتی عومەر، و ئیجتیهادی زانایان. |

١) التحفة ٣٩٧، النهاية ١٥، المغني ١٠، القليوبي ١٤٠، الجمل ٦ / ٦٩ — ٧٠.

| میرات بەران | جۆری بەش بردن | بەڵگەکان |
| --- | --- | --- |
| (٤)نەنکی باوکی<br>(٥)نەنکی دایکی | شەش یەك دەبات، یەکێك بێت یان زیاتر. | ئیبنو عەباس دەگێڕێتەوە کە حەزرەت شەش یەکی داوە بە نەنك |
| (٦)برای دایکی<br>(٧)خوشکی دایکی | أ. شەش یەك دەبەن، ئەگەر یەك کەس بن، چی نێر، چی مێ<br>ب. سێ یەك دەبەن، ئەگەر لە یەك زیاتر بن، وە نێر و مێشیان یەکسانن. | أ. وَإِن كَانَ رَجُلٌ يُورَثُ كَلاَلَةً أَو امْرَأَةٌ وَلَهُ أَخٌ أَوْ أُخْتٌ فَلِكُلِّ وَاحِدٍ مِّنهمَا السُّدُسُ<br>ب. فَإِن كَانُوَاْ أَكْثَرَ مِن ذَلِكَ فَهُمْ شُرَكَاء فِي الثُّلُثِ |
| (٨)کچ<br>(٩)کچی کوڕ | أ. نیوە دەبات، ئەگەر یەك کچ بێت<br>ب. دووسێیەك دەبەن، ئەگەر لە یەك زیاتر بن. | أ. وَإِن كَانَتْ وَاحِدَةً فَلَهَا النِّصْفُ<br>ب. فَإِن كُنَّ نِسَاء فَوْقَ اثْنَتَيْنِ فَلَهُنَّ ثُلُثَا مَا تَرَكَ |
| (١٠) خوشکی دایك و باوکی<br>(١١) خوشکی تەنها باوکی | أ. نیوە دەبات، ئەگەر یەك خوشك بێت.<br>ب. دووسێیەك دەبەن، ئەگەر لە یەك زیاتر بوون. | أ. يَسْتَفْتُونَكَ قُلِ اللّهُ يُفْتِيكُمْ فِي الْكَلاَلَةِ إِنِ امْرُؤٌ هَلَكَ لَيْسَ لَهُ وَلَدٌ وَلَهُ أُخْتٌ فَلَهَا نِصْفُ مَا تَرَكَ<br>ب. فَإِن كَانَتَا اثْنَتَيْنِ فَلَهُمَا الثُّلُثَانِ مِمَّا تَرَكَ |
| (١٢) باوك<br>(١٣) باپیرە | شەش یەك دەبات کاتێك کە مردوەکە کوڕ یان کوڕی کوڕی هەبێت. | أ. وَلأَبَوَيْهِ لِكُلِّ وَاحِدٍ مِّنْهُمَا السُّدُسُ مِمَّا تَرَكَ إِن كَانَ لَهُ وَلَدٌ<br>ب. عیمرانی کوڕی حوصەین دەگێڕێتەوە کە پیاوێك هاتە خزمەتی حەزرەت و عەرزی کرد: کوڕەکەم مردوە، چەندی میرات لێ دەبەم؟ ئەویش فەرمووی: شەش یەك.<br>ت. کۆدەنگی زانایان لەسەر ئەوەی کە بە نەبوونی باوك، باپیرە میرات دەبات. |

# باسی بێ بەش کردن ( حجب )

سەرەتا دەکرێت بوترێت کە شارەزایی لە بابەتی (حجب ) دا زۆر پێویستە. بۆیە هەندێك لە زانایان فەرموویانە: حەرامە و ناڕەوایە بۆ کەسێك کە شارەزایی لە بابەتی (حجب ) دا نەبێت فەتوا بدات لە (فرائض ) دا. چونکە نازانێت کە کێ بە کێ بەشەکەی کەم دەبێتەوە، یان کێ بە کێ بێ بەش دەبێت، بەمەش یان زیاد یان کەم دەدات بە میرات بەرەکان، یان هەندێك میرات بەری بێ بەش کراو بەشدار دەکات، و هەندێك میرات بەری خاوەن بەش بێ بەش دەکات، بەمەش زوڵم و ستەم ڕوو دەدات.(١)

یەکێك لە شاعیران دەفەرموێت:

أقول ذا الباب عظيم الفائدة — فجدّ فيه تحتوي مقاصده
من لم يفز فيه بسرّ غامض — يحرم أن يفتي في الفرائض

(حجب) (واتە: بێ بەش کردن ) لە شەرعدا بریتیە لەوەی کە: کەسێك هۆی میرات بردنی تێدایە بەڵام بێ بەش دەکرێت لە میراتەکە و هیچی لێ نابات، یان بەشەکەی کەم دەکرێتەوە لە بەشێکی زۆر بۆ بەشێکی کەمتر.

کەواتە بە گوێرەی ئەم پێناسەیە بێ بەش کردن دەبێت بە دوو جۆرەوە:

(١) بەش کەم کردنەوە (حجب النقصان )، کە بەشی میرات بەرێك بەهۆی میرات بەرێکی ترەوە کەم دەبێتەوە، وەك لە باسی (بەشە دیاری کراوەکان) دا بە درێژی باسمان لێوە کردن، وە دەکرێت بە شێوەیەکی کورت بڵێین: لە پێنج کەسدا ڕوو دەدات کە دوو جۆر بەشیان هەیە، بەشێکی زۆر، و بەشێکی کەم، و لە بەشە

١) الدرة البهية٨٠، اللمع ١١٩، ابن قاسم على الرحبية ٧٧، الكنوز ٢٠١ .

زۆرەکە قەدەغە دەکرێن بۆ بەشە کەمەکە، ئەوانیش: [١]

أ. مێرد: لە نیوەوە بۆ چوار یەك بە هۆی منداڵی ژنەکەیەوە.

ب. ژن: لە چوار یەکەوە بۆ هەشت یەك بە هۆی منداڵی مێردەکەیەوە.

ت. کچی کوڕ: لە نیوەوە بۆ شەش یەك بەهۆی کچی مردوەکەوە.

پ. خوشکی باوکی: لە نیوەوە بۆ شەش یەك بەهۆی خوشکی دایك و باوکیەوە.

ج. دایك: لە سێ یەکەوە بۆ:

(١) شەش یەك بەهۆی منداڵی مردوەکە، یان ژمارەیەك لە خوشك و برای مردوەکە.

(٢) سێ یەکی پاشماوە (ثلث الباقي)، وەك لە دوو مەسئەلەکەی (غرّاوین)دا.

## تێبینی:

ئەگەرچی کاتێك کە باس لە بەش کەم کردنەوە دەکرێت، زیاتر بیرمان بۆ لای ئەوە دەچێت کە میرات بەرەکان دوو جۆر بەشی دیاریکراویان هەیە: بەشێکی زۆر، و بەشێکی کەم، و لە بەشە زۆرەکە قەدەغە دەکرێن بۆ بەشە کەمەکە، بەڵاّم هەندێك لە زانایان چەند شێوەیەکی تریشیان باس کردوە کە بە: بەش کەم کردنەوەیان دادەنێن، ئەوانیش: [٢]

(١) کەم بوونەوەی بەشە میراتی کەسێك لە حاڵەتێك کە خاوەن بەشی دیاریکراوە، بۆ حاڵەتێك کە دەبێت بە (عصبة بالغير). بۆ نمونە: کەم بوونەوەی

---

١) الفقه الإسلامي ٧٨١٢، المفصل ١١ / ٤٠٦، الموسوعة / الحجب ٣ / ٤٦، الكنوز ٢٠٢، اللمع ١٢٠ – ١٢١، الدرة ٨١.

٢) الباجوري على الشنشوري ١١٨، الفقه الإسلامي ٧٨١٥، الدرة ٨٠–٨٢، ابن قاسم على الرحبية ٨٠.

بەشە میراتی کچ، لە کاتێکدا کە خاوەن بەشی دیاریکراوە، بۆ کاتێك کە دەبێت بە عەصەبە. کە لە کاتێکدا خاوەن بەشی دیاریکراوە خۆی بە تەنها نیوەی میراتەکە دەبات، بەڵام ئەگەر برایەکی خۆی لەگەڵدا بێت، ئەوا دەبێت بە عەصەبە، ئەو کاتەش بەپێی یاسای (للذكر مثل حظ الأنثيين) میراتەکە دابەش دەکرێت بە سەریاندا.

(٢) کەم بوونەوەی بەشە میراتی کەسێك لە حاڵەتێك کە (عصبة بالنفس)ە، بۆ حاڵەتێك کە خاوەن بەشی دیاریکراوە. بۆ نمونە: کەم بوونەوەی بەشە میراتی باوك یان باپیرە کاتێك کە مردوەکە کوڕ یان کوڕی کوڕی نەبێت، بۆ کاتێك کە مردوەکە یەك لەوانەی هەبێت. کە باوکەکە یان باپیرەکە لە حاڵەتی یەکەمدا هەموو میراتەکە دەبات بە عەصەبەگەرایەتی، بەڵام لە حاڵەتی دوەمدا شەش یەك دەبات.

(٣) کەم بوونەوەی بەشە میراتی کەسێك لە حاڵەتێك کە (عصبة مع الغير)ە، بۆ حاڵەتێك کە (عصبة بالغير)ە. بۆ نمونە: کەم بوونەوەی بەشە میراتی خوشکی دایك و باوکی یان خوشکی تەنها باوکی، کاتێك کە لەگەڵ کچ یان کچی کوڕی مردوەکەدا بن، و برای خۆشیان لەگەڵدا نەبێت کە بیانکات بە عەصەبە، بۆ کاتێك کە برای خۆیان لەگەڵدا بێت. کە ئەو خوشکانە لە حاڵەتی یەکەمدا (عصبة مع الغير)ن، هەرچی لە بەشی کچەکە یان کچی کوڕەکە بمێنێتەوە ئەمان دەیبەن، بەڵام لە حاڵەتی دوەمدا ئەوەی کە لە بەشی کچەکە یان کچی کوڕەکە دەمێنێتەوە، لە نێوان خوشکەکان و براکانیاندا دابەش دەکرێت بەپێی یاسای: (للذكر مثل حظ الأنثيين).

(٢) بێ بەش کردنی تەواوەتی (حجب الحرمان): کە میرات بەر بە تەواوەتی لە میرات بێبەش دەبێت، و هیچ نابات، کە ئەمیش دەکرێت بە دوو جۆرەوە:

أ. حەجب بەهۆی سیفەتێکەوە: وەك کافری، یان کۆیلایەتی، یان (قاتل) واتە بکوژی، جا هەر یەکە لەم سیفەتانە ئەگەر هەبوون لە هەر میرات بەرێکدا ئەوا لە

میرات بێ بەش و مەحرومی دەکات، وەك لە باسی ڕێگرەکانی میراتدا بە درێـژی باسمان کردن.

ب. حەجب بەهۆی کەسەوە یان بەهۆی ئەوەی کە کۆمەڵێك میرات بەر هـەموو میراتەکەیان بردوە و هیچ بۆ میرات بەرێکی تر نەماوەتەوە.

## بۆ نمونە:

(١)

ئەگەر ژنێك بمرێت: مێرد، دایك، برایەکی دایکی، مامێکی لەپاش بـەجێ بمێنێت. ئەوا: مێردەکەی نیـوە دەبـات، و دایکەکـەی سـێ یـەك دەبـات، و بـرا دایکیەکەشی شەش یەك دەبات، و مامیشی عەصەبەیە، کەواتە مەسئەلەکە لـە شەشـە (٦)، مێردەکـە سـێ (٣) دەبـات، و دایکەکـە دوو (٢) دەبـات، و بـرا دایکیەکە یەك (١) دەبات، بەمەش تەواوی شەش بەشەکە (مێرد، و دایك، و برا دایکیەکە ) بردیان، وە مامەکەش بێ بەش بوو لە میرات.

| ئەصڵی مەسئەلە | | ٦ |
|---|---|---|
| مێرد | نیوە | ٣ |
| دایك | سێیەك | ٢ |
| یەك برای دایکی | شەش یەك | ١ |
| مام | عەصەبە | ٠ |

(٢)

ئەگەر پیاوێك بمرێت: دوو کچ، باوك، دایك، کوڕی کوڕێکی لە پاش بەجێ بمێنێت. ئەوا دوو کچەکە دوو سێ یەك دەبەن، و باوکەکە شەش یـەك دەبـات، و دایکەکەش شەش یەك دەبات، کوڕی کوڕەکەش عەصەبەیە، کەواتە مەسـئەلەکە

لە شەشە (٦)، دوو کچەکە چوار (٤) دەبەن، و باوکەکەش یەك (١) دەبات، و دایکەکەش یەك (١) دەبات، بەمەش تەواوی شەش بەشەکە (دوو کچەکە، و باوکەکە، و دایکەکە ) بردیان، وە کوڕەکەش بێ بەش بوو لە میرات.

| | | |
|---|---|---|
| ئەصڵی مەسئەلە | | ٦ |
| دوو کچ | دووسێیەك | ٤ |
| باوك | شەش یەك | ١ |
| دایك | شەش یەك | ١ |
| یەك کوڕی کوڕ | عەصەبە | ٠ |

## دوو جیاوازی سەرەکی لە نێوان حەجب بەهۆی سیفەتەوە، و حەجب بەهۆی کەسەوە [1]

(١) ئەو کەسەی کە حەجب دەبێت بەهۆی سیفەتەوە، مانایەك لە خۆیدا هەیە وەهای لێ دەکات کە بێبەش بێت لە میرات، بەڵام ئەو کەسەی کە حەجب دەبێت بەهۆی کەسێکی ترەوە، هیچ مانایەکی وەهای تێدا نیە کە وەهای لێ بکات بێبەش بێت لە میرات، بەڵکو کەسێکی تر هەیە کە لە ئەم لەپێش ترە بۆ مردوەکە، بۆیە بە بوونی ئەم کەسە، ئەویش لە میراتەکە بێبەش دەبێت. کەواتە دەڵێین: ئەو کەسەی کە حەجب دەبێت بەهۆی سیفەتەوە، کەسایەتی میرات بردنی لەدەست داوە، بەهۆی ئەو سیفەتەی کە تێیدایە، بەڵام ئەو کەسەی کە حەجب دەبێت بەهۆی کەسێکی ترەوە، کەسایەتی میرات بردنی تێدایە، بەڵام کەسێکی تری لەگەڵدایە کە لە ئەم لەپێش ترە.

---

١) الفقه الإسلامي ٧٨١١، المجموع ١٣١، اللمع ١٢١، الموسوعة / الحجب ٣ / ٤٦.

(٢) ئەو کەسەی کە حەجب دەبێت بەهۆی سیفەتەوە، وەها دادەنرێت کە هەر بوونی نیە. کەواتە بەهۆی ئەمەوە هیچ کەسێك بەشە میراتی کەم ناکات، وە هیچ کەسیش لە میرات بێبەش نابێت، بەڵکو بوون و نەبوونی وەك یەك وەهایە.
بەلاّم ئەو کەسەی کە حەجب دەبێت بەهۆی کەسێکی ترەوە، ئەگەر چی خۆی لە میرات بێبەش دەبێت، بەلاّم بە بوونی ئەم دەکرێت کەسانی تریش بەشە میراتیان کەم بکات. وەك لە کۆتایی ئەم باسەدا بە نمونەوە ڕوونی دەکەینەوە.

جا ئەوەی کە دەمانەوێت لێرەدا باسی لێوە بکەین ئەو میرات بەرانەیە کە بە تەواوەتی بێ بەش دەبن لە میرات بەهۆی بوونی میرات بەرێکی ترەوە، واتە (حجب الحرمان ) بە هۆی کەسەوە.

سەرەتا دەکرێت بڵێین: هەندێك میرات بەر هەیە بە کۆدەنگی زانایان یاسایەکیان بۆ دانراوە کە بە هیچ کەسێك بێ بەش ناکرێن لە میرات، یاساکەش ئەمەیە: هەر میرات بەرێك ڕاستەوخۆ — بە خۆی -- بگات بە مردویەك، بێجگە لە پیاو، و ژنی کۆیلە ئازاد کەر (المعتق و المعتقة)، بە هیچ کەسێك لە میرات بێ بەش ناکرێن. ئەوانیش سێ نێرینە و سێ مێیینەن: کوڕ و کچ، مێرد و ژن، باوك و دایك، [1]

وەك شێخی نۆدی دەفەرموێت:

لا يُحجبُ الأبُ، وأمٌ، وولدْ  وزوجةٌ أيضا، وزوجٌ بأحدْ

بەڵکو هەر کەسێکیش کە بەهۆی ئەمانەوە بگات بە مردوەکە بە بوونی ئەمان بێ بەش دەبێت وەك لەمەولا ڕوونی دەکەینەوە:

---

١) الشنشوري ١٢٠، الشرواني٣٩٩، الفقه الإسلامي ٧٨١٣، الموسوعة / الحجب ٣ / ٤٦، شرح الرحبية ٧٦، الدرة ٨٢ — ٨٣.

# بیٚ بەش بوونی نیٚرینە

(١) کوڕی کوڕ. بیٚ بەش دەبیٚت لە میرات بە: کوڕ (واتە: هەر کاتیٚك مردوەکە کوڕی هەبیٚت کوڕی کوڕ هیچ نابات، ئەگەر چی ئەو کوڕە باوکی کوڕی کوڕەکەش نەبیٚت بەڵکو مامی بیٚت )، وە کوڕی کوڕی کوڕ بیٚ بەش دەبیٚت بە کوڕی کوڕ، وە هەربەم شیٚوە. وەك شیٚخ مەعروفی نۆدی دەفەرمویٚت:

بل يحجب ابن الابن بابن الصلب    أو ابن ابن فوقه في القرب

(٢) باپیر. بیٚ بەش دەبیٚت لە میرات بە: باوك (واتە بە بوونی باوك باپیر هیچ نابات ). وەك شیٚخی نۆدی دەفەرمویٚت:

والجد لا يحجبه إلاّ ذكر    وقع بينه و بين من عبر

(٣) برای باوك و دایکی. بیٚ بەش دەبیٚت لە میرات بە هەر یەك لەم سیٚ کەسە:

أ. باوك.

ب. کوڕ.

ت. کوڕی کوڕ بابەرەو خوارتریش بڕوات (بۆ کوڕی کوڕی کوڕ ). وەك شیٚخی نۆدی دەفەرمویٚت:

والأخ من أب وأمّ احتجب    بالابن، وابن الابن أيضا وبأب

(٤) برای باوکی. بیٚ بەش دەبیٚت لە میرات بە هەر یەك لەم پیٚنج کەسە:

أ. باوك.

ب. کوڕ.

ت. کوڕی کوڕ.

پ. برای دایك و باوکی. وەك شیٚخی نۆدی دەفەرمویٚت:

والأخ من أب بهؤلا حجب    وبأخ لأبوين ينتسب

ج. خوشکی دایك و باوکی کە کۆببێتەوە لەگەڵ کچدا، یان لەگەڵ کچی کوڕدا (چونکە لەم کاتەدا کچەکە یان کچی کوڕەکـە نیـوە دەبـات، و خوشـکە بـاوك و دایکیەکەش نیوەکەی تر بە عـەصەبە گەرایەتی دەبات وەك لە باسـی عـەصـەبەی بالغیر دا ڕوونی دەکەینەوە، و ئیتر هیچ بۆ برا باوکیەکە نامێنێتەوە ).

(٥) برای دایکی بێ بەش دەبێت لە میرات بە هەر یەك لەم سێ کەسە:

أ. باوك.

ب. باوکی باوك با بەرەو ژوورتریش بێت.

ت. منداڵ و نەوەی مردوەکە (کاتێك کە میرات بەر بن )، وەکو: کوڕ، و کوڕی کوڕ، و کچ، و کچی کوڕ با بەرەو خوارتریش بێت. وەك شێخی نۆدی دەفەرموێت:

والأخ من أمّ عن الإرث يُصدّ بولدٍ، أو والدٍ أيضا، وجدّ

(٦) کوڕی برای دایك و باوکی. بێ بەش دەبێت لە میرات بە هەر یەك لەم پێنج کەسە:

أ. باوك.

ب. باپیر.

ت. کوڕ.

پ. کوڕی کوڕ با بەرەو خوارتریش بێت.

ج. برای دایك و باوکی.

ح. برای تەنها باوکی.

(٧) کوڕی برای تەنها باوکی. بێ بەش دەبێت لە میرات بە:

أ. ئەو شەش کەسەی کە لە خاڵی شەشەمدا باسمان کردن.

ب. کوڕی برای دایك و باوکی.

(٨) کوڕی کوڕی برای دایك و باوکی. بێ بەش دەبێت لە میرات بە: کوڕی برای تەنها باوکی.

(٩) مامی دایك و باوکی. بیّ بەش دەبیّت لە میرات بە:
أ. ئەو حەوت کەسەی کە لە خالّی شەشەم، و حەوتەمدا باسمان کردن.
ب. کوڕی برای باوکی.
(١٠) مامی باوکی. بیّ بەش دەبیّت لە میرات بە:
أ. ئەو هەشت کەسەی کە لە خالّی شەشەم، و حەوتەم، و هەشتەمدا باسمان کردن.
ب. مامی دایك و باوکی.
(١١) کوڕی مامی دایك و باوکی. بیّ بەش دەبیّت لە میرات بە:
أ. ئەو نۆ کەسەی کە لە خالّی شەشەم، و حەوتەم، و هەشتەم و نۆیەمدا باسمان کردن.
ب. مامی تەنها باوکی.
(١٢) کوڕی مامی تەنها باوکی. بیّ بەش دەبیّت لە میرات بە:
أ. ئەو دە کەسەی کە لە خالّی شەشەم و حەوتەم، و هەشتەم و نۆیەم و دەیەمدا باسمان کردن.
ب. کوڕی مامی دایك و باوکی.

لە خالّی شەشەمەوە هەتاوەکو ئیّرە شیّخ مەعروفی نۆدی لە بارەیانەوە دەفەرمویّت:

وابن الشقيق بشقيق احتجب ... وابن، و إبنه، و بالجدّ، وأب
وبأخٍ للأب، فهو أقرب ... وابنُ أخٍ لوالدٍ يُحتجبُ
بهؤلا، و ابنِ الشقيق، و احظلا ... عما لأمٍّ وأبٍ بهؤلا
وابن أخٍ منفسخٍ عن أمّ ... ولأبٍ بهؤلا، وعم
لأبوين، واحجب ابنَ عم ... منتسبٍ لوالدٍ وأمّ
بهؤلاءِ، وبعم لأب ... أمّا ابنُ عم لأب فلْيُحجبِ
بهؤلاء الرّهط، و ابنِ عم ... منتسبٍ لوالدٍ وأمّ

(١٣) پیاوێك کە ئازادکەری کۆیلە بێت بێ بەش دەبێت لە میرات بە: هەموو ئەو کەسانەی کە عەصەبەی نەسەبی کۆیلەکەن.

## بێ بەش بوونی مێیینە

(١) کچی کوڕ، یەکێك بێت یان زیاتر. بێ بەش دەبێت لە میرات بە:

آ. کوڕ.

ب. دوو کچ یان زیاتری مردوەکە، کاتێك کە کەسێکی لەگەڵدا نەبێت کە بیکات بە عەصەبە، بەڵام ئەگەر کرا بە عەصەبە، ئەوا: لە پاش ئەوەی کە دوو کچەکە لە سێ بەش دوو بەشی میراتەکە دەبەن، ئەوەی دەمێنێتەوە ئەو کچی کوڕە لەگەڵ ئەوانەی کە کردویانە بە عەصەبە گشتی دەبەن بە یاسای (للذكر مثل حظ الأنثيين)، وە ئەو کەسەی کە کچی کوڕەکەی کردوە بە عەصەبە پێی دەوترێت برای پیرۆز (الأخ المبارك) [1]، چونکە ئەگەر ئەم نەبێت، کچی کوڕەکە میرات نابات، و بێبەش دەبێت.

بۆ نمونە: کەسێك دەمرێت: دوو کچ، و کچی کوڕێك، و کوڕی کوڕێکی (برای کچی کوڕەکە بێت، یان ئامۆزای) لە پاش بەجێ دەمێنێت. ئەوا: دوو کچەکە دووسێیەك دەبەن، و ئەصڵی مەسئەلەکەش لە سێ یە، بەمەش یەك بەش دەمێنێتەوە بۆ کچی کوڕەکە و کوڕی کوڕەکە، جا لەبەر ئەوەی کە دابەش ناکرێت بە سەریاندا، بۆیە بۆ ساغ کردنەوەی مەسئەلەکە دێین ئەصڵی مەسئەلەکە لێکدانی ژمارە سێ دەکەین، بەمەش ئەصڵی مەسئەلەکە دەبێت بە (نۆ)، ئێستا دوو کچەکە شەش بەش دەبەن، و سێ بەشەکەش کە ماوەتەوە بە عەصەبەگەرایەتی دەمێنێتەوە بۆ کوڕی کوڕەکە و کچی کوڕەکە، بەپێی یاسای:

---

١) القليوبي١٤٣، الفقه الإسلامي ٧٧٧٨، اللمع ١٢٣، الكنوز ٢٠٥.

(للذكر مثل حظ الأنثيين). جا لێرەدا بەم کوڕی کوڕە دەوترێت برای پیرۆز و بەفەڕ، چونکە ئەگەر ئەو نەبوایە، ئەوا کچی کوڕەکە بێ بەش دەبوو لە میرات.

(٢) خوشك هەر جۆرێك بێت وەك برای خۆی حسابی بۆ دەکرێت، واتە:

أ. خوشکی باوك و دایکی بەو کەسانە بێ بەش دەبێت کە برای دایك و باوکیان بێ بەش دەکرد، کە ئەوانیش: باوك، و کوڕ، و کوڕی کوڕ بوون.

ب. خوشکی تەنها باوکی بەو کەسانە بێ بەش دەبێت کە برای تەنها باوکیان بێ بەش دەکرد، کە ئەوانیش: باوك، و کوڕ، و کوڕی کوڕ، و برای دایك و باوکی بوون، وە هەروەها خوشکی باوکی بێ بەش دەبێت بە: دوو خوشکی دایك و باوکی یان زیاتر، تەنها کاتێك نەبێت کە ئەو خوشکە باوکیانە نێرینەیان لەگەڵدا بێت (لەم کاتەدا بێ بەش نابن، بەڵکو نێرینەکان دەیانکەن بە عەصەبە، و بەم نێرینانەش دەوترێت برای بە فەڕ و بەرەکەت)، وە هەروەها خوشکی باوکی بێ بەش دەبێت بە: خوشکی دایك و باوکی کە کۆ ببێتەوە لەگەڵ کچی مردوەکەدا، یان لەگەڵ کچی کوڕی مردوەکەدا (چونکە لەم کاتەدا کچەکە یان کچی کوڕەکە نیوە دەبات، و خوشکە دایك و باوکی‌یەکە نیوەکەی تر بە عەصەبەگەرایەتی دەبات، ئیتر هیچ بۆ ئەم نامێنێتەوە).

ئیمامی رەحەبی لەم بارەیەوە دەفەرموێت:

| | |
|---|---|
| ثم بنات الابن يسقطن متى | حاز البنات الثلثين يا فتى |
| إلا إذا عصبهن الذكر | من ولد الابن على ما ذكروا |
| ومثلهن الأخوات اللاتي | يدلين بالقرب من الجهات |
| إذا أخذن فرضهن وافيا | أسقطن أولاد الأب البواكيا |
| وإن يكن أخ لهن حاضرا | عصبهن باطنا وظاهرا |

ت. خوشکی تەنها دایکی بەو کەسانە بێ بەش دەبێت کە برای تەنها دایکیان بێ بەش دەکرد، کە ئەمانەن: باوك، و باوکی باوك با بەرەو ژوورتریش بێت، و بە:

مندالْ و نەوەی مردوەکە (کاتێك کە میرات بەر بن )، وەکو: کـوڕ، و کـوڕەزا، و کچ با بەرەو خوارتریش بێت.

(٣) نەنکی دایکی — واتە دایکی دایك -- بێ بەش دەبێت لە میرات بە:

أ. دایك.

ب. نەنکی دایکیـیەك کە نزیك تربێت لە مردوەکەوە. بۆ نمونە: دایکی دایکـی دایك بە دایکی دایك بێ بەش دەبێت.

(٤) نەنکی باوکی — واتە دایکی باوك -- بێ بەش دەبێت لە میرات بە:

أ. باوك.

ب. دایك.

ت. نەنکی باوکیـیەك کە نزیك تربێت لە مردوەکەوە. بۆ نمونـە: دایکـی بـاوك دایکی دایکی باوك، و دایکی باوکی باوك بێ بەش دەکات.

پ. نەنکانی دایکی ئەگەر لە نەنکە باوکیـیەکان نزیك تر بوون لە مردوەکەوە. بۆ نمونە: دایکی دایك دایکی دایکـی بـاوك، و دایکـی بـاوکی بـاوك بـێ بـەش دەکات.

تێبینی: نەنکانی نزیکی باوکی نـەنکانی دووری دایکـی بـێ بـەش ناکـەن، بەڵکو لە شەش یەکدا دەبنە هاوبەشی یەکتری. ئیمامی رەحەبی دەفەرموێت:

وإن تـــكن قـــربى لأم حجبـــت أم أب بعـــدى، وسدســـا ســـلبت

وإن تـــكن بـــالعكس، فـــالقولان في كتـــب أهـــل العلـــم منـــصوصان

لا تسقط البعدى على الـصحيح واتـــفق الجـــلّ علـــى التـــصحيح

(٥) ژنێك کە ئازادکەری کۆیلە بێت، وەك پیاوێك وایە کە ئازادکەری کۆیلە بێت، کەواتە ئەویش بێ بەش دەبێت بە: هەموو ئـەو کەسـانەی کـە عـەصـەبەی نەسەبی کۆیلەکەن.

# بێ بەش بوونی عەصەبە

عەصەبە بێ بەش دەبێت ئەگەر خاوەن بەشە دیاری کراوەکان هەموو میراتەکەیان برد، وەك لە باسی حەجبی حیرماندا بە نمونەوە ڕوونمان کردەوە، لەم بارەوە شێخی نۆدی دەفەرموێت:

وعصبةٌ فروضها مستوعبة      تركةٍ حاجبةٌ للعصبة

تەنها لە کاتێکدا نەبێت کە ئەو عەصەبەیە ببێت بە خاوەن بەشی دیاری کراو وەك لە مەسئەلەی (مشرّكة) دا ڕوونی دەکەینەوە.

**چەند ئاگاداریەك:**

(١) وەك یاسایەکی گشتی بۆ حەجبی حیرمان دەڵێین:

أ. هەر کەسێك بەهۆی کەسێکی ترەوە بگات بە مردوویەك، هەر بەو کەسە لە میرات بێ بەش دەبێت، تەنها برا و خوشکی دایکی نەبێت کە بەهۆی دایکەوە دەگەن بە مردوەکە، کەچی بە دایکەکەش بێ بەش نابن. بە یەکدەنگی زانایان.[1]

وەك شێخی نۆدی دەفەرمێت:

إذ كــلّ من إدلاؤه بالــغير      صار به محتجبا عن خير
وخصّ من عموم هذا الضابط      ولد أمّ، فهو غير ساقط

سەرەڕای ئەوەش ئەمان ئەگەر ژمارەیان لە یەك زیاتر بوو، ئەوا بەشی دایکەکە کەم دەکەنەوە لە سێیەکەوە بۆ شەش یەك، وەك لە پێشەوە باسمان کرد.

هەروەها بەلای مەزهەبی ئیمامی ئەحمەدەوە، دایکی باوك (یان دایکی باپیرە)، بە بوونی باوکەکە (یان باپیرەکە) بێبەش نابێت، لەگەڵ ئەوەشدا کە لە ڕێگەی ئەوەوە دەگات بە مردوەکە.

---

١) المغني١١، الفقه الإسلامي٧٨١٣، المجموع ١٣٢/١٧، الإعانة ٢٣٣، المفصل ٤٠٦، اللمع ١٢١، الموسوعة / الحجب ٣ / ٤٦.

یەکێك لە شاعیران دەفەرموێت [١]:

والجدةْ أمّ الأب عندنا ترث وابنها حيٌ، به لا تكترث

ب.هەر کەس کە پلەی خزمایەتیەکەی نزیك تر بێت لە مردوەکەوە، ئەو کەسە بێ بەش دەکات لە میرات کە پلەی خزمایەتیەکەی لە ئەم دوور ترە، وەك کوڕ، کە کوڕەزا بێ بەش دەکات، ئەگەرچی باوکیشی نەبێت، بەڵکو مامی بێت.

ت.ئەگەر دوو کەس لە یەك پلەی خزمایەتیدا بن بەڵام خزمایەتی یەکێکیان بەهێزتر بێت لەوی تریان، ئەوا بەهێزەکە بێ هێزەکە بێ بەش دەکات، وەك برای دایك و باوکی کە برای باوکی بێ بەش دەکات. [٢]

(٢) هەر کەسێك کە بەهۆی یەکێك لە ڕێگرەکانی میراتەوە وەك: کوشتن، کافر بوون، کۆیلایەتی، میرات وەرنەگرێت، ئەوە بوون و نەبوونی وەك یەك وەهایە، کەواتە ناتوانێت هیچ میرات بەرێکی تر بێ بەش بکات، یان بەشی کەم بکاتەوە، وە هەروەها هەر میراتبەرێکیش کە بەهۆی میرات بەرێکی ترەوە بێ بەش کرابێت، ئەویش ناتوانێت هیچ میرات بەرێك بێ بەش بکات، یان بەشی کەم بکاتەوە [٣]، وەك شێخی نۆدی دەفەرموێت:

فمن بإرث لم يكن يُمتّعُ فحجبُه لغيره ممتنعُ

بەڵام چەند شێوەیەك هەیە کە جیاکراونەتەوە لەم یاسایە، تیایاندا کەسێك لە میرات بێبەش کراوە، لە هەمان کاتدا ئەویش دەبێت بە هۆی کەمکردنەوەی بەشی میرات بەرێکی تر، بۆ نمونە:

---

٢) الكنوز الملية ١٨٧.

١) الفقه الإسلامي٧٨١٣، المجموع ١٣٢/١٧، المفصل ٤٠٦/١١، الموسوعة/ الحجب ٣/ ٤٧، اللمع ١٢٢.

٢) الشنشوري مع الباجوري ١١٩، النهاية ١٨، المغني ١٣، الفقه الإسلامي٧٨١١، الجمل ٧١/٦، التحفة ٦ / ٤٠١، الكنوز ٢٠٨، الأنوار ٢ / ٤، الفقه المنهجي ٢ / ٣١١ — ٣١٢.

أ. پیاوێك بمرێت، دایك، و باوك، ژمارەیەك خوشك و برای لەپاش بەجێ بهێنێت، ئێستا دەبینین کە خوشك و براکان بە باوکەکە بێ بەش دەبن، وە لە هەمان کاتدا بەشی دایکەکە کەم دەکەنەوە لە سێ یەکەوە بۆ شەش یەك، وەك لە پێشەوە باسمان کرد.

ب. ژنێك بمرێت، دایك، و باپیر، دوو برای دایکی، یان دوو خوشکی دایکی لەپاش بەجێ بهێنێت، ئێستا دەبینین کە دوو برا دایکیەکە، یان دوو خوشکە دایکیەکە بە باپیرەکە بێ بەش دەبن، لە هەمان کاتدا بەشی دایکەکە کەم دەکەنەوە لە سێ یەکەوە بۆ شەش یەك.

لەم بارەیەوە یەکێك لە شاعیران دەفەرموێت:

ومـــن کـــان محجوبـــا بـــوصف فـــلا — تکن بـه حـاجبا أصلا أتـاك ممثّـلا
بـمیت لـــه ابـن کافـــر، ثـم لابـــنه — من المسلمین ابن، و عـم أخـي الـبلا
فلابـــن ابـــنه کـــلّ الـتراث، و عمـــه — لـه مـن تـراث الـمیت دمـع تهطّـلا
وإن کـان في الـوارث حاجـب حاجـب — حوی ما حواه، فاعتبر صـافیا، خـلا
کالإخوة صدوا الأم عن نصف ثلثهـا — و أحـرزه مـــن دون کـل أب عـــلا

## مەسئەلەی (مشرّكة)

بریتیە لەو مەسئەلەیە کە ژنێك بمرێت: مێرد، و دایك یان داپیرە، و دوو یان زیاتر براو خوشکی دایکی، و برایەکی دایك و باوکی یان زیاتری لەپاش بەجێ بێنێت، جا ئیتر ئەو برا دایك و باوکیە خوشکی دایك و باوکی لەگەڵدا بێت یان نا.

ئێستا:

مێردەکە نیوە دەبات، و دایکەکە شەش یەك دەبات، و برا و خوشکە دایکیەکان سێ یەك دەبەن، و برا دایك و باوکیەکانیش عەصەبەن، بەمەش ئەصڵی مەسئەلەکە لە شەشە (٦)، سێ (٣) بۆ مێردەکە، یەك (١) بۆ دایکەکە، دوو (٢) بۆ برا و خوشکە دایکیەکان، بەمەش هیچ نەمایەوە بۆ برا دایك و باوکیەکان.

بەلاّم لێرەدا برا دایك و باوکیەکە دێتە پێشەوە، و دەڵێت: خۆ من بەڵێ لەگەڵ برا و خوشکە دایکیەکاندا ڕاستە کە باوکمان جیاوازە، بەلاّم خۆ دایکمان یەك دایکە، ئیتر بۆچی ئەوان بەش ببەن، و من هیچ نەبەم!

بۆیە کاتێك کە ئەم مەسئەلەیە برایە خزمەتی حەزرەتی عومەر (خوای لێ ڕازی بێت)، ویستی برا دایك و باوکیەکان بێ بەش بکات، ئیتر ئەوانیش وتیان: وەها دابنێ کە باوکمان بەردێکە، و فڕێدراوەتە ناو ئەو ئاوەوە، یان وا دابنێ کە باوکمان کەرێك بوە!، خۆ دایکمان لەگەڵ برا، و خوشکە دایکیەکاندا یەك دایکە (ئیتر بۆچی ئەوان بەشیان هەیە، و ئێمە هیچ)؟! جا حەزرەتی عومەر قسەکەیانی پێ جوان بوو، هەر لەبەر ئەوە بە خزمایەتی دایکیان ئەمانیشی بەشدار کرد لە بەشی برا و خوشکە دایکیەکان. ئیمامی ڕەحەبی دەفەرموێت:

وإن تجد زوجا، وأما ورثا      وإخوة للأم حازوا الثلثا

وإخـــوة أيـــضا لأم وأب واسـتغرقوا المـال بفـرض النـصب
فـاجعلـــهُمْ كلّــهمْ لأم واجعـل أبـاهم حجـرا في الـيم
واقسم علـى الإخـوة ثلث التركـة فـهـــذه الـمـــسألة المـــشتركة

ئیتر بە گوێرەی بڕیارەكەی حەزرەتی عمر بوون بە هاوبەشی برا و خوشكە دایكیەكان لە سێ یەكەكەدا، و بەبێ جیاوازی لە نێوان نێر و مێ دا سێ یەكەكە دابەش دەكرێت بە سەریاندا بە پێی ژمارەی سەرەكانیان، بەمەش ژمارەی ئەو كەسانەی كە سێ یەكەكەیان دەكەوێت بوو بە سێ كەس، و سێیەكەكەش كە دوو (٢) بوو دابەش ناكرێت بەسەر سێ دا، بۆیە بۆ ساغ كردنەوەی مەسئەلەكە دەبێت ئەصڵی مەسئەلەكە لێكدانی سێ (٣) بكەین، ئەو كاتە ئەصڵی مەسئەلەكە دەبێت بە هەژدە (١٨)، ئەوجا لەم هەژدەیە، نۆ (٩) بۆ مێردەكە، و سێ (٣) بۆ دایكەكە، و شەش (٦) بۆ دوو برا، یان دوو خوشكە دایكیەكە، بە هاوبەشی لەگەڵ برا دایك و باوكیەكە، بەمەش هەر یەكەیان دوو (٢) بەشیان دەكەوێت، بە بێ جیاوازی لە نێوان نێر و مێ (چونكە ئەوەی كە دەیان كەوێت لەڕێگەی بەش بردنەوەیە، نەك لە ڕێگەی عەصەبەگەرایەتی ). هەروەها ئەم مەسئەلەیە پێشی دەوترێت: الحجريّة، اليميّة، الحماريّة.

جا لەم مەسئەلەیەدا هەم هاوەڵانی حەزرەت و هەم زانا موجتەهیدەكانیش لەناو خۆیاندا بون بە دوو كۆمەڵەوە:[1]

(١) كۆمەڵێكیان دەفەرموون: یاسایەك هەیە كە دەڵێت: هەركاتێك خاوەن بەشەكان هەموو میراتەكەیان برد، و هیچ نەمایەوە بۆ عەصەبەكان، ئەوا عەصەبەكان بێبەش دەبن لە میرات، بۆیە پێیان وایە كە برا دایك و باوكیەكان

١) الفقه الإسلامي ٧٨٠٧، الشنشوري مع الباجوري ١٢١-١٢٣، الكنوز ١٩٤–١٩٥، الدرة ٩١.

لەم مەسئەلەیەدا لە میرات بێبەش دەبن بەپێی ئەو یاسایە. ئەمە بۆچوونی ئەم ئیمامانەیە: عومەر (فەرموودەی یەکەمی)، و عەلی، ئیبنو عەباس (یەك لە فەرموودەکانی)، و ئیبنو مەسعود (فەرموودە مەشهوورەکەی)، و ئەبو موسای ئەشعەری، و ئوبەی کوڕی کەعب، و ئەبو حەنیفە، و ئەحمەد، و زوفەری کوڕی هوزەیل، و ئیبنو جەریر، و ئەبو داود، و ئیسحاق، و مەزەنی. بۆیە ئەم ئیمامانە پێیان وایە کە برا دایك و باوکیەکان نابن بە هاوبەشی برا و خوشکە دایکیەکان، بەڵکو بێبەش دەبن لە میرات.

(٢) کۆمەڵێکی تریان دەفەرموون: بەڵێ ئەو یاسایە هەیە، بەڵام وەك ئیستیسنایەك لەو یاسایە، لێرەدا برا دایك و باوکیەکان لە میرات بێبەش ناکرێن، بەڵکو دەکرێن بە هاوبەشی برا و خوشکە دایکیەکان. ئەمەش بۆچوونی ئەم ئیمامانەیە: عومەر (فەرموودەی دوەمی)، عوثمان، و زەید، و ئیبنو عەباس (فەرموودە مەشهوورەکەی)، و ئیبنو مەسعود (یەك لە فەرموودەکانی)، و شورەیح، و ثەوری، سەعیدی کوڕی موسەیەب، و عومەری کوڕی عەبدولعەزیز، و ئیبنو سیرین، ئەوزاعی، و أحمد، و مالیك، و ئەبو یوسف، و موحەمەد، و شافیعی (فەرموودە مەشهوورەکەی). بۆیە ئەم ئیمامانە پێیان وایە کە برا دایك و باوکیەکان دەبن بە هاوبەشی برا و خوشکە دایکیەکان، و بێبەش ناکرێن لە میرات.

خشتەی مەسئەلەکە بە پێی ڕای کۆمەڵی یەکەم (بێبەش دەبن)

| میرات بەرەکان | بەشەکانیان | ئەصڵی مەسئەلە | سەهمەکان |
|---|---|---|---|
| دایك | شەش یەك | ٦ | ١ |
| مێرد | نیوە | | ٣ |
| برا و خوشکی تەنها دایکی | سێیەك | | ٢ |
| برای باوك و دایکی | عەصەبە | | ٠ |

خشتەی مەسئەلەکە بە پێی ڕای کۆمەڵی دوەم (دەبنە هاوبەش)

| میرات بەرەکان | بەشەکانیان | ئەصڵی مەسئەلە | سەهمەکان |
|---|---|---|---|
| دایك | شەش یەك | ٦ | ١ |
| مێرد | نیوە | | ٣ |
| برا و خوشکی تەنها دایکی | سىٚیەك | | ٢ |
| برای باوك و دایکی | عەصەبە | | |

چەند تێبینیەك:

(١) ئەگەر لەم مەسئەلەیەدا لە جێگەی برا دایك و باوکیەکان، دوو خوشکی دایك و باوکی، یان دوو خوشکی تەنها باوکی هەبوونایە، ئەوا: ئەم خوشکانە بەشی دیاری کراوی خۆیان دەبرد کە: دووسىٚیەکی میراتەکەیە، ئەو کاتەش مەسئەلەکە پێویستی بە عەول تێدا کردن دەبوو، بەم مەسئەلەیەش دەوترێت: أم الفروخ، وەك لە باسی عەولدا بە نمونەوە ڕوونی دەکەینەوە.

(٢) ئەگەر لەم مەسئەلەیەدا لە جێگەی برا باوك و دایکیەکە، برایەکی تەنها باوکی هەبوایە، ئەوا هیچ میراتی نەدەبرد، چونکە هیچی بۆ نەدەمایەوە، وە نابێت بشکرێت بە هاوبەشی برا و خوشکە دایکیەکان، چونکە لەگەڵ ئەواندا نە لە باوك، و نە لە دایك دا هاوبەش نین. وەك شێخی نۆدی دەفەرموێت:

زوج، وأمّ، ولـــــدا أمّ، أخُ — لأبويـــــن. فيـــــشارك الأخ
ولـــدي الأمّ، و لـــو كـــان لأب — لأوجبـــوا حرمانـــه مـــن النـــشب

(٣) ئەگەر ئەم برا تەنها باوکیە خوشکێك یان چەند خوشکێکی تەنها باوکی لەگەڵدا بێت، ئەوا دەبێت بە هۆی ئەوەی کە ئەم خوشکانەش هیچ میرات نەبەن، بەڵام ئەگەر ئەم خوشکە تەنها باوکیانە برا تەنها باوکیەکەیان لەگەڵدا نەبێت، ئەوا ئەگەر یەك کەس بێت نیوە دەبات، و ئەگەرلە یەك زیاتر بن،

دووسێیەك دەبەن، بۆیە بەم برا باوکیە لەم مەسئەلەدا دەوترێت: برای نەگبەت (الأخ المشؤوم ) [١]

جا وەك لەنموونەکەدا دەردەکەوێت، لەم مەسئەلەیەدا پێنج مەرج پێویستە:[٢]

(١) دەبێت مەسئەلەکە میرات بەرێکی تێدا بێت، کە شەش یەك ببات، وەك دایك، و داپیرە.

(٢) منداڵی دایکی، دەبێت لە یەك زیاتر بن، جیاوازی نیە لەوە دا کە نێرینە بێت، یان مێیینە، یان نێرینە و مێیینە بەیەکەوە، چونکە: ئەگەر یەك کور، یان یەك کچ بێت، ئەوا: خاوەن بەشەکان هەموو میراتەکە نابەن، بەڵکو پاشماوەیان لێ دەمێنێتەوە بۆ برا دایك و باوکیەکان.

(٣) دەبێت منداڵە دایك و باوکیەکان، نێرینەیان تێدا بێت، جا ئیتر مێیینەیان لەگەڵ دا بێت، یان نا، چونکە ئەگەر بە تەنها مێیینە بن، ئەوا: بەشی دیاری کراوی خۆیان هەیە، و بێ بەش نابن، بەڵکو بەشەکەی خۆیان دەبەن، و ئەگەر ئەصڵی مەسئەلەکەش پێویست بە زیاد کردن (عول) بکات، زیادی دەکەین.

(٤) ئەو برا و خوشکانەی کە دەبنە هاوبەش دەبێت براو خوشکی دایك و باوکی بن.

(٥) دەبێت مەسئەلەکە مێردی تێدابێت، واتە مردوەکە دەبێت ژن بێت، و مێردەکەی مابێت.

---

١) القليوبي ١٤٤، الفقه الإسلامي ٧٧٧٨، منهاج الطالبين.

١) الأنوار ٢ / ٤.

# باسی لەیەکچوونی هەندێك لە میرات بەران

(١) کوڕی کوڕ وەکو کوڕ وایە لە چەند بڕیارێکدا:

أ. ئەگەر بەتەنها خۆی بێت هەموو میراتەکە دەبات بە عەصەبەگەرایەتی.

ب.هەموو ئەوانەی کە بە کوڕ بێ بەش دەبوون بە هەمان شێوە بە کوڕی کوڕیش بێ بەش دەبن.

بەلاّم لەوەدا جیاوازن لە یەك کە: ئەگەر کوڕی کوڕ کۆ بویەوە لەگەڵ کچ دا، ئەوا بە پێی یاسای (للذكر مثل حظ الأنثيين) میرات نابەن، بەڵکو کچەکە نیوە دەبات، کوڕی کوڕەکەش نیوەکەی کە ماوەتەوە بە عەصەبەگەرایەتی دەیبات، چونکە ئەو یاسایە بۆ کاتێکە کە کچەکە بە کوڕەکە بوو بێت بە عەصەبە.

(٢) باپیرە وەکو باوك وایە لە چەند بڕیارێکدا:

أ. ئەگەر بەتەنها خۆی بێت هەموو میراتەکە دەبات بە عەصەبەگەرایەتی.

ب.هەموو ئەوانەی کە بە باوك بێ بەش دەبوون بە هەمان شێوە بە باپیرەش بێ بەش دەبن.

بەلاّم لە چەند مەسئەلەیەکدا لە باوك جیاوازە، ئەوانیش [1]:

١) باوك بە هیچ کەس لە میرات بێبەش نابێت، بەلاّم باپیرە بە باوك لە میرات بێبەش دەبێت.

٢) نەنك - دایکی باوك - بە باوك بێ بەش دەبێت لە میرات، بەلاّم بە باپیر بێ بەش نابێت، بەڵکو بەشی دیاری کراوی خۆی دەبات.

---

١) عمدة القاري٢٣ / ٢٤٠، المغني١٥، شرح المنهج ٦ / ٨٠، المجموع١٧/١٨٨، الفقه الإسلامي٧٧٥٧ — ٧٧٥٨، الدرة ٥٢، الإعانة ٢٣٤ — ٢٣٥، الشنشوري ٩٠ — ٩١، مغني ابن قدامة ٧ / ٦٤، المفصل ١١ / ٢٨٥.

٣) بە کۆدەنگی زانایان (إجماع) برایانی دایك و باوکی، و برایانی باوکی بە باوك بێ بەش دەبن، بەڵام بەلای جمهوری زانایانەوە بە باپیرە بێ بەش نابن، بەڵکو دەبنە هاوبەشی باپیرە، وەك لەمەولا باسی دەکەین.

٤) لە هەردوو مەسئەلەکەی (غرّاوين ) دا، دایك سێیەکی پاشماوە (ثلث الباقي) دەبات، بەڵام ئەگەر لەم دوو مەسئەلەیەدا لە جێگەی باوك، باپیرە بێت، ئەوا دایك سێ یەکی هەموو میراتەکە دەبات نەك سێ یەکی پاشماوە. وەك شێخی نۆدی دەفەرموێت:

ثمّ لجد كلّ حكم ينمى — للأب، لكن لا يردّ الأما
لثلث الباقي، كذا لم يحجب — فرعا سوى أمّ، و لا أمّ أب

وە ئیمامی ڕەحەبیش دەفەرموێت:

والجد مثل الأب عند فقده — في حوز ما يصيبه، ومدّه
إلا إذا كان هناك إخوة — لكونهم في القرب وهو أسوة
أو أبوان معهما زوج ورث — فالأم للثلث مع الجد ترث
وهكذا ليس شبيها بالأب — في زوجة الميت، وأم، وأب
وحكمه، وحكمهم سياتي — مكمّل البيان في الحالات

(٣) برای باوکی وەکو برای دایك و باوکی وایە لە چەند بڕیارێکدا:

أ. ئەگەر تاکە میراتبەری مردوەکە بوو، ئەوا: هەموو میراتەکە دەبات بە عەصەبەگەرایەتی.

ب. ئەگەر تاکە میراتبەر نەبوو، بەڵکو خاوەن بەشی لەگەڵدا بوو، ئەوا: چی لە بەشی خاوەن بەشەکە مایەوە ئەوە دەبات، بەمەرجێك کە کەسێك نەبێت حەجبی بکات، ئەگینا هیچ نابات.

بەلاّم لەم چەند مەسئەلەیەدا جیاوازیان هەیە:

أ. برای باوکی ئەگەر کۆ بویەوە لەگەلّ خوشکی دایك و باوکی دا، ئەوا بەپێی یاسای (للذكر مثل حظ الأنثيين) میرات نابەن، بەلّکو خوشکە دایك و باوکیەکە نیوە دەبات، و نیوەکەی تریش برا باوکیەکە بە عەصەبەگەرایەتی دەیبات.

ب. برای باوکی بە یەکدەنگی زانایان لە مەسئەلەی (مشرّكة) دا بێ بەش دەبێت، بەلاّم بە لای کۆمەلّێکی زۆر لە زانایانەوە برای باوك و دایکی بێ بەش نابێت، بەلّکو دەبێتە هاوبەشی براو خوشکە دایکیەکان، وەك لە پێشەوە باسمان کرد.

ت. ئەگەر برای باوکی لەگەلّ خوشکی دایك و باوکی، و کچی یان کچی کوڕی مردوەکەدا کۆبوویەوە، ئەوا: بێبەش دەبێت لە میرات، وەك لە باسی (حجب) دا باسمان کرد، بەلاّم برای باوك و دایکی بێ بەش نابێت، بەلّکو لە پاش ئەوەی کە کچەکە یان کچی کوڕەکە نیوە دەبات، ئەم برا دایك و باوکیە نیوەکەی تری لەگەلّ خوشکە دایك و باوکیەکەدا دەبات بە عەصەبەگەرایەتی بەپێی یاسای (للذكر مثل حظ الأنثيين).

پ. برای باوکی بێ بەش دەبێت لە میرات، کاتێك کە کۆ ببێتەوە لەگەلّ: مێرد، و خوشکی دایك و باوکی. چونکە مێردەکە نیوە دەبات، و خوشکەکەش نیوەکەی تر دەبات، بەمەش هیچ بۆ ئەم نامێنێتەوە. بەلاّم ئەگەر لە جێگەی ئەم برا باوکیە، برای باوك و دایکی بێت، ئەوا مێردەکە هەر نیوە دەبات، بەلاّم نیوەکەی تری برا باوك و دایکیەکە لەگەلّ خوشکە دایك و باوکیەکەدا دەیبەن، بە عەصەبەگەرایەتی، بەپێی یاسای (للذكر مثل حظ الأنثيين).

(٤) کوڕی برای دایك و باوکی، یان کوڕی برای تەنها باوکی، هەر یەکەیان وەکو باوکی خۆی وایە لە کاتێکدا کە بە یەکەوە بن، یان بە تەنها بن. واتە: کوڕی برایەك، یان زیاتر لە کوڕی برایەك هەموو میراتەکە دەبات، یان ئەوەی کە

لە خاوەن بەشەکان دەمێنێتەوە، وە ئەگەر هەردووکیان بە یەکەوە کۆ بوونەوە، ئەوا کوڕی برا دایك و باوکیەکە کوڕی برا باوکیەکە بێ بەش دەکات.

بەلاّم کوڕی برا لە چەند مەسئەلەیەکدا لە باوکی خۆیان جیا دەبنەوە، کە ئەوانیش: [١]

أ. کوڕی برا بەشی دایکی مردوەکە کەم ناکەنەوە لە سێ یەکەوە بۆ شەش یەك، بە پێچەوانەی باوکیان، وەك لە باسی خاوەن بەشەکان، و حەجب دا باسمان کرد.

ب. کوڕی برا کە لەگەڵ باپیرەدا کۆ بوونەوە باپیرە بێ بەشیان دەکات، بە پێچەوانەی باوکیان، کە باپیرە بێ بەشیان ناکات، وەك لەمەولا باسی دەکەین.

ت. کوڕی برا خوشکی خۆی ناکات بە عەصەبە، چونکە خوشکەکانیان کە دەکاتە کچی برا (ذوي الأرحام) ن، بە پێچەوانەی باوکیان کە ئەوان خوشکی خۆیان دەکەن بە عەصەبە، وەك لە باسی (عصبة بالغير) دا ڕوونی دەکەینەوە.

پ. کوڕی برای دایك و باوکی [٢] لە مەسئەلەی (مشرّكة) دا بێ بەش دەبێت، بە پێچەوانەی باوکیەوە، کە دەبێتە هاوبەش، وەك لە پێشەوە باسمان کرد.

شێخی نۆدی لەم بارەیەوە دەفەرموێت:

| | |
|---|---|
| ......................... | وابـن أخ لـغيـر أمّ كــأبـه |
| لكن إلى السدُس أمّـاً لا يـردّ | ولم يعصــب أخته، ومع جد |
| لا يأخذ الإرث، و في المشــركة | يسقط لا حظّ لـه في التركة |

---

١) منهاج الطالبين بشرح المغني ١٩.

١) هەتا خالّی کۆتایی بڕوانە: التحفة ٤٠٧–٤٠٨، المغني ١٩، ابن آدم ٦٣ – ٦٤، الجمل ٦ / ٨٠ – ٨٣، النهاية ٢٢.

ج. کوڕی برای دایك و باوکی برای باوکی له میرات بێ بەش ناکات، بە پێچەوانەی باوکیەوە کە برای باوکی له میرات بێ بەش دەکات، وەك له باسی بێ بەش بوون دا باسمان کرد.

ح. برای باوکی کوڕی برای دایك و باوکی له میرات بێ بەش دەکات، کەچی کوڕی برای باوکی کوڕی برای دایك و باوکی له میرات بێ بەش ناکات، بەڵکو بە پێچەوانەوە، کوڕی برای دایك و باوکی کوڕی برای باوکی بێ بەش دەکات.

خ. کوڕی برا بێ بەش دەبێت له میرات، ئەگەر کۆ بوویەوە لەگەڵ خوشکی مردووەکەدا کاتێك کە ئەم خوشکە بووبێت بە (عصبة مع الغیر) ئەویش بە کۆبوونەوەی لەگەڵ کچی مردووەکەدا (بۆ نمونە)، بە پێچەوانەی باوکیان کە خوشکەکانی خۆیان دەکەن بە (عصبة بالغیر)، وەك له باسی (عصبة بالغیر) دا ڕوونی دەکەینەوە.

(٥) نەنك وەکو دایك وایە، تەنها ئەوەندە نەبێت کە: هیچ کاتێك نە سێ یەك دەبات، و نە سێ یەکی پاشماوە، بەڵکو هەمیشە شەش یەك دەبات.

(٦) کچی کوڕ وەکو کچ وایە، لەوەدا کە ئەگەر کچ نەبێت ئەوا کچی کوڕ نیوەی میراتیەکە دەبات، بەڵام ئەگەر کچ هەبێت ئەوا کچی کوڕ شەش یەك دەبات وەك له باسی (فروض ) دا ڕوونمان کردەوە. ئەوەندە جیاوازیان هەیە کە: (کچی کوڕ ) له میرات بێ بەش دەبێت ئەگەر مردووەکە کوڕی هەبێت، بەڵام کچ ئەگەر لەگەڵ کوڕی مردووەکەدا کۆ ببێتەوە، ئەوا دەبێت بە (عصبة بالغیر)، ئەو کاتەش بەپێی یاسای (للذکر مثل حظ الأنثیین) میراتەکە دابەش دەکرێت.

# باسی خزمی پشت (عصبة)

ئەو میرات بەرەیە کە نە بە قورئان، و نە بە فەرموودەی حەزرەت، و نە بە کۆ دەنگی زانایان بەشی بۆ دیاری نەکراوە، بەڵکو ئەگەر خاوەن بەشی لەگەڵدا نەبوو ئەوا هەموو میراتەکە دەبات، ئەگینا ئەوە دەبات کە لە خاوەن بەشەکان دەمێنێتەوە، حەزرەتی پێغەمبەر دەفەرموێت: ألحقوا الفرائض بأهلها فما بقي فهو لأولى رجل ذكر.(١)

بەپێی ئەم فەرموودەی حەزرەتە ئەم جۆرە خزمە لە پلەدا لە پاش خاوەن بەشەکانەوە دێت (واتە تا خاوەن بەشەکان بەشی خۆیان نەبەن عەصەبە هیچ نابات )، وە ئەگەر لە خاوەن بەشەکان هیچ نەمایەوە ئەوا عەصەبە بێ بەش دەبن. وەك ئیمامی ڕەحەبی دەفەرموێت:

فكل من أحرز كل المآل ... من القرابات، أو الموالي
أو كان ما يفضل بعد الفرض له ... فهو أخو العصوبة المفضلة

وە شێخی نۆدی دەفەرموێت:

عصبة الشخص على ما ذكروا ... هو الذي ليس له مقدّرُ
يرثُ ما خلّفه مَنْ يقضي ... أو يرثُ الباقيَ بعد الفرض

---

١) متفق عليه: بخاري ٦٣٥١ باب ميراث الولد من أبيه و أمه، و مسلم ١٦١٥، ١٦١٥باب ألحقوا الفرائض بأهلها.

وە بەشێوەیەکی گشتی عەصەبە دوو جۆرن:

(١) عەصەبەی نەسەب (خزمایەتی ).

(٢) عەصەبەی سەبەب (ولاء): بریتیە لە ئازادکەری کۆیلە واتە: ئەگەر مردوویەك پێشتر کۆیلە بووبێت و ئازاد کرابێت، جا ئازاد کەرەکەی نێر بێت یان مێ عەصەبەی ئەو کۆیلە ئازاد کراوەیە.

شایانی باسە کە عەصەبەی سەبەب لە پلەدا لە دوای عەصەبەی نەسەبەوە دێت، وە لە پێش گەڕاندنەوەی زیادەی میراتەکە بۆ سەر خاوەن بەشەکان (لە کاتی ڕەددا)، وە لەپێش (ذوي الأرحام)ەوە دێت، جا ئەگەر ئێستا سەرلەنوێ ڕیز بەندیەك بکەین بۆ میرات بەرەکان، ئەوا بەم شێوەیە دەردەچێت:

(١) خاوەن بەشە دیاری کراوەکان.

(٢) عەصەبەی نەسەب.

(٣) عەصەبەی سەبەب.

(٤) ئەو خاوەن بەشانەی کە لە پاش بەشەکانی خۆیان پاشماوەی میراتەکەیان بۆ ڕەد دەکرێتەوە.

(٥) ذوي الأرحام.

(٦) بیت المال.

**عەصەبەی نەسەب:** ئەو میراتبەرەیە کە لە نێوان ئەو و مردوەکەدا مێینە نیە، وەك: کوڕ، باوك، برا، مام، وە مێینەیەکیش کە بەهۆی براکەیەوە ببێت بە عەصەبە، وە خوشکیش کاتێك کە کۆببێتەوە لەگەڵ کچ یان کچی کوڕدا.

جا ئەگەر لە نێوان میراتبەر، و مردوەکەدا مێینەیەك هەبوو، ئەوکاتە میراتبەرەکە یان دەبێت بە (ذوي الأرحام) وەك: باوکی دایك، و کوڕی کچ، یان دەبێت بە خاوەن بەشی دیاری کراو وەك: برای دایکی.

وه لەو پێناسەیەوە دەر دەکەوێت کە عەصەبەی نەسەب دەکرێت بە سێ جۆرەوە:

## یەکەم: عەصەبەیەك کە بەخۆی عەصەبەیە ( عصبه بالنفس ):

بریتیە لەو نێرینەیەی کە ڕاستەوخۆ دەگاتە مردوەکە، یان بە واسیتەی نێرینەوە دەگاتە مردوەکە. واتە هەموو نێرینەیەکی خزمی مردوەکەیە کە لە ڕێگەی مێیینەوە خزمایەتیەکەی نەگەیشتبێتە مردوەکە .

جا ئەم جۆرە عەصەبەیە ئەگەر تەنها خۆیان میرات بەری مردوەکە بوون، ئەوا هەموو میراتەکە دەبەن، وە ئەگەر خاوەن بەشیان لەگەڵدا بوو، ئەوا ئەوە دەبەن کە لە خاوەن بەشەکان دەمێنێتەوە، وە ئەگەر خاوەن بەشەکان هەموو میراتەکەیان برد، ئەوا ئەمان هیچیان بۆ نامێنێتەوە، و بێ بەش دەبن.

ئەم جۆرە عەصەبەیە بەگوێرەی لایەنی خزمایەتییەکە دەکرێت بە چوار جۆرەوە کە بەم ڕیزبەندیە بە دوای یەکدا دێن:

(١) (لایەنی کوڕایەتی) وەك: کوڕ، کوڕی کوڕ با بەرەو خوارتریش بێت.

(٢) (لایەنی باوکایەتی) وەك: باوك.

جا ئەگەرچی باپیرەش هەر لەم جۆرەدا جێگەی دەبێتەوە، بەڵاّم لەبەرئەوە کە ئەگەر لەگەڵ برادا کۆ بویەوە ئەوا بڕیارێکی تری هەیە، وەك لەمەولا باسی دەکەین، بۆیە لێرەدا دەڵێین: لایەنی باوکایەتی تەنها باوك دەگرێتەوە و بەس.

(٣) (لایەنی برایەتی) وەك: برای دایك و باوکی، و برای باوکی، و کوڕی ئەوان هەر بەو شێوەیە (واتە کوڕی برای دایك و باوکی، و کوڕی برای باوکی ).

(٤) (لایەنی مامەیەتی) وەك: مامی دایك و باوکی، مامی باوکی، منداڵی ئەوان هەر بەو تەرتیبە، مامی باوك، منداڵی مامی باوك، مامی باپیر، و کوڕی ئەوان هەر بەو شێوەیە.

## یاسای میرات بردنی (عصبه بالنفس ) کاتێك کە هەر خۆیان بن

(١)بەپێی ئەو ڕیزبەندیەی سەرەوە کە کردمان، هەتاوەکو یەکێك لە عەصەبەکانی خاڵی یەکەم وەستابن، عەصەبەکانی خاڵی دوەم بە عەصەبەگەرایەتی هیچ نابەن، وە هەتاوەکو عەصەبەکانی خاڵی دوەم وەستابن، عەصەبەکانی خاڵی سێیەم هیچ نابەن، وە هەتاوەکو عەصەبەکانی خاڵی سێیەم وەستابن، عەصەبەکانی خاڵی چوارەم هیچ نابەن. وەك ئیمامی ڕەحەبی دەفەرموێت:

وما لذي البعدى مع القريب    في الإرث من حظ ولا نصيب

(٢)ئەگەر لایەنی خزمایەتیەکەیان وەك یەك وەها بوو (واتە هەردووکیان کوڕایەتی بوو ) ئەوا لەم کاتەدا ڕیزبەندیەکە بە گوێرەی نزیکی پلەی خزمایەتیەکەیە. بۆ نمونە: کوڕ لەپێش کوڕی کوڕەوەیە، و باوك لەپێش باپیر، و برا لەپێش برازاو، مامیش لەپێش ئامۆزاوەیە.

(٣)ئەگەر لایەنی خزمایەتی، و نزیکی پلەی خزمایەتیان وەك یەك وەها بوو، ئەوا ڕیزبەندیەکە بە گوێرەی هێزی خزمایەتیەکەیە. بۆ نمونە: برای دایك و باوکی لەپێش برای باوکیەوەیە، و مامی دایك و باوکی لەپێش مامی باوکیەوەیە، و هەروەها کوڕەکانیشیان.

(٤) ئەگەر لایەنی خزمایەتی، و نزیکی پلەی خزمایەتی و هێزی خزمایەتیەکەیان وەك یەك وەها بوو، ئەوا هەموویان بە یەکسانی، و بە یەکەوە میراتەکە دەبەن، بۆ نمونە: کەسێك مردبێت: سێ برای دایك و باوکی هەبوبێت، بەڵام ئەوانیش پێشتر مردبن، و هەریەکە کوڕێکیان لە پاش بەجێ مابێت. ئەوا: هەموو میراتی ئەو کەسە مردوە دابەش دەکرێت بەسەر سێ کوڕی برا دایك و باوکیەکاندا بە یەکسانی.

کەواتە لە ڕیزبەندی میرات بردنی عەصەبەدا یەکەم جار بە لایەنی خزمایەتیەکەیە، پاشان بە نزیکی پلەی خزمایەتیەکە، پاشان بە هێزی خزمایەتیەکەیە[1]. وەك جەعبەری دەفەرموێت:

ودونك فاحفظ ضابطاً جلّ قدره إذا كان بالتعصيب ذو الإرث نفلا
أولو جهة لم يختلف قدّم الذي بالأصلين أدلى دون ذي الأصل مجملا
مثال له: أخٌ شقيقٌ مقدّمٌ على الأخ من أصلٍ يروق مقبّلا
فإن كان ذو الأصلين في البعد موغلا فذو الأصل بالتوريث أحرى، فأصّلا
مثال له: تقديمنا الأخَ من أبِ على ابن الأخ المدلي بأصلين إن علا
و إن يختلف في الإرث حقّا جهاتُهم وكنتَ لترتيب الجهات محصّلا
ففي كلِّ مَنْ بالإرث أحرى، ففرعه على الجهة الأخرى يقدّم مسجّلا
مثالٌ له: ابن ابن يُقدَّم موغلاً على الأخ، و ابن الأخ للعم عطلا
فبالجهةِ التقديمُ، ثُمَّ بقربِه وبعدهما التقديمُ بالقوة اجعلا
أحط بالذي أمليت يا صاح، تغْنَ عن إعادتُه في الحجب، و اقتس لتنصلا

تێبینی:

(١)هەرچی میرات بەری نێرینە هەیە (عصبة بالنفس)ن، تەنها مێرد، و برای دایکی نەبێت کە خاوەن بەشی دیاری کراون.

(٢)لە ناو میرات بەرە مێیینەکاندا (عصبة بالنفس)یان تێدا نیە بێجگە لەو ژنەی کە کۆیلەی ئازاد کردوە. وەك ئیمامی ڕەحەبی دەفەرموێت:

وليس في النساء طرّاً عصبة إلا التي منّت بعتق الرقبة

---

١) المجموع ١٧ /١٥٦–١٥٧، القليوبي ١٤١، الفقه الإسلامي ٧٧٨٩، المفصل ١١ / ٣١٩، الدرة ٧٢، الفقه المنهجي ٢ / ٢٩٩ – ٣٠٠، الكنوز١٨٧-١٨٨.

## دوەم: عەصەبەیەك کە بە کەسێکی تر دەبێتە عەصەبە (عصبة بالغير)

بریتیە لەو مێیینەی کە بەشێکی دیاری کراوی هەیە، و نێرینەیەکی لە پلەی خۆیدا لەگەڵدایە، و بەهۆی ئەو نێرینەیەوە دەبێت بە عەصەبە. وەك یەك لە شاعیران دەفەرموێت:

وعاصبٌ بغيره مَنْ منعه      أخوه فرضَه إذا كان معه

جا ئەم جۆرەش تەنها ئەو مێیینانە دەگرێتەوە کە ئەگەر بە تەنها بن نیوەی میراتیەکە دەبەن، و ئەگەر لە یەك زیاتر بن دووسێیەکی میراتەکە دەبەن، کە ئەوانیش ئەو چوار مێیینەن کە لە باسی خاوەن بەشەکاندا باسمان کردن، و بەکورتی:

(١) کچ لەگەڵ برای خۆیدا. واتە لەگەڵ کوڕی مردووەکەدا.

(٢) کچی کوڕ کە لەگەڵ کوڕی کوڕێك کە لە پلەی خۆیدا بێت، ئیتر جیاوازی نیە لەوەدا کە ئەو کوڕی کوڕە برای بێت، یان کوڕە مامی بێت.

(٣) خوشکی دایك و باوکی لەگەڵ برای دایك و باوکی. بەڵام ئەگەر لەگەڵ برای باوکیدا بوو، ئەوا وەك خاوەن بەش بەشی خۆی دەبات کە نیوەیە، و ئەوەی کە دەمێنێتەوە برا باوکیەکە بە عەصەبەگەرایەتی دەیبات.

(٤) خوشکی باوکی لەگەڵ برای باوکیدا، بەڵام ئەگەر لەگەڵ برای دایك و باوکیدا بێت، ئەوا حەجب دەبێت.

بەڵام ئەگەر مێیینەکە خاوەن بەش نەبێت ، و لەگەڵ برای خۆیدا کۆ ببێتەوە، باوەکو براکەشی خۆی عەصەبە بێت، بەڵام ئەم ناکات بە عەصەبە، بەڵکو براکە بەشی خۆی بە عەصەبەگەرایەتی دەبات، و مێیینەکەش بێ بەش دەبێت [١]، وەك: کچی برا لەگەڵ کوڕی برا، و کچی مام لەگەڵ کوڕی مام. وەك یەکێك لە شاعیران دەفەرموێت:

---

١) المفصل ١١ / ٣٢١، الموسوعة / الإرث بالعصوبة ٣ / ٤٣.

ما عصّب ابن الأخ، وابن العم ما فوقهما، ولا المساوي لهما

ئیمامی رەحەبیش دەفەرموێت:

ولیس ابن الأخ بالمعصِّب مَنْ مثله أو فوقه في النسب

## مەرجەکانی (عصبة بالغير)[1]

(١) مێینە بێت.

(٢) خاوەن بەشی دیاری کراو بێت، و بەشەکەشی نیوە بێت، ئەگەر تەنها بوو، و دووسێیەك بێت ئەگەر زیاتر بوون.

(٣) ئەو نێرینەیەی کە دەیکات بە عەصەبە، دەبێت لە پلەی خۆیدا بێت، کەواتە: کوڕ کچی کوڕ ناکات بە عەصەبە، بەڵکو حەجبی دەکات، هەروەها کوڕ خوشکی دایك و باوکی یان خوشکی باوکی ناکات بە عەصەبە، هەروەها کوڕی برای دایك و باوکی خوشکی دایك و باوکی ناکات بە عەصەبە، چونکە لە پلەدا یەکسان نین. بەڵام حاڵەتێکی تایبەت هەیە، وەك ئیستیسنایەك لەم خاڵە، ئەویش ئەوەیە کە: ئەگەر کچی کوڕ لەگەڵ دوو کچی مردوەکەدا کۆ ببێتەوە، ئەوا کچی کوڕەکە لە میرات بێبەش دەبێت، بەڵام لەم کاتەدا ئەگەر کوڕی کوڕ یان کوڕی کوڕی کوڕ هەبوو، ئەوا کچی کوڕەکە دەگێڕن بە عەصەبە، ئەگەرچی کوڕی کوڕی کوڕە کە لە هەمان پلەی کچی کوڕەکەشدا نیە، ئەویش تەنها لەبەر ئەوەی کە ئەم کچی کوڕە بێبەش نەبێت لە میراتەکە، هەر بۆیە بەم کوڕی کوڕی کوڕە دەوترێت: برای پیرۆز و بەفەڕ.

(٤) ئەو نێرینەیەی کە دەیکات بە عەصەبە، دەبێت لە هێزی خزمایەتییەکەدا یەکسان بێت لەگەڵیدا، کەواتە برای تەنها باوکی خوشکی دایك و باوکی ناگێڕێت بە عەصەبە.

---

١) المفصل ١١ / ٣٢١، اللمع ١١١.

## سێیەم: ئەو عەصەبەیەی کە بە کۆبوونەوەی لەگەڵ کەسێکی تردا دەبێت بە عەصەبە (عصبة مع الغير):

بریتیە لەو مێیینەی کە خۆی لە ئەصڵدا بەشێکی دیاری کراوی هەیە، بەڵام بە کۆبوونەوەی لەگەڵ مێیینەیەکی تردا دەبێت بە عەصەبە، کە ئەمیش لە دوو شێوەدا دەبێت:

(١) خوشکی دایك و باوکی کە کۆ ببێتەوە لەگەڵ کچ، یان کچی کوڕ دا. بەمەرجێك کە کەسێك نەبێت خوشکە دایك و باوکیەکە حەجب بکات، و کەسێکیش نەبێت کە بیکات بە (عصبة بالغير).

(٢) خوشکی باوکی کە کۆ ببێتەوە لەگەڵ کچ، یان کچی کوڕ دا. بە مەرجێك کە خوشکی دایك و باوکی لەگەڵدا نەبێت، و کەسێکیشی لەگەڵدا نەبێت کە حەجبی بکات، کەسێکیش نەبێت کە بیکات بە (عصبة بالغير).

یەکێك لە شاعیران دەفەرموێت:

والأخـــوات لا لأم عصبـــات　　　مع بنـــات الابن، أو مع الـبنات
إذا انتـفى الحاجب ثمّ إن وجد　　　معصّب الأخت هنا القسم اعتمد

جـا لـــەم دووشـــێوەدا چـــی لـــە خـــاوەن بەشـــەکان مایـــەوە، ئـــەمان بـــە عەصەبەگەرایەتی دەیبەن.

### چەند ئاگاداریەك

(١) ئەوەی کە باسمان کرد کە: خوشکی دایك و باوکی، و خوشکی باوکی بە کۆبوونەوە لەگەڵ کچ، یان کچی کوڕدا دەبن بە (عصبة مع الغير)، مەزهەبی هەموو هاوەڵانی حەزرەت و هەموو زانا موجتەهیدەکانە، بە زانایانی هەرچوار مەزهەبیشەوە، بەڵام ئیبنو عەباس پێی وایە کە خوشکی دایك و باوکی، و

خوشکی تەنها باوکی بە بوونی کچ، یان کچی کوڕ لە میرات بێبەش دەبن، نەك ببن بە عەصەبە.

(٢) لەم کاتەدا کە خوشکی دایك و باوکی دەبێت بە (عصبة مع الغیر)، ئەوا دەچێتە جێگەی برای دایك و باوکی، و مامەڵەی ئەوی لەگەڵدا دەکرێت. واتە وەك چۆن برای باوك و دایکی برای باوکی بێ بەش دەکات، بە هەمان شێوە خوشکی دایك و باوکیش لەم کاتەدا بێ بەشی دەکات. وەك شێخی نۆدی دەفەرموێت:

فساقط فرع أب بأخت لأبوین اجتمعت مع بنت

بۆ نمونە: ئەگەر پیاوێك بمرێت، کچێك، کچی کوڕێك، خوشکی باوك و دایکی، برای باوکی لەپاش بەجێ ما، ئەوا: کچەکە نیوە دەبات، و کچی کوڕەکە شەش یەك دەبات، و خوشکە دایك و باوکیەکە لەگەڵ ئەماندا بوە بە عەصەبە، و برا باوکیەکەش بەخۆی عەصەبەیە، بەمەش ئەصڵی مەسئەلەکە شەشە (٦)، سێی (٣) کچەکە دەیبات، و یەکی (١) کچی کوڕەکە دەیبات، و دووی (٢) دەمێنێتەوە، خوشکە دایك و باوکیەکە دەیبات، و برا باوکیەکەش بەم خوشکە دایك و باوکیە بێ بەش دەبێت، و هیچ نابات.[1]

| | | |
|---|---|---|
| ئەصڵی مەسئەلە | | ٦ |
| یەك کچ | نیوە | ٣ |
| یەك کچی کوڕ | شەش یەك | ١ |
| یەك خوشکی دایك و باوکی | عصبە مع الغیر | ٢ |
| یەك برای باوکی | عصبە بالنفس | ٠ |

١) الفقە الإسلامي٢ ٧٨٠

(٣) هەروەها خوشکی باوکیش کاتێك کە دەبێت بە (عصبة مع الغير)، ئەوا دەچێتە جێگەی برای باوکی، و مامەڵەی ئەوی لەگەڵدا دەکرێت. کەواتە بە بوونی ئەم خوشکە لەم حاڵەتەدا کوڕی برای دایك و باوکی لە میرات بێبەش دەبێت.

(٤) لەم کاتەدا کە خوشکی دایك و باوکی، یان خوشکی باوکی دەچنە جێگەی برای دایك و باوکی، یان برای باوکی، جیاوازیەکیان هەیە لەگەڵ براکانی خۆیان [1]، ئەویش ئەوەیە کە: خوشکی دایك و باوکی، و خوشکی باوکی لەکاتێکدا کە خاوەن بەشەکان هەموو میراتەکە دەبەن ئەمان بێ بەش نابن، بەڵکو بەشی خۆیان هەر دەبەن بەوەی کە مەسئەلەکە عەولی تێدا دەکرێت، بە پێچەوانەی برای دایك و باوکی، و برای باوکی کە بە بردنی هەموو میراتەکە لە لایەن خاوەن بەشەکانەوە ئەمان بێ بەش دەبن.

بۆ نمونە: ئەگەر ژنێك بمرێت: مێرد، دایك، دوو خوشکی دایکی، خوشکێکی دایك و باوکی یان باوکی بەتەنها لە پاش بەجێ بهێنێت، ئەوا: مێردەکە نیوە دەبات، و دایکەکەش شەش یەك دەبات، و دوو خوشکە دایکیەکانیش سێ یەك دەبەن، و خوشکە دایك و باوکیەکە یان باوکیەکە بەتەنها نیوە دەبات، بەمەش ئەصڵی مەسئەلەکە دەبێت بە شەش (٦)، سێی (٣) بۆ مێردەکە، و یەکی (١) بۆ دایکەکە، و دووی (٢) بۆ دوو خوشکە دایکیەکان، و سێ (٣) بۆ خوشکە دایك و باوکیەکە یان خوشکە باوکیەکە بەتەنها، ئەوجا بە کۆکردنەوەی بەشەکان (٣+١+٢+٣) دەکاتە نۆ(٩)، کەواتە دەبێت مەسئەلەکە عەولی تێدا بکرێت، و ئەصڵی مەسئەلەکە لە شەشەوە(٦) زیاد بکرێت بۆ نۆ(٩)، بەڵام ئەگەر لە بریتی ئەم خوشکە دایك و باوکیە یان ئەم خوشکە تەنها باوکیە، برایەکی باوك و دایکی یان برایەکی تەنها باوکی بێت، ئەوا هیچی بۆ نامێنێتەوە، و بێ بەش دەبێت.

---

١) المغني ١٣، الإعانة ٢٣٢، شرح المنهج ٦ / ٨١.

| ئەصڵی مەسئەلە | | ٦ ← + ٣ | ٩ |
|---|---|---|---|
| مێرد | نیوه | ٣ | ٣ |
| دایك | شەش یەك | ١ | ١ |
| دوو خوشكی دایكی | سێیەك | ٢ | ٢ |
| یەك خوشكی دایك و باوكی | نیوه | ٠ (؟) | ٣ |

| ئەصڵی مەسئەلە | | ٦ |
|---|---|---|
| مێرد | نیوه | ٣ |
| دایك | شەش یەك | ١ |
| دوو خوشكی دایكی | سێیەك | ٢ |
| برای دایك و باوكی | عەصەبە | ٠ |

(٥) جیاوازی لە نێوان (عصبة بالغیر ) و (عصبة مع الغیر) ئەوەیە كە لە (عصبة بالغیر ) دا دەبێت غەیرەكە نێرینە بێت، واتە (عصبة بالنفس ) بێت، ئەوجا بەهۆی ئەمەوە مێیینەكەش دەبێت بە عەصەبە، و ئەو كاتەش ماڵەكە دەبەن بە عەصەبەگەرایەتی، و بە یاسای (للذكر مثل حظ الأنثیین). بەلاّم لە (عصبة بالغیر ) دا غەیرەكە خۆی عەصەبە نیە، بەڵكو مێیینەیەكە كە خۆی بەشێكی دیاری كراوی هەیە، و ئەو غەیرە هۆیەك نیە بۆ ئەوەی كە خوشكەكە ببێت بە عەصەبە، بەڵكو مەرجە بۆ ئەوەی كە ببێت بە عەصەبە، و لەو كاتەشدا تەنها خوشكەكە دەبێت بە عەصەبە، و پاشماوەی خاوەن بەشەكان دەبات بۆ خۆی.[١]

---

١) المجموع ١٦٠.

(٦) ئەگەر هەر سێ عەصەبەکە بە یەکەوە کۆبوونەوە، ئەوا ئەگەر لە لایەنی خزمایەتی، و پلەی خزمایەتیدا وەك یەك وەهابوون، ئەوا پێشحستنی هەرکامیان بەسراوە بە هێزی خزمایەتیەکەوە، نەك بەوەی کە کامیان (عصبة بالنفس )ە ئەوەیان بخرێتە پێشەوە.

بۆ نمونە: ئەگەر برای باوکی (عصبة بالنفس )، و کچ (عصبة بالغير )، و خوشکی باوك و دایکی (عصبة مع الغير ) بەیەکەوە کۆبوونەوە ئەوا: کچەکە نیوە دەبات، و ئەوەی کە دەمێنێتەوە خوشکە دایك و باوکیەکە دەیبات، و برا باوکیەکەش بێ بەش دەبێت.

(٧) وەك پێشتر باسمان کرد، یاسایەکی گشتی هەیە لە (فرائض ) دا کە دەڵێت: ئەگەر نێرینەیەك، و مێیینەیەك کە لە پلەی گەیشتنیان بە مردوویەك وەك یەك وەها بوون، ئەوا بەشی مێیینەکە یەکسانە بە نیوەی بەشی نێرینەکە. وەك کوڕ و کچ، یان خوشك و برا، هەتاوەکو جێ بەجێ کردنی ئەم یاسایە گەیشتوەتە ڕادەیەك کە هەندێك لە زانایان فەرموویانە: دایك بۆیە لە مەسئەلەی (غرّاوين ) دا سێ یەکی هەموو میراتەکە نابات، بەڵکو سێ یەکی ئەوەی کە دەمێنێتەوە دەبات، تاوەکو بەشەکەی لەگەڵ بەشی باوکەکەدا یەکسان نەبێت [1]، وە هەندێکی تر فەرموویانە: ژن، و مێرد ئەگەر هەرکامیان بمرن، و منداڵیان هەبێت، یان منداڵیان نەبێت، ژنەکە هەر نیوەی مێردەکە دەبات، چونکە وەك لە باسی خاوەن بەشەکاندا باسمان کرد: ئەگەر منداڵ نەبوو، ئەوا ژن چوار یەك دەبات، بەڵام پیاو نیوە دەبات، وە ئەگەر منداڵ هەبوو، ئەوا ژن هەشت یەك دەبات، و پیاو چوار یەك دەبات [2]. بەڵام هەندێك مەسئەلە هەن کە ئەم یاسایە نایانگرێتەوە وەك:

---

١) التحفة ٤٠٤، المجموع ٨٤، الدرة البهية ٤٦.

٢) التحفة ٣٩٦، شرح المنهج ٦ / ٦٨، الفقه الإسلامي ٧٧٧٤.

أ. برا و خوشکی دایکی، کە نێرینە، و مێیینەیان یەکسانە، و وەك یەك بەش دەبەن.[١]

ب. دایك، و باوك، کاتێك کە مردوەکە منداڵی هەبێت، چونکە بە زۆری هەردووکیان وەك یەك ماندوو دەبن لە بەخێو کردن و پەروەردە کردنی منداڵەکەدا.[٢]

## خشتەی عەصەبەکان

| جۆری عەصەبە | ژمارەیان | کەسەکان | ڕەگەزیان |
|---|---|---|---|
| عصبە بالنفس | (١٤)کەس: (١٣) نێرینە و (١) مێیینە | هەموو میرات بەرە نێرینەکان، بێجگە لە مێرد، و برای دایکی. لە مێیینەکانیشدا تەنها کۆیلە ئازادکەر. | نێر ، و مێ |
| عصبە بالغیر | (٤) کەس | کچ، و کچی کوڕ، و خوشکی دایك و باوکی، و خوشکی تەنها باوکی | تەنها مێیینە |
| عصبە مع الغیر | (٢) کەس | خوشکی دایك و باوکی، و خوشکی تەنها باوکی | تەنها مێیینە |

١) المغني ١٤، الفقە الإسلامي ٧٧٧٤.
٢) المغني ١٤.

# ئەو حاڵەتانەی کە میرات بەرانی تێ دەکەوێت

ئەو حاڵەتانەی کە میرات بەرانی تێ دەکەوێت لە میرات بەرێکەوە بۆ میرات بەرێکی تر دەگۆڕێت بە گوێرەی جۆری میرات بەرەکە، و چۆنێتی میرات بردنی، وا لەمەولا بە کورتی باسی یەکە بە یەکەی ئەو حاڵەتانە دەکەین:

## یەکەم: ئەو حاڵەتانەی کە تەنها وەك خاوەن بەشی دیاری کراو میرات دەبەن.

وەك لە پێشەوە باسمان کرد: ئەو میرات بەرانەی کە تەنها وەك خاوەن بەشی دیاری کراو میرات دەبەن حەوت کەسن: مێرد، و ژن، و دایك، و نەنك "دایکی باوك، و دایکی دایك"، و مندالّی دایك "برای دایکی، و خوشکی دایکی".

### (١) حاڵەتەکانی مێرد

(١) نیوە دەبات: بە مەرجێك ژنە مردوەکەی مندالّی نەبێت، چ لە ئەم، یان لە مێردێکی تر. بۆ نمونە: ژنێك مردوە: مێرد، و برایەکی دایك و باوکی لە پاش بەجێ ماوە، مێردەکەی نیوە دەبات، و نیوەکەی تریشی برا دایك و باوکیەکە بە عەصەبەگەرایەتی دەیبات.

| | | |
|---|---|---|
| ئەصڵی مەسئەلە | | ٢ |
| مێرد | نیوە | ١ |
| برای دایك و باوکی | عەصەبە | ١ |

(٢) چوار یەك دەبات: بە مەرجێك ژنە مردوەکەی مندالّی هەبێت، چ لە ئەم، یان لە مێردێکی تر. بۆ نمونە: ژنێك مردوە: مێرد، و کوڕێکی لە پاش بەجێ

ماوە، مێردەکەی چوار یەك دەبات، و ئەوەی کە دەمێنێتەوە کوڕەکە بە عەصەبەگەرایەتی دەیبات.

| | | |
|---|---|---|
| ئەصڵی مەسئەلە | | ٤ |
| مێرد | چواریەك | ١ |
| کور | عەصەبە | ٣ |

## (٢) حاڵەتەکانی ژن

(١) چوار یەك دەبات یەك بێت یان زیاتر: بە مەرجێك مێردە مردوەکەی منداڵی نەبێت، چ لە ئەم، یان لە ژنێکی تر. بۆ نمونە: پیاوێك مردوە: ژنێك، و برایەکی باوکی، و کوڕی کچێکی لە پاش بەجێ ماوە، ژنەکە چوار یەك دەبات، و ئەوەی کە دەمێنێتەوەبرا باوکیەکە بە عەصەبەگەرایەتی دەیبات، و کوڕی کچەکەش هیچ نابات، چونکە (ذوي الأرحام) ە.

| | | |
|---|---|---|
| ئەصڵی مەسئەلە | | ٤ |
| یەك ژن | چواریەك | ١ |
| یەك برای باوکی | عەصەبە | ٣ |
| یەك کوڕی کچ | ذوي الأرحام | ٠ |

(٢) هەشت یەك دەبات یەك بێت یان زیاتر: بە مەرجێك مێردە مردوەکەی منداڵی هەبێت، چ لە ئەم، یان لە ژنێکی تر. بۆ نمونە: پیاوێك مردوە: سێ ژن، و کچێك، و باوکی لە پاش بەجێ بمێنێت، سێ ژنەکە هەشت یەك دەبەن، کچەکەش نیوە دەبات، و باوکەکەش شەش یەك دەبات، و ئەوەشی کە دەمێنێتەوە باوکەکە بە عەصەبەگەرایەتی دەیبات.

| ئەصڵی مەسئەلە | | ٢٤ | ٢٤ |
|---|---|---|---|
| سێ ژن | هەشت یەك | ٣ | ٣ |
| یەك كچ | نیوە | ١٢ | ١٢ |
| باوك | شەش یەك | ٤ | ٩ |
| پاشماوە | | ٥ | ٠ |

## (٣) حاڵەتەكانی دایك

(١) شەش یەك دەبات: ئەویش بە یەكێك لەم سێ مەرجە:

أ. مردوەكە منداڵی هەبێت، چی كوڕ بن یان كچ.

ب. مردوەكە كوڕەزای هەبێت، چی كوڕ بن یان كچ.

ت. مردوەكە دوو یان زیاتر برا و خوشكی هەبێت.

بۆ نمونە: ژنێك مردوە: مێرد، و دایك، و كوڕێك و پێنج كچی لە پاش بەجێ ماوە، ئەوا مێردەكە چوار یەك دەبات، و دایكەكەش شەش یەك دەبات، وە ئەوەی كە دەمێنێتەوە كوڕ و كچەكان بە عەصەبەگەرایەتی دەیبەن، بە یاسای: (للذّكر مثل حظ الأنثيين ).

| ئەصڵی مەسئەلە | | ١٢ | ١٢ |
|---|---|---|---|
| مێرد | چواریەك | ٣ | ٣ |
| دایك | شەش یەك | ٢ | ٢ |
| یەك كوڕ | عەصەبە | ٧ | ٢ |
| پێنج كچ | | | ٥ |

(٢) سێ یەکی هەموو میراتەکە دەبات: ئەویش بە مەرجێك مردوەکە هیچکام لەوانەی حاڵەتی یەکەمی نەبێت.

بۆ نمونە پیاوێك مردوە: ژنێك، و دایك، و برایەکی باوکی لە پاش بەجێ ماوە، ژنەکە چوار یەك دەبات، و دایکەکەش سێیەك دەبات، و ئەوەشی کە دەمێنێتەوە برا باوکیەکە بە عەصەبەگەرایەتی دەیبات.

| ئەصڵی مەسئەلە | | ١٢ |
|---|---|---|
| یەك ژن | چواریەك | ٣ |
| دایك | سێیەك | ٤ |
| یەك برای باوکی | عەصەبە | ٥ |

(٣) سێیەکی پاش ماوە (ثلث الباقي) لە پاش بەشی مێرد، یان ژن دەبات: کاتێك کە کۆ ببێتەوە لەگەڵ باوك، و مێرد یان ژن، وەك لە دوو مەسئەلەکەی (غرّاوین) دا.

### (٤ – ٥) حاڵەتەکانی نەنك – دایکی باوك، و دایکی دایك

(١) شەش یەك دەبات: نەنکێك یان زیاتر، بە مەرجێك کە بێ بەش نەکرێن لە میرات.

بۆ نمونە: پیاوێك مردوە: ژنێك، و دوو نەنك – واتە: دایکی باوك، و دایکی دایك --، و برایەکی باوکی لە پاش بەجێ ماوە، ئەوا: ژنەکە چوار یەك دەبات، و دوو نەنکەکەش شەش یەك دەبەن، و ئەوەشی کە دەمێنێتەوە برا باوکیەکە بە عەصەبەگەرایەتی دەیبات.

(٢) بێ بەش دەبێت لە میرات: وەك لە باسی بێ بەش بووندا بە درێژی ڕوونمان کردەوە.

بۆ نمونە: ژنێك مردوە: دایك، و نەنك، و کوڕێکی لە پاش بەجێ ماوە، ئەوا: دایکەکە شەش یەك دەبات، و ئەوەی کە دەمێنێتەوە کوڕەکە بە عەصەبەگەرایەتی دەیبات، و نەنکەکەش بە دایکەکە بێ بەش دەبێت.

## (٦- ٧) حاڵەتەکانی منداڵی دایك_ برای دایکی، و خوشکی دایکی

(١) شەش یەك دەبات: بە مەرجێك یەك برا یان یەك خوشك بێت.

بۆ نمونە کەسێك مردوە: برایەکی دایکی یان خوشکێکی دایکی، و پێنج برای دایك و باوکی لە پاش بەجێ ماوە، ئەوا برا یان خوشکە دایکیەکە شەش یەك دەبات، و ئەوەشی کە دەمێنێتەوە پێنج برا دایك و باوکیەکە بە عەصەبەگەرایەتی دەیبەن.

(٢) سێ یەك دەبەن: بە مەرجێك ژمارەیان لە یەك زیاتر بێت، چی نێر بن یان مێ، بە یەکسانی دابەش دەکرێت لە نێوانیاندا.

بۆ نمونە پیاوێك مردوە: دوو برای دایکی یان دوو خوشکی دایکی یان براو خوشکێکی دایکی، و دایك، و ژنێك، و مامێکی باوکی لە پاش بەجێ ماوە، ئەوا دوو منداڵە دایکیەکان سێیەك دەبەن، و دایکەکەش شەش یەك دەبات، و ژنەکەش چوار یەك دەبات، و ئەوەشی کە دەمێنێتەوە مامە باوکیەکە بە عەصەبەگەرایەتی دەیبات.

(٣) بێ بەش دەبێت لە میرات: بە یەکێك لەم چوار مەرجە:

أ. مردوەکە منداڵی هەبێت.

ب. مردوەکە کوڕەزای هەبێت.

ت. مردوەکە باوکی هەبێت.

پ. مردوەکە باپیری هەبێت.

بۆ نمونە: پیاوێك مردوە: باوك، و کوڕێك، و برایەکی دایکی لە پاش بەجیٚ ماوە، ئەوا: باوکەکە شەش یەك دەبات، و ئەوەشی کە دەمێنێتەوە کوڕەکە بە عەصەبەگەرایەتی دەیبات، و برا دایکیەکەش بیٚ بەش دەبێت.

جا لێرەدا منداڵی دایك چەند تایبەت مەندیەکیان هەیە کە لە هەموو میرات بەرانی تر جیایان دەکاتەوە، تایبەت مەندیەکانیش ئەمانەن [1]:

(١) لە ڕێگەی دایکیانەوە دەگەن بە مردوەکە، لە هەمان کاتدا لەگەڵیشی میرات دەبەن، بە پێچەوانەی میرات بەرەکانی تر، کە لە ڕێگەی هەر کەسێکەوە بگەن بە مردوەکە، بە بوونی ئەو کەسە ئەمان میرات نابەن.

(٢) نێرینە، و مێیینەیان لە میرات بردندا یەکسانن، لەگەڵ ئەوەشدا کە لە یەك پلەی نزیکیدان لە مردوەکەوە، ئەمەش بە پێچەوانەی ئەو یاسا گشتیەی کە دەڵێت: ئەگەر نێرینە، و مێیینەیەك لە یەك پلەی نزیکی دا بوون لە مردوویەکەوە، ئەوا نێرینەکە دوو بەرامبەری مێیینەکە بەش دەبات.

(٣) ئەگەر یەك دانە بن شەش یەك دەبەن، و ئەگەر لە یەك زیاتربن سیٚ یەك دەبەن.

(٤) لەگەڵ ئەوەی کە لە ڕێگەی دایکەوە دەگەن بە مردوەکە، کەچی بەشی دایکەکە کەم دەکەنەوە لە سیٚ یەکەوە بۆ شەش یەك.

(٥) برای دایکی لە ڕێگەی مێیینەوە — دایك — دەگات بە مردوەکە، و کەچی وەك خاوەن بەشی دیاری کراو میرات دەبات. بە پێچەوانەی هەموو ئەو کەسانەی کە لە ڕێگەی مێیینەوە دەگەن بە مردوو، چونکە ئەمان بە (ذوي الأرحام) دادەنرێن.

---

١) التحفة ٤٠٧، النهاية ٢٢، المغني ١٨، الفقه الإسلامي٧٧٧١، الإعانة ٢٣٠، ابن آدم ٦٢، الشنشوری ٨٥.

## دووەم: ئەو حاڵەتانەی کە جارێك وەك خاوەن بەشی دیاری کراو میرات دەبەن، و جارێکیش وەك عەصەبە، بەڵام لە یەك مەسئەلەدا بە هەردوو جۆرەکە میرات نابەن.

وەك لە پێشەوە باسمان کرد: ئەو میرات بەرانەی کە هەم وەك خاوەن بەشی دیاری کراو، هەم وەك عەصەبە میرات دەبەن، بە بێ ئەوەی کە لە یەك مەسئەلەدا بە هەردوو جۆرەکە بیبەن، چوار کەسن: کچ، و کچی کوڕ، و خوشکی دایك و باوکی، و خوشکی باوکی.

### (١) حاڵەتەکانی کچ

(١) نیوە دەبات: ئەویش بە دوو مەرج:

أ. یەك کچ بێت، واتە: مردوەکە تەنها ئەو کچەی هەبێت.

ب.برای خۆی لەگەڵدا نەبێت، چونکە ئەگەر برای لەگەڵدا بێت ئەوا دەیکات بە عەصەبە.

بۆ نمونە: کەسێك مردوە: کچێك، و برایەکی دایك و باوکی لە پاش بەجێ ماوە، ئەوا کچەکە نیوە دەبات، و ئەوەشی کە دەمێنێتەوە برا دایك و باوکیەکە بە عەصەبەگەرایەتی دەیبات.

(٢) دوو سێ یەك دەبەن: ئەویش بە دوو مەرج:

أ. ژمارەیان لە یەك زیاتر بیت.

ب.برای خۆشیان لەگەڵدا نەبێت.

بۆ نمونە: کەسێك مردوە: دوو کچ، و باوکی لە پاش بەجێ ماوە، ئەوا دوو کچەکە دووسێیەك دەبەن، و ئەوەشی کە دەمێنێتەوە باوکەکە هەم وەك خاوەن بەش، و هەم وەك عەصەبە دەیبات.

(٣) (عصبة بالغير): ئەویش بە مەرجێك: برای خۆیان لەگەڵدا بێت، ئیتر یەك کچ بێت یان زیاتر، براکە دەیانکات بە عەصەبە، و هەر کچێك نیوەی بەشی براکەی میرات دەبات.

بۆ نمونە: پیاوێك مردوە: ژنێك، و دوو کوڕ، و سێ کچی لە پاش بەجێ ماوە، ئەوا: ژنەکە هەشت یەك دەبات، بۆ نمونە: کەسێك مردوە: کچێك، و برایەکی دایك و باوکی لە پاش بەجێ ماوە، ئەوا کچەکە نیوە دەبات، و ئەوەشی کە دەمێنێتەوە کوڕ و کچەکان بە عەصەبەگەرایەتی دەیبەن بە یاسای: (للذّکر مثل حظ الأنثيين ).

## (٢) حاڵەتەکانی کچی کوڕ

(١) نیوە دەبات: ئەویش بە چوار مەرج:

أ. یەك کچی کوڕ بێت.

ب. مردوەکە منداڵی نەبێت.

ت. مردوەکە لە هیچ کوڕێکی تر کچی نەبێت، واتە ئەم کچی کوڕە کچی کوڕێکی تری لەگەڵدا نەبێت، ئەگەر چی ئامۆزاشی بێت.

پ. مردوەکە کوڕی کوڕی نەبێت، ئیتر ئەم کوڕی کوڕە برای کچی کوڕەکە بێت، یان ئامۆزای.

بۆ نمونە: پیاوێك مردوە: باوك، و دایك، و کچی کوڕێکی لە پاش بەجێ ماوە، کچی کوڕەکە نیوە دەبات، و دایکەکەش شەش یەك دەبات، ئەوەشی کە دەمێنێتەوە باوکەکە هەم وەك خاوەن بەش، و هەم وەك عەصەبە دەیبات.

(٢) دوو سێ یەك دەبەن: ئەویش بە سێ مەرج:

أ. کاتێك ژمارەیان لە یەك زیاتر بێت.

ب. مردوەکە منداڵی نەبێت.

ت. مردوەکە کوڕی کوڕی نەبێت، ئیتر ئەم کوڕی کوڕە برای کچی کوڕەکە بێت، یان ئامۆزای.

بۆ نمونە: پیاوێك مردوە: باوك، و دوو کچی کوڕی لە پاش بەجێ ماوە، دوو کچی کوڕەکە دوو سێ یەك دەبەن، ئەوەشی کە دەمێنێتەوە باوکەکە بە عەصەبەگەرایەتی دەیبات.

(٣) شەش یەك دەبات بۆ تەواو کردنی دوو سێ یەك: ئیتر یەك کچی کوڕ بێت یان زیاتر، ئەویش بە دوو مەرج:

أ. مردوەکە یەك کچی هەبێت.

ب. مردوەکە کوڕی کوڕی نەبێت، ئیتر ئەم کوڕی کوڕە برای کچی کوڕەکە بێت، یان ئامۆزای.

بۆ نمونە پیاوێك مردوە: کچێك، و کچی کوڕێك، و خوشکێکی دایك و باوکی لە پاش بەجێ ماوە، ئەوا: کچەکە نیوە دەبات، و کچی کوڕەکەش شەش یەك دەبات وەك تەواو کەرێك بۆ دوو سێ یەك، و ئەوەی کە دەمێنێتەوە خوشکەکە بە عەصەبەگەرایەتی دەیبات.

(٤) (عصبة بالغیر): ئەویش بە مەرجێك مردوەکە کوڕی کوڕی نەبێت، ئیتر ئەم کوڕی کوڕە برای کچی کوڕەکە بێت، یان ئامۆزای.

لێرەدا جیاوازی نیە لەوەدا کە یەك کچی کوڕ بێت یان زیاتر، براکە یان ئامۆزاکە دەیکات بە عەصەبە، و هەر کچێك نیوەی بەشی براکەی یان ئامۆزاکەی میرات دەبات.

هەروەها لە حاڵەتێکی تریشدا کچی کوڕ دەبێت بە عەصەبە، ئەویش کاتێك کە لەگەڵ کوڕی کوڕێکدا کۆ ببێتەوە کە لە پلەی گەیشتنی بە مردوەکە لە کچی کوڕەکە دوورتر بێت، وەك کوڕی برای خۆی، یان کوڕی کوڕی برای خۆی، لەم کاتەشدا تەنها لە یەك شێوەدا کچی کوڕەکە دەبێت بە عەصەبە، ئەویش بە دوو مەرج:

أ. مردوەکە دوو کچ یان زیاتری هەبێت.
ب. مردوەکە کوڕی کوڕی نەبێت، ئیتر ئەم کوڕی کوڕە برای کچی کوڕەکە بێت، یان ئامۆزای.

جا لەم شێوەیەشدا لەبەر ئەوە بە کوڕی کوڕێك کە لە خۆی دوورتر بێت دەبێت بە عەصەبە، تاوەکو لە میرات بێ بەش نەبێت، بۆیە ئەگەر لەم مەسئەلەیەدا لە باتی دوو کچی مردوەکە ئەگەر یەك کچ بێت، ئەوا ئەم کچی کوڕە پێویستی بەم کوڕی کوڕە نابێت کە لە خۆی دوورترە لە مردوەکەوە، چونکە لەم کاتەدا شەش یەك دەبات بۆ تەواو کردنی دوو سێ یەك، وەك لە حاڵەتی سێ یەمدا باسمان کرد.

(٥) بێ بەش دەبێت: ئەویش بە یەکێك لەم سێ مەرجەی خوارەوە:
أ. مردوەکە کوڕی هەبێت.
ب. مردوەکە دوو کچ یان زیاتری هەبێت.
ت. کەسێکیشی لەگەڵدا نەبێت کە بیکات بە عەصەبە.

بۆ نمونە: کەسێك مردوە: کوڕێك، و کچی کوڕێکی لە پاش بەجێ ماوە، ئەوا کوڕەکە هەموو میراتەکە بە عەصەبەگەرایەتی دەبات، و کچی کوڕەکەش بێ بەش دەبێت.

نمونەیەکی تر: کەسێك مردوە: دوو کچ، و برایەکی دایك و باوکی، و کچی کوڕێکی لە پاش بەجێ ماوە، ئەوا: دوو کچەکە دوو سێ یەکی میراتەکە دەبەن، و ئەوەی کە دەمێنێتەوە برا دایك و باوکیەکە بە عەصەبەگەرایەتی دەیبات، و کچی کوڕەکەش بێ بەش دەبێت.

## (٣) حاڵەتەکانی خوشکی دایك و باوکی

(١) نیوه دەبات: ئەویش بە سێ مەرج:

أ. یەك خوشکی دایك و باوکی بێت.

ب. کەسێکی لەگەڵدا نەبێت کە بیکات بە عەصەبە.

ت. کەسیشی لەگەڵدا نەبێت کە بێ بەشی بکات.

بۆ نمونە: ژنێك مردوه: مێرد، و خوشکێکی دایك و باوکی لە پاش بەجێ ماوه، ئەوا مێردەکە نیوه دەبات، و خوشکەکەش نیوه دەبات.

(٢) دوو سێ یەك دەبەن: ئەویش بە سێ مەرج:

أ. ژمارەیان لە یەك زیاتر بێت.

ب. کەسێکیشیان لەگەڵدا نەبێت کە بیانکات بە عەصەبە.

ت. کەسێکیشیان لەگەڵدا نەبێت کە بێ بەشیان بکات.

بۆ نمونە کەسێك مردوه: دوو خوشکی دایك و باوکی، و دوو برای دایکی لە پاش بەجێ ماوه، ئەوا دوو خوشکەکە دوو سێ یەك دەبەن، و دوو برا دایکیەکەش سێ یەك دەبەن.

نمونەیەکی تر: کەسێك مردوه: دوو خوشکی دایك و باوکی، و دایکی لە پاش بەجێ ماوه، ئەوا دوو خوشکەکە دوو سێ یەك دەبەن، و دایکەکەش شەش یەك دەبات، و ئەوەش کە دەمێنێتەوه ڕەد دەکرێتەوه بە سەریان دا هەر کەسەو بە پێی بەشەکەی خۆی.

(٣) (عصبة بالغیر): یەك خوشك بێت یان زیاتر، ئەویش بە مەرجێك کە مردوەکە برای دایك و باوکی هەبێت، بەمەش هەر خوشکێك نیوەی بەشی برایەکی میرات دەبات.

(٤) (عصبة مع الغیر): یەك خوشك بێت یان زیاتر، ئەویش بەم سێ مەرجەی خوارەوه:

أ. مردوەکە یان کچی هەبێت ، یان کچی کوڕ.
ب. مردوەکە برای دایك و باوکی نەبێت.
ت. کەسێکیشی لەگەڵدا نەبێت کە بێ بەشی بکات لە میرات.

جا لەم کاتە دا ئەوەی کە لە بەشی خاوەن بەشەکان دەمێنێتەوە ئەم خوشکە دایك و باوکیە دەیبات بە عەصەبەگەرایەتی.

بۆ نمونە: کەسێك مردوە: کچێك، و خوشکێکی دایك و باوکی لەپاش بەجێ ماوە، ئەوا کچەکە نیوە دەبات، و ئەوەی کە دەمێنێتەوە خوشکەکە بە عەصەبەگەرایەتی دەیبات.

(٥) بێ بەش دەبێت لە میرات: ئەویش بە یەکێك لەم سێ مەرجەی خوارەوە:

أ. مردوەکە کوڕی هەبێت.
ب. مردوەکە کوڕی کوڕی هەبێت.
ت. مردوەکە باوکی هەبێت.

### (٤) حاڵەتەکانی خوشکی باوکی

(١) نیوە دەبات: ئەویش بە سێ مەرج:

أ. یەك خوشکی باوکی بێت.
ب. کەسی لەگەڵدا نەبێت کە بیکات بە عەصەبە.
ت. کەسی لەگەڵدا نەبێت کە بێ بەشی بکات.

بۆ نمونە: ژنێك مردوە: مێرد، و خوشکێکی باوکی لە پاش بەجێ ماوە، ئەوا مێردەکە نیوە دەبات، و خوشکەکەش نیوە دەبات.

(٢) دوو سێ یەك دەبەن: ئەویش بە سێ مەرج:

أ. ژمارەیان لە یەك زیاتر بێت.
ب. کەسێکیان لەگەڵدا نەبێت کە بیانکات بە عەصەبە.

ت. کەسێکیان لەگەڵدا نەبێت کە بێ بەشیان بکات.

بۆ نمونە کەسێك مردوە: دوو خوشکی باوکی، و دوو برای دایکی لە پاش بەجێ ماوە، ئەوا دوو خوشکەکە دوو سێ یەك دەبەن، و دوو برا دایکیەکەش سێ یەك دەبەن.

(٣) شەش یەك دەبات بۆ تەواو کردنی دوو سێ یەك: ئیتر یەك خوشکی باوکی بێت یان زیاتر، ئەویش بە دوو مەرج:

أ. مردوەکە یەك خوشکی دایك و باوکی هەبێت.

ب. کەسێکیش نەبێت کە خوشکە باوکیەکە بکات بە عەصەبە.

بۆ نمونە: پیاوێك مردوە: ژنێك، و خوشکێکی دایك و باوکی، و خوشکێکی باوکی لە پاش بەجێ ماوە، ئەوا: ژنەکە چوار یەك دەبات، و خوشکە دایك و باوکیەکەش نیوە دەبات، و خوشکە باوکیەکەش شەش یەك دەبات، ئەوەی کە دەمێنێتەوە ڕەد دەکرێتەوە بۆ هەردوو خوشکەکە، هەر کەسەو بە پێی بەشەکەی خۆی.

(٤) (عصبة بالغیر): ئەویش بە دوو مەرج:

أ. مردوەکە برای باوکی هەبێت.

ب. کەسێکیش نەبێت کە بێ بەشی بکات لە میرات.

تێبینی: دەکرێت کە لە دوای لێدەرکردنی بەشی خاوەن بەشەکان هیچ لە میراتەکە نەمێنێتەوە، بۆ یە هەر کەسێك کە عەصەبە بێت لەم حاڵەتەدا بێ بەش دەبێت، بۆیە ئەگەر لێرەدا هەموو میراتەکە لەلایەن خاوەن بەشەکانەوە برابێت، و هیچ بۆ خوشك و برا باوکیەکە نەمابێتەوە، ئەوا بێ بەش دەبن لە میرات.

(٥) (عصبة مع الغیر): یەك خوشکی باوکی بێت یان زیاتر، ئەویش بە چوار مەرج:

أ. مردوەکە کچ یان کچی کوڕی هەبێت.

ب. کەسێکی لەگەڵدا نەبێت کە بیکات بە عەصەبە، وەك برای باوکی.

ت. کەسێکی لەگەڵدا نەبێت کە بێ بەشی بکات لە میرات.

جا لەم کاتە دا ئەوەی کە لە بەشی خاوەن بەشەکان دەمێنێتەوە ئەم خوشکە دایك و باوکیە بە عەصەبەگەرایەتی دەیبات.

بۆ نمونە: پیاوێك مردوە: کچێك، و ژنێك، و دایك، و دوو خوشکی باوکی لە پاش بەجێ ماوە، ئەوا: کچەکە نیوە دەبات، و ژنەکەش هەشت یەك دەبات، و دایکەکەش شەش یەك دەبات، و ئەوەی کە دەمێنێتەوە دوو خوشکە باوکیەکە بە عەصەبەگەرایەتی دەیبەن.

(٦) بێ بەش دەبێت لە میرات: ئەویش بە یەکێك لەم شەش مەرجەی خوارەوە:

أ. مردوەکە کوڕی هەبێت.

ب. مردوەکە کوڕی کوڕی هەبێت.

ت. مردوەکە باوکی هەبێت.

پ. مردوەکە برای دایك و باوکی هەبێت.

ج. مردوەکە دوو خوشکی دایك و باوکی هەبێت، و لە هەمان کاتدا خوشکە باوکیەکەش کەسێکی لەگەلدا نەبێت کە بیکات بە عەصەبە، وەك برای باوکی.

ح. مردوەکە خوشکێکی دایك و باوکی هەبێت کە ئەو خوشکە دایك و باوکیە بووبێت بە (عصبة مع الغیر).

بۆ نمونە: کەسێك مردوە: کچێك، و دایك، و خوشکێکی دایك و باوکی، و خوشکێکی باوکی لە پاش بەجێ ماوە، ئەوا: کچەکە نیوە دەبات، و دایکەکەش شەش یەك دەبات، و ئەوەی کە دەمێنێتەوە خوشکە دایك و باوکیەکە بە عەصەبەگەرایەتی دەیبات، و خوشکە باوکیەکەش بێ بەش دەبێت.

**سێ یەم: ئەو حاڵەتانەی کە جارێك وەك خاوەن بەشی دیاری کراو میرات دەبەن، و جارێکیش وەك عەصەبە، وە دەشگونجێ لە یەك مەسئەلەدا بە هەردوو جۆرەکە میرات ببەن.**

وەك لە پێشەوە باسمان کرد: ئەو میرات بەرانەی کە هەم وەك خاوەن بەشی دیاری کراو، هەم وەك عەصەبە میرات دەبەن، ، وە دەشگونجێ لە یەك مەسئەلەدا بە هەردوو جۆرەکە میرات ببەن، دوو کەسن: باوك، و باپیرە.

**(١) حاڵەتەکانی باوك**

(١) شەش یەك دەبات وەك خاوەن بەش: ئەویش بە مەرجێك مردوەکە کوڕ یان کوڕی کوڕی هەبێت.

بۆ نمونە: کەسێك مردوە: باوك، و کوڕێکی (یان کوڕی کوڕێکی) لە پاش بەجێ ماوە، ئەوا: باوکەکە شەش یەك دەبات، و ئەوەی کە دەمێنێتەوە کوڕەکە (یان کوڕی کوڕەکە) بە عەصەبەگەرایەتی دەیبات.

(٢) (عصبة بالنفس) هەموو میراتەکە یان ئەوەی لە خاوەن بەشەکان دەمێنێتەوە بە عەصەبەگەرایەتی دەیبات، ئەویش بە دوو مەرج:

أ. مردوەکە منداڵی نەبێت.

ب. مردوەکە کوڕەزای نەبێت.

بۆ نمونە: کەسێك مردوە: تەنها باوکی لە پاش بەجێ ماوە، ئەوا: هەموو میراتەکە بە عەصەبەگەرایەتی دەبات.

نمونەیەکی تر: پیاوێك مردوە: ژنێك، و باوکی لە پاش بەجێ ماوە، ئەوا: ژنەکە چوار یەك دەبات، و ئەوەی کە دەمێنێتەوە باوکەکە بە عەصەبەگەرایەتی دەیبات.

(٣) شەش یەك دەبات وەك خاوەن بەش، و ئەوەش لە خاوەن بەشەکان دەمێنێتەوە بەعەصەبەگەرایەتی دەیبات، ئەویش بە مەرجێك: مردوەکە کچ یان کچی کوڕی هەبێت.

بۆ نمونە: ژنێك مردوە: مێرد، و کچێك، و باوکی لە پاش بەجێ ماوە، ئەوا: مێردەکە چوار یەك دەبات، و کچەکەش نیوە دەبات، باوکەکەش شەش یەك دەبات، و ئەوەشی کە دەمێنێتەوە بە عەصەبەگەرایەتی دەیبات.

## (٢) حاڵەتەکانی باپیرە

(١) شەش یەك دەبات وەك خاوەن بەش، ئەویش بە مەرجێك کە: مردوەکە کوڕ یان کوڕی کوڕی هەبێت.

بۆ نمونە: پیاوێك مردوە: ژنێك، و باپیرە، و کوڕێکی لە پاش بەجێ ماوە، ئەوا: ژنەکە هەشت یەك دەبات، و باپیرەش شەش یەك دەبات، و ئەوەشی کە دەمێنێتەوە کوڕەکە بە عەصەبەگەرایەتی دەیبات.

(٢) (عصبة بالنفس) هەموو میراتەکە یان ئەوەی لە خاوەن بەشەکان دەمێنێتەوە بە عەصەبەگەرایەتی دەیبات، ئەویش بە دوو مەرج:

أ. مردوەکە منداڵی نەبێت.

ب. مردوەکە کوڕەزای نەبێت.

بۆ نمونە: کەسێك مردوە: تەنها باپیرەی لە پاش بەجێ ماوە، ئەوا: هەموو میراتەکە بە عەصەبەگەرایەتی دەبات.

نمونەیەکی تر: ژنێك مردوە: مێرد، و باپیرەی لە پاش بەجێ ماوە، ئەوا: مێردەکە نیوە دەبات، و ئەوەی کە دەمێنێتەوە باپیرە بە عەصەبەگەرایەتی دەیبات.

(٣) شەش یەك دەبات وەك خاوەن بەش، و ئەوەش کە لە خاوەن بەشەکان دەمێنێتەوە بەعەصەبەگەرایەتی دەیبات، ئەویش بە مەرجێك کە: مردوەکە کچ یان کچی کوڕی هەبوو.

بۆ نمونە: پیاوێك مردوە: ژن، و یەك کچی کوڕ، و باپیرەی لە پاش بەجێ ماوە، ئەوا: ژنەکە هەشت یەك دەبات، و کچی کوڕەکەش نیوە دەبات، باپیرەش شەش یەك دەبات، و ئەوەشی کە دەمێنێتەوە بە عەصەبەگەرایەتی دەیبات.

(٤) بێ بەش دەبێت لە میرات، ئەویش بە یەکێك لەم دوو مەرجەی خوارەوە:

أ. مردوەکە باوکی هەبێت.

ب. مردوەکە باپیرەیەکی تری هەبێت کە لە پلەدا لە ئەو نزیك تر بێت لە مردوەکەوە.

بۆ نمونە: باوکی باوکی باوك، بێ بەش دەبێت بە باوکی باوك.

# خشتەی ئەو حاڵەتانەی کە میراتبەرانی تێدەکەوێت

| میرات بەر | حاڵەتەکان | ڕوون کردنەوە | تێبینی |
|---|---|---|---|
| (١) مێرد | دوو حاڵەت | ١. نیوە دەبات، کاتێك کە ژنەکەی منداڵ، یان کوڕەزای نەبێت .<br>٢. چواریەك دەبات، کاتێك کە ژنەکەی منداڵ یان کوڕەزای هەبێت. | لە میرات بێبەش ناکرێت، بەڵاّم بەشەکەی کەم دەکرێتەوە. |
| (٢)ژن | دوو حاڵەت | ١. چواریەك دەبات، کاتێك کە مێردەکەی منداڵ، یان کوڕەزای نەبێت .<br>٢. هەشتیەك دەبات، کاتێك کە مێردەکەی منداڵ یان کوڕەزای هەبێت . | لە میرات بێبەش ناکرێت، بەڵاّم بەشەکەی کەم دەکرێتەوە. |
| (٣)باوك | سێ حاڵەت | ١. شەش یەك دەبات کاتێك کە مردوەکە کوڕ یان کوڕی کوڕی هەبێت.<br>٢. عەصەبەگەرایەتی، کاتێك کە مردوەکە منداڵ یان کوڕەزای نەبێت.<br>٣. شەش یەك دەبات، و پاشماوەکەش دەبات بە عەصەبەگەرایەتی، کاتێك کە مردوەکە کچ یان کچی کوڕی هەبێت. | لە میرات بێبەش ناکرێت، بەڵاّم بەشەکەی کەم دەکرێتەوە. |
| (٤)باپیرەی دروست | چوار حاڵەت، سەرەڕای ئەو حاڵەتانەی کە لەگەڵ برا و خوشك دایە. | ١.، ٢.، ٣. هەمان سێ حاڵەتەکانی باوك .<br>٤. بێ بەش دەبێت لە میرات، کاتێك کە مردوەکە باوکی هەبێت، یان باپیرەیەکی دروستی تری هەبێت کە لە پلەدا نزیك تر بێت لە مردوەکەوە. | هەندێك جار لە میرات بێ بەش دەاکرێت، وە هەندێك جاریش بەشەکەی کەم دەکرێتەوە. |

| میرات بەر | حاڵەتەکان | ڕوون کردنەوە | تێبینی |
|---|---|---|---|
| (٥)کچ | سێ حاڵەت | ١. نیوە دەبات، ئەگەر یەك کچ بێت، و کەسێکیشی لەگەڵدا نەبێت کە بیکات بە عەصەبە.<br>٢. دووسێیەك دەبەن، ئەگەر دوان یان زیاتر بن، و کەسێکیشیان لەگەڵدا نەبێت کە بیانکات بە عەصەبە.<br>٣. عەصەبە گەرایەتی (عصبة بالغیر)، کاتێك کە لەگەڵ کوڕی مردوەکەدا کۆببێتەوە، ئەویش بەپێی یاسای: للذکر مثل حظ الأنثیین. | لە میرات بێبەش ناکرێت، بەلاّم بەشەکەی کەم دەکرێتەوە. |
| (٦)کچی کوڕ | شەش حاڵەت | ١. نیوە دەبات، ئەگەر بەتەنها بێت، و مردوەکەش کچی نەبێت، و کوڕی کوڕێکیشی نەبێت کە لە هەمان پلەی کچی کوڕەکەدا بێت.<br>٢. دووسێیەك دەبەن، ئەگەر دوان یان زیاتر بن، و مردوەکەش کچی نەبێت، و کوڕی کوڕێکیشی نەبێت کە لە هەمان پلەی کچی کوڕەکەدا بێت.<br>٣. شەش یەك دەبات، یەکێك بێت یان زیاتر، کاتێك کە مردوەکە کچی هەبێت، و کەسیش نەبێت کە کچی کوڕەکە بکات بە عەصەبە.<br>٤. عەصەبە گەرایەتی (عصبة بالغیر)، کاتێك کە لەگەڵ کوڕی کوڕێکدا کۆببێتەوە کە لە هەمان پلەی خۆیدا بێت، (یان دەشگونجێت کە لە هەمان پلەی خۆشیدا نەبێت ، بەلاّم ئەمە لە هەندێك حاڵەتی تایبەتدا دەبێت)، و | هەندێك جار لە میرات بێ بەش دەکرێت، وە هەندێك جاریش بەشەکەی کەم دەکرێتەوە. |

| میرات بەر | حاڵەتەکان | ڕوون کردنەوە | تێبینی |
|---|---|---|---|
| | | مردووەکەش کوڕی نەبێت.<br>٥. بێ بەش دەبێت لە میرات، کاتێك کە مردووەکە دوو کچ، یان دوو کچی کوڕی لەئەو لەپێشتری هەبێت، و کەسێکیش نەبێت کە بیکات بە عەصەبە.<br>٦. بێ بەش دەبێت لە میرات، کاتێك کە مردووەکە کوڕ یان کوڕی کوڕێکی هەبێت، کە لە پلەدا لەو نزیکتربێت لە مردووەکەوە. | |
| (٧)دایك | سێ حاڵەت | ١. شەش یەك دەبات، کاتێك کە مردووەکە منداڵ یان کوڕەزای هەبێت، یان مردووەکە دوو براو خوشك یان زیاتری هەبێت.<br>٢. سێ یەکی هەموو میراتەکە دەبات، کاتێك کە مردووەکە هیچ کام لەوانەی سەرەوەی نەبێت.<br>٣. سێیەکی پاشماوەی خاوەن بەشەکان، لە دوو مەسئەلەکەی غەڕاوەین دا. | لە میرات بێبەش ناکرێت، بەڵام بەشەکەی کەم دەکرێتەوە. |
| (٨)داپیرە ی دروست (نەنك) | دوو حاڵەت | ١. شەش یەك دەبات، یەك یێك بێت یان زیاتر، بەمەرجێك کە لە هەمان پلەی نزیکیدابن لە مردووەکەوە.<br>٢. بێ بەش دەبێت لە میرات، کاتێك کە مردووەکە دا دایکی هەبێت، یان داپیرێکی هەبێت کە نزیکتربێت لە مردووەکەوە، هەروەها ئەگەر داپیرەکە باوکی بێت، ئەوا بێجگە لوانەی کە باسمان کردن، بە باوك، و بە باپیرەیەکیش | لە هەندێك حاڵەت دا لە میرات بێ بەش دەبێت. |

| میرات بەر | حاڵەتەکان | ڕوون کردنەوە | تێبینی |
|---|---|---|---|
| | | کە بەهۆیەوە داپیرەکە دەگات بە مردووەکە، بەم دوانەش بێ بەش دەبێت. | |
| (٩)خوشکی دایك و باوکی | پێنج حاڵەت | ١. نیوە دەبات، ئەگەر یەك خوشك بێت، و کەسێکیشی لەگەڵدا نەبێت کە بیکات بە عەصەبە.<br>٢. دووسێیەك دەبەن، ئەگەر لە یەکێك زیاتربن، و کەسێکیشیان لەگەڵدا نەبێت کە بیانکات بە عەصەبە.<br>٣. عەصەبەگەرایەتی (عصبة بالغیر)، کاتێك کە لەگەڵ برای دایك و باوکیدا بێت.<br>٤. عەصەبەگەرایەتی (عصبة مع الغیر)، کاتێك کە لەگەڵ کچ یان کچی کوڕی مردووەکەدابێت، و مردووەکەش برای دایك و باوکی نەبێت.<br>٥. بێ بەش دەبێت لە میرات کاتێك کە مردووەکە کوڕ یان کوڕی کوڕ یان باوکی هەبێت. | هەندێك جار لە میرات بێ بەش دەاکرێت، وە هەندێك جاریش بەشەکەی کەم دەکرێتەوە. |
| (١٠) خوشکی تەنها باوکی | شەش حاڵەت | ١. نیوە دەبات، ئەگەر یەك خوشك بێت.<br>٢. دووسێیەك دەبەن، ئەگەر لە یەك زیاتر بوون .<br>٣. شەش یەك دەبات، یەك خوشك بێت، یان زیاتر، کاتێك کە لەگەڵ یەك خوشکی دایك و باوکی دا کۆ ببێتەوە، و کەسیش نەبێت کە بیکات بە عەصەبە.<br>٤. عەصەبەگەرایەتی (عصبە بالغیر)، کاتێك کە لەگەڵ برای باوکیدا بێت.<br>٥. عەصەبەگەرایەتی (عصبە مع الغیر)، | هەندێك جار لە میرات بێ بەش دەاکرێت، وە هەندێك جاریش بەشەکەی کەم دەکرێتەوە. |

| میرات بەر | حاڵەتەکان | ڕوون کردنەوە | تێبینی |
| --- | --- | --- | --- |
| | | کاتێك کە لەگەڵ کچ یان کچی کوڕی مردوەکەدابێت.<br>٦. بێ بەش دەبێت لە میرات کاتێك کە مردوەکە کوڕ یان کوڕی کوڕ یان باوك یان برای دایك و باوکی، یان دوو خوشکی دایك و باوکی هەبێت، و لە هەمان کاتیشدا مردوەکە هیچ برای باوکی نەبێت. یان مردوەکە خوشکی دایك و باوکی هەبێت کە خوشکە دایك و باوکیەکە بووبێت بە (عصبة مع الغير). | |
| (١١) برا و خوشکی تەنها دایکی | سێ حاڵەت | ١. شەش یەك دەبەن، ئەگەر یەك کەس بن، چی نێر، چی مێ.<br>٢. سێ یەك دەبەن، ئەگەر لە یەك زیاتر بن، وە نێر و مێشیان یەکسانن.<br>٣. بێ بەش دەبن لە میرات، کاتێك کە مردوەکە منداڵ یان کوڕەزا یان باوك یان باپیرەی دروستی هەبێت. | لە هەندێك حاڵەت دا لە میرات بێ بەش دەبن. |

## باسی کۆبوونەوەی باپیرە لەگەڵ براو خوشکدا

لەم مەسئەلەیەدا نە دەقێکی قورئانی، و نە فەرموودەیەکی پێغەمبەری لەسەر نەهاتوە، بەڵکو ئەوەی کە هەیە تەنها ئیجتیهادی هاوەڵان و شوێن کەوتوانە و بەس [١]، هەر لەبەر ئەمە دەبینین کە ناکۆکیەکی زۆر هەیە لە نێوانیاندا، وە زانایان فەرموویانە: گفتو گۆ کردن لە بارەی کۆ بوونەوەی باپیرە لەگەڵ براو خوشکدا زۆر ترسناکە، و هەم هاوەڵان و هەم شوێن کەوتوانیش زۆر لەم مەسئەلەیە خۆیان پاراستوە، و ڕۆ نەچون تیایدا، وە لەم بارەیەوە فەرموودەیەکی پێغەمبەریان (درودی خوای لێ بێت) گێڕاوەتەوە کە فەرمویەتی: أجرأكم على قسم الجد أجرأكم على النار [٢].

واتە: چاو نەترس ترینی ئێوە لە بڕیار دان لە میراتی باپیرە و براکاندا، ئەو کەسەتانە کە لە ئاگر ناترسێت . وە حەزرەتی عەلی (خوای لێ ڕازی بێت) فەرموویەتی: من سرّه ان يتقحم جراثيم جهنم فليقض بين الجد والاخوة [٣]

واتە: کێ پێی خۆشە کە بە ڕوودا خۆی فڕێ بداتە ناو قووڵایی دۆزەخەوە، با بڕیار بدات لە چۆنێتی دابەش کردنی میرات لە نێوان باپیرە، و براکاندا. وە عەبدوڵای کوڕی مەسعود (خوای لێ ڕازی بێت) فەرموویەتی: (هەر ئیشکالێکتان

---

١) الشنشوري ١٢٤، تح٣٩٦، النهاية ١٥، المغني١٠، البجيرمي ٢٥١، الفقه الإسلامي٧٧٥٨، اللمع ١٢٧، الموسوعة / نصيب الجد مع الإخوة ٣ / ٣٤، الإعانة ٣ / ٢٣٤.

٢) سعيد ابن منصور ١ / ٤٨ / ٥٥

٣) الدارمي ٢٩٠٢، عبد الرزاق ١٩٠٤٨، ابن أبي شيبة ٣١٢٦٧، السنن الكبرى ١٢١٩٦.

لەبارەی هەر مەسئەلەیەکی ئالۆزەوە هەیە، پرسیارم لیَ بکەن، تەنها لە بارەی کۆبوونەوەی باپیرە، و براکان نەبیێت ). [(١)]

جا بە شیێوەیەکی گشتی زانایان کۆدەنگن لەسەر ئەوەی کە باپیرە بە برا بیَ بەش نابیێت، بەلاَم لەوەدا کە ئایا برا بە باپیرە بیَ بەش دەبیێت یان نا؟ بوون بە دوو مەزهەبەوە: [(٢)]

## مەزهەبی یەکەم:

پیێیان وایە کە باپیرە لە جیێگەی باوك دایە، بۆیە وەك چۆن بە بوونی باوك برا بیَ بەش دەبیێت، بە هەمان شیێوە بە بوونی باپیرەش برا هەر بیَ بەش دەبیێت.

ئەمە وتە و بۆچونی هەندیێك لە هاوەلاَنی وەك: (حەزرەتی ئەبو بەکر، و عەبدولاَی کوڕی عەبباس، و عائیشە، و عەبدولاَی کوڕی عومەر، و عەبدولاَی کوڕی زوبەیر، و ئوبەی کوڕی کەعب، و حوزەیفەی کوڕی یەمان، و ئەبو سەعیدی خودری، مەعاذی کوڕی جەبەل، و ئەبو موسای ئەشعەری، و عوبادەی کوڕی صامت ) خوا لە هەموویان ڕازی بیێت، و هەندیێك لە تابعین، وەك: (حەسەنی بەصری، و عومەری کوڕی عەبدولعەزیز، و ئیبنو سیرین، و شورەیح ) ە، وە ئەمەش مەزهەبی ئیمامی ئەبو حەنیفەیە، وە بۆچونی هەندیێك لە شافیعی مەزهەبەکانە، وەك: ئیبنو جەریری طەبەری، و موزەنی، و ئەبو ثەور.

---

٤) الشنشوري ١٢٥، المجموع ١٨٧، مغني المحتاج ٣ / ٢١.

١) المجموع ١٨٢، المغني ٢١، مغني ابن قدامة ٧ / ٦٤، ابن آدم ٧١، الفقه الإسلامي ٧٧٥٩، المفصل ١١ / ٢٨٦ – ٢٨٧، الدرة ٩١، اللمع ١٢٧ – ١٢٨، الموسوعة ٣ / ٣٣، الكنوز ٢٠٩.

مەزهەبی دووەم:

پێیان وایە كە باپیرە برا بێ بەش ناكات، بەڵكو دەبێتە هاوبەشیان لە میرات بردن دا، و وەك برایەك مامەڵەی لەگەڵدا دەكرێت.

ئەمەش وتە و بۆچونی هەندێك لە هاوەڵانی وەك: (حەزرەتی عومەر، و عەلی، و زەیدی كوڕی ثابیت، و عەبدوڵای كوڕی مەسعود)، وە ئەمەش مەزهەبی هەرسێ ئیمامەكەی تر، و ئیمامی ئەوزاعی، و سوفیانی ثەوری، و دوو هاوەڵەكەی ئیمامی ئەبو حەنیفە — ئەبو یوسف، و موحەممەد —.

## ئەو بەڵگانەی كە هەر یەك لەم دوو مەزهەبە پشتیان پێ بەستوە

بەڵگەكانی مەزهەبی یەكەم:

**(١)** زۆرێك لە ئایەتە قورئانیەكان، و فەرموودەكانی حەزرەت وشەی باوكیان تێدا بەكار هێنراوە، و مەبەستیش پێی باپیرەیە :

أ. ئایەتەكان وەك: ﴿مِّلَّةَ أَبِيكُمْ إِبْرَٰهِيمَ ﴿٧٨﴾﴾ المؤمنون، وە : ﴿كَمَآ أَتَمَّهَا عَلَىٰٓ أَبَوَيْكَ مِن قَبْلُ إِبْرَٰهِيمَ وَإِسْحَٰقَ ﴿٦﴾﴾ یوسف، وە : ﴿وَٱتَّبَعْتُ مِلَّةَ ءَابَآءِيٓ إِبْرَٰهِيمَ وَإِسْحَٰقَ وَيَعْقُوبَ ﴿٣٨﴾﴾ یوسف.

ب. فەرموودەكانیش وەك: ارموا بني إسماعيل فإن أباكم كان راميا [١]، وە: سام أبو العرب وحام أبو الحبش و يافث أبو الروم [٢]. وە: نحن بنو النضر بن كنانة لانقفو أمنا ولا ننتفي من أبينا. [٣]

---

١) البخاري ٢٧٤٣، ٣٣١٦.

٢) الترمذي ٣٢٣١، أحمد ٢٠١١١، المعجم الكبير ٦٨٧١.

٣) ابن ماجة ٢٦١٢، أحمد ٢١٨٨٨، الطيالسي ١٠٤٩، المعجم الكبير ٦٤٥.

کەواتە وەك چۆن برا بە باوك بێ بەش دەبێت، هەروا بە باپیرەش بێ بەش دەبێت.

**(٢)**لە فەرموودەیەکی پێغەمبەردا هاتوە کە: میرات بدەن بە خاوەن بەشە دیاری کراوەکان، وە هەرچیش کە مایەوە بیدەن بە نزیکترین، و لەپێش ترین نێرینە. خۆ باپیرەش لە برا لە پێش ترە، چونکە لە ڕیز بەندی عەصەبەکاندا لایەنی باوکایەتی لە پێش لایەنی کوڕێتیەوەیە. [١]

**(٣)**نزیکی باپیرە – باوکی باوك -- لە مردوەوە وەك نزیکی کوڕی کوڕ وایە، جا وەك چۆن کوڕی کوڕ دەچێتە جێگەی کوڕ لەوەدا کە برا بێ بەش دەکات، بە هەمان شێوە باپیرەش دەچێتە جێگەی باوك لەوەدا کە برا بێ بەش دەکات. هەر بۆیە دەبینین لە گفتوگۆیەکی نێوان حەزرەتی عومەر لە لایەك، و حەزرەتی عەلی و زەیدیش لە لایەك، حەزرەتی عومەر فەرمووی: (کیف یکون ابني و لا أکون أباه!) [٢] واتە: چۆن دەبێت کوڕی کوڕ بە کوڕ بژمێررێت لەوەدا کە برا بێ بەش دەکات!! بەلاٌم باوکی باوك بە باوك نەژمێررێت لەوەدا کە برا بێ بەش بکات!!. وە عەبدولاّی کوڕی عەباس فەرموویەتی: ئەوە چۆنە وا زەیدی کوڕی ثابت لە خودا ناترسێت!! کوڕی کوڕ بە کوڕ دادەنێت، کەچی باوکی باوك بە باوك دا نانێت!!. [٣]

---

٤) الفقه الإسلامي ٧٧٥٩.

١) السنن الکبری ١٢٢٠٧، جامع بیان العلم حدیث: ١٠٢١

٢) المجموع ١٨٣، الفقه الإسلامي ٧٧٥٩، الکنوز ٢١٠

## بەڵگەکانی مەزهەبی دوەم: [١]

(١) میرات بردنی برا بەڵگەی قورئانی لە سەرە، کەواتە ناکرێت لە میرات بێ بەش بکرێت مەگەر کاتێك نەبێت کە بەڵگەیەکی قورئانی یان کۆ دەنگی زانایانی لە سەر بێت.

(٢) باپیرە، و برا لە یەك پلە دان لە نزیکیان لە مردوەکەوە، کەواتە وەك چۆن برا باپیرە بێ بەش ناکات، هەروا باپیرەش برا بێ بەش ناکات. هەر بۆیە کە ئیمامی عەلی نمونەی دەهێنایەوە بۆ یەکسانی نزیکی باپیرە و برا لە مردوەکەوە، دەیفەرموو: ئەگەر دارێك دوو پەلی لێ ببێتەوە، ئەوا هەردوو پەلەکە وەك یەك نزیکن لە ئەصڵی دارەکەوە. وە ئیمامی زەیدیش دەیفەرموو: ئەگەر چەماوێك (یان ڕووبارێك) دوو جۆگەی لەملاولاوە لێ بکرێتەوە، ئەوا هەردوو جۆگەکە وەك یەك لە چەمەکەوە نزیکن.

## وەڵامی مەزهەبی دوەم بۆ مەزهەبی یەکەم [٢]

ئەوەی کە لە ئایەتەکاندا هاتوە کە وشەی باوك بەکار هێنراوە بۆ باپیرە، ئەوە مەجازە، بەمەش ئەم بەکار هێنانە وا ناخوازێت کە باپیرە وەك باوك وابێت لە هەموو ڕویەکەوە، وەك چۆن وشەی دایك بەکار دەهێنرێت بۆ داپیرەش، لەگەڵ ئەوەشدا داپیرە مامەڵەی دایکی لەگەڵدا ناکرێت کاتێك کە مردوەکە دایکی نەبێت. وەك لە پێشەوە باسمان کرد.

---

٣) المجموع ١٨٣، مغني ابن قدامة ٧ / ٦٤؛ الفقه الإسلامي ٧٧٦٠، الموسوعة / حالات الجد الصحيح / الجد مع الإخوة ٣ / ٣٣.

١) المجموع ١٨٣.

## کۆ بوونەوەی باپیرە لەگەڵ برا و خوشکی دایك و باوکی، یان برا و خوشکی تەنها باوکی

هەر کاتێك باپیرە لەگەڵ برا و خوشکی دایك و باوکی، یان برا و خوشکی باوکی دا کۆ بوویەوە، ئەوا باپیرەکە بە یەکێك لەم چوار شێوە میرات دەبات:

(١) برا بەشی، واتە وەك برایەك مامەڵەی لەگەڵ دا دەکرێت.

(٢) سێ یەکی هەموو میراتەکە.

(٣) سێ یەکی پاشماوەی میرات بەرە خاوەن بەشەکان.

(٤) شەش یەکی هەموو میراتەکە.

بەڵاّم بۆ ئەوەی کە بزانرێت ئایا بە کام لەم چوار شێوەیە میرات دەبات دوو حاڵەتمان هەیە:

١) خاوەن بەشی دیاری کراویان لەگەڵدا نیە.

٢) خاوەن بەشی دیاری کراویان لەگەڵدایە.

## حاڵەتی یەکەم

ئەگەر خاوەن بەشی دیاری کراویان لەگەڵدا نەبوو، ئەوا باپیرەکە سەر پشکە لە نێوان دوو جۆر میرات بردن دا: [١]

(١) سێ یەکی هەموو میراتەکە وەك خاوەن بەش دەبات. زانایان فەرموویانە: لەبەر ئەوە کە باپیرە لە زۆربەی مەسئەلەکاندا کە لەگەڵ دایکی مردوەکەدا کۆ دەبێتەوە بەشەکەی دوو بەرامبەری بەشی دایکەکەیە، جا لەبەر ئەوەی کە برا و خوشك ناتوانن بەشی دایك لە شەش یەك کەمتر بکەنەوە، کەواتە ناشتوانن کە بەشی باپیرە لە دوو بەرامبەری بەشی دایك کەمتر بکەنەوە.

١) التحفة ٤١٢، النهاية ٢٥، المغني ٢٢، شرح المنهج ٦ / ٨٥.

(٢) دەبێتە هاوبەشی برا و خوشکەکان (برا بەشی)، و وا دادەنرێت کە ئەمیش برایەکی ترە، ئەو کاتە بەعەصەبەگەرایەتی میرات دەبات، زانایان فەرموویانە: باپیرە، و برا وەك یەك وەهان لەوەدا کە هەردووکیان بە هۆی باوکەوە دەگەن بە مردوەکە، چونکە باپیرە باوکی باوکە، و براش کوڕی باوکە، جا کەوا بوو دەبێت وەك یەك میرات ببەن.

بەلاّم لەم دوو جۆرەدا کامیان سوودی زۆرتر بوو، و زیاتر بوو باپیرە ئەوەیان دەبات. چونکە باپیرە هەم وەك خاوەن بەشی دیاری کراو، و هەم وەك عەصەبە میرات دەبات، وە هەر کەسێك کە بەم دوو شێوە میرات ببات کامیان بۆی باشتر بێت بەوەیان دەیبات. شێخی نۆدی دەفەرموێت:

الـجد مع فرع أب، أو ولـد لأبـويـن فـائـز بـالأزيـد
من ثلث، و القسم عـند فقـد صاحب فرض، كأخ و جد

ئەوجا وەك یاسایەکی گشتی بۆ ئەوەی کە بزانرێت، ئایا سێ یەکی هەموو میراتەکە زۆرترە، و سوودی زۆرترە، یان هاوبەشیەکە، دەڕوانین: [1]

## یەکەم:

ئەگەر ژمارەی برا و خوشکەکان کەمتر بوو لە دوو بەرامبەری باپیرەکە، ئەوا هاوبەشی کردنەکە زیاترە، و سوودی زۆرترە بۆ باپیرەکە، ئەمیش پێنج شێوە دەگرێتەوە:

(١) باپیرە لەگەڵ یەك خوشك دا بێت.

| | |
|---|---|
| ئەصڵی مەسئەلە | ٣ |
| باپیرە | ٢ |
| یەك خوشك | ١ |

١) المغني ٢٢، شرح المنهج ٦ / ٨٦، الأنوار ٢ / ٥، الموسوعة / حالات الجد الصحيح ٣ / ٣٤، الفقه المنهجي ٣١٦.

(٢) باپیره لەگەڵ یەك برا دا بێت.

| | |
|---|---|
| ئەصڵی مەسئەلە | ٢ |
| باپیره | ١ |
| یەك برا | ١ |

(٣) باپیره لەگەڵ دوو خوشك دا بێت.

| | |
|---|---|
| ئەصڵی مەسئەلە | ٤ |
| باپیره | ٢ |
| دوو خوشك | ٢ |

(٤) باپیره لەگەڵ برا و خوشکێك دا بێت.

| | |
|---|---|
| ئەصڵی مەسئەلە | ٥ |
| باپیره | ٢ |
| یەك برا | ٢ |
| یەك خوشك | ١ |

(٥) باپیره لەگەڵ سێ خوشك دا بێت.

| | |
|---|---|
| ئەصڵی مەسئەلە | ٥ |
| باپیره | ٢ |
| سێ خوشك | ٣ |

دوەم:

ئەگەر ژمارەی برا و خوشکەکان زیاتر بوو لە دوو بەرامبەری باپیرەکە، ئەوا سێ یەکی هەموو میراتەکە زیاترە، و باشترە لە هاوبەشی کردنەکە، کە ئەمیش زۆر شێوە دەگرێتەوە، بۆ نمونە:

(١) باپیرە لەگەڵ دوو برا و خوشکێك دا بێت.

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| ئەصڵی مەسئەلە | | | ٣ ← × ٥ | ١٥ |
| باپیرە | | سێیەك | ١ | ٥ |
| دوو برا | | عەصەبە | ٢ | ٨ |
| یەك خوشك | | | | ٢ |

(٢) باپیرە لەگەڵ برایەك و سێ خوشك دا بێت.

| | | | |
|---|---|---|---|
| ئەصڵی مەسئەلە | | ٣ ← × ٥ | ١٥ |
| باپیرە | سێیەك | ١ | ٥ |
| یەك برا | عەصەبە | ٢ | ٤ |
| سێ خوشك | | | ٦ |

(٣) باپیرە لەگەڵ پێنج خوشك دا بێت.

| | | | |
|---|---|---|---|
| ئەصڵی مەسئەلە | | ٣ ← × ٥ | ١٥ |
| باپیرە | سێیەك | ١ | ٥ |
| دوو خوشك | | ٢ | ١٠ |

(٤) باپیرە لەگەڵ سێ برا دا بێت.

| ئەصڵی مەسئەلە | | ٣ ← × ٣ | ٩ |
|---|---|---|---|
| باپیرە | سێیەك | ١ | ٣ |
| سێ برا | عەصەبە | ٢ | ٦ |

و بە هەمان شێوە هەتا ژمارەی براو خوشکەکان بەرەو زیاتر بڕوات.

## سێ یەم:

ئەگەر ژمارەی برا و خوشکەکان یەکسان بوو بە دوو بەرامبەری باپیرەکە، ئەوا هیچ جیاوازی نیە لەوەدا کە سێ یەك ببات، یان ببێتە هاوبەشیان، کە ئەمیش سێ شێوە دەگرێتەوە:

(١) باپیرە لەگەڵ دوو برا دا بێت.

| ئەصڵی مەسئەلە | | ٣ |
|---|---|---|
| باپیرە | برابەشی = سێیەك | ١ |
| دوو برا | | ٢ |

(٢) باپیرە لەگەڵ برایەك، و دوو خوشك دا بێت.

| ئەصڵی مەسئەلە | | ٦ |
|---|---|---|
| باپیرە | برابەشی = سێیەك | ٢ |
| یەك برا | | ٢ |
| دوو خوشك | | ٢ |

(٣) باپیرە لەگەڵ چوار خوشك دا بێت.

| | | |
|---|---|---|
| ئەصڵی مەسئەلە | | ٦ |
| باپیرە | برابەشی = سێیەك | ٢ |
| چوار خوشك | | ٤ |

جا ئەگەر باپیرەکە سێ یەکی میراتەکەی برد، ئەوا پاشماوەکەی دابەش دەکرێت بەسەر برا و خوشکەکاندا بە پێی یاسای: (للذّكر مثل حظّ الأنثيين).

شێخی نۆدی سەبارەت بەم سێ حاڵەتە دەفەرموێت:

قلت: هما مع ضعف جدّ شرع ودون مثليــه الأخير أنفع
ومع فــوق ضعـفــه فــأكـثر ثلث و ما صوره تنحصر

## حاڵەتی دوەم

ئەگەر خاوەن بەشی دیاری کراویان لەگەڵدا بوو، وە ئەوەی کە لە بەشی خاوەن بەشەکان دەمێنێتەوە لە شەش یەکی میراتەکە زیاتر بوو، ئەوا باپیرەکە سەر پشکە لە نێوان سێ جۆر میرات بردن دا:

(١) شەش یەکی هەموو میراتەکە دەبات. چونکە لە جێگەیەك کە منداڵی مردوەکە نەتوانن باپیرە لە شەش یەك بێ بەش بکەن، کەواتە برا و خوشکەکانیش ناتوانن بەشەکەی لە شەش یەك کەمتر بکەنەوە.

(٢) سێ یەکی ئەوەی کە لە خاوەن بەشەکان دەمێنێتەوە. چونکە ئەگەر مەسئەلەکە خاوەن بەشی تێدا نەبێت، ئەوا باپیرە سێ یەکی هەموو میراتەکە دەبات، وەك باسمان کرد، جا ئێستەش پاش ئەوەی کە خاوەن بەشەکان بەشی دیاری کراوی خۆیان برد، دووبارە مەسئەلەکە وەك ئەوەی لێ دێتەوە کە خاوەن بەشی تێدا نەبێت.

(٣) برا بەشی لەوەی کە لە خاوەن بەشەکان دەمێنێتەوە. بە هەمان بەڵگەی پێشوو کە باسمان کرد.

هەروەها لەم سێ جۆرەشدا کامیان سوودی زۆرتر بوو، و زیاتر بوو باپیرەکە ئەوەیان دەبات. شێخی نۆدی دەفەرموێت:

أو فائز من قسمة، وسدس وثلث الباقي بأخذ الأنفَس

جا بزانە کە ئەو خاوەن بەشانەی کە دەگونجێت کۆ ببنەوە لەگەڵ باپیرە، و برا و خوشك دا بریتین لە: کچ، و کچی کوڕ، دایك، و داپیرە، و ژن، یان مێرد.

ئەوجا وەك یاسایەکی گشتی بۆ ئەوەی کە بزانرێت، ئایا کام لەم سێ جۆرە زیاترە، و سودی زۆرترە بۆ باپیرەکە، دەڕوانین:

یەکەم:

ئەگەر بەشی خاوەن بەشەکان نیوەی میراتەکە بوو، یان لە نیوە کەمتر بوو ئەوا:

(١) ئەگەر ژمارەی خوشك و براکان کەمتر بوو لە دوو بەرامبەری باپیرەکە ئەوا برا بەشیەکە سوودی زیاترە بۆی.

(٢) ئەگەر ژمارەیان لە دوو بەرامبەر زیاتر بوو، ئەوا سێ یەکی ئەوەی کە لە خاوەن بەشەکان دەمێنێتەوە، و شەش یەکی هەموو میراتەکە یەکسانن، و سوودیان زیاترە بۆی.

(٣) ئەگەر ژمارەیان یەکسان بوو بە دوو بەرامبەری باپیرەکە، ئەوا:

أ. برا بەشی، و سێ یەکی پاشماوەکە یەکسانن.

ب.هەندێك جاریش برا بەشی، و سێ یەکی پاشماوەکە، و شەش یەکی میراتەکە هەموو یەکسانن.

دووەم:

ئەگەر بەشی خاوەن بەشەکان دوو سێ یەکی میراتەکە بوو، ئەوا:

(١) ئەگەر باپیرەکە یەك خوشکی لەگەڵ دا بوو، ئەوا برا بەشیەکە سوودی زیاترە بۆی.

(٢) ئەگەر باپیرەکە برایەك، یان دوو خوشکی لەگەڵ دا بوو، ئەوا برا بەشی، و شەش یەکی میراتەکە یەکسانن.

(٣) ئەگەر لە برایەك، یان دوو خوشك زیاتری لەگەڵ دا بوو، ئەوا شەش یەکی میراتەکە سوودی زیاترە بۆی.

سێیەم:

ئەگەر بەشی خاوەن بەشەکان لە نیوە زیاتر بن، و لە دوو سێ یەك کەمتر بن، ئەوا:

(١) ئەگەر ژمارەی برا و خوشکەکان کەمتر بوو، یان یەکسان بوو بە باپیرەکە، ئەوا برا بەشیەکە سوودی زیاترە بۆی.

(٢) ئەگەر ژمارەی برا و خوشکەکان لە باپیرەکە زیاتر بوو، ئەوا شەش یەکی میراتەکە سوودی زیاترە بۆی.

بەڵام ئەگەر خاوەن بەش بەشی دیاری کراوی خۆی برد، و پاشماوەی میراتەکەش شەش یەك، یان کەمتر لە شەش یەك بوو، یان هیچ نەدەمایەوە، ئەوا لەم سێ شێوەیەدا باپیرە تەنها شەش یەك دەبات و بەس، نەك سەرپشك بێت لە نێوان شەش یەك، و سێ یەکی پاشماوە، و برابەشی دا، کامیان سوودی زیاتر بێت بۆی ئەوە ببات، جا لەم کاتەدا دەگونجێت ئەصڵی مەسئەلەکە عەولی تێدا نەکرێت — ئەویش لە کاتێك دا کە پاشماوەی میراتەکە یەکسان بێت بە شەش یەکی میراتەکە --، یان زیاد کردنی (عەول) تێدا بکرێت، جا ئیتر زیاد کردنەکە کەمتر بێت لە شەش یەك، — ئەویش لە کاتێك دا کە پاشماوەی میراتەکە کەمتر

بێت لە شەش یەك --، یان زیاد کردنەکە یەکسان بێت بە شەش یەك — ئەمەیش لە کاتێك دا کە هیچ لە خاوەن بەش نەمێنێتەوە --.

وا لەمەولا بۆ زیاتر ڕوون کردنەوەی هەر یەك لەو شێوە و حاڵەتانە چەند نمونەیەك دەهێنینەوە:

## نمونەی ئەو حاڵەتانەی کە خاوەن بەشیان لەگەڵ دا نیە

یەکەم:

ژمارەی برا و خوشکەکان کەمترە لە دوو بەرامبەری باپیرەکە.

کەسێك مردوە: باپیرە، و برا و خوشکێکی لە پاش بەجێ ماوە، ئەوا میراتەکە دەکرێت بە پێنج بەشەوە، دوو بەش بۆ باپیرەکە، و دوو بەشیش بۆ براکە، و یەك بەشیش بۆ خوشکەکە.

جا لێرەدا برا بەشی سوودی زیاترە بۆ باپیرەکە.

| ئەصڵی مەسئەلە | | ٥ |
|---|---|---|
| باپیرە | برا بەش | ٢ |
| یەك برا | | ٢ |
| یەك خوشك | | ١ |

دوەم:

ژمارەی برا و خوشکەکان زیاترە لە دوو بەرامبەری باپیرەکە.

کەسێك مردوە: باپیرە، و سێ برای لە پاش بەجێ ماوە، ئەوا میراتەکە دەکرێت بە سێ بەشەوە، سێ یەکی بۆ باپیرەکە، و ئەو دوو بەشەکەش کە دەمێنێتەوە بۆ سێ براکە، بەڵام لەبەر ئەوەی کە دوو بەسەر سێ دا دابەش

ناکرێت، بۆیە ئەصڵی مەسئەلەکە لێکدانی سێ دەکەین کە ژمارەی سەری براکانە، بەمەش ئەصڵی مەسئەلەکە دەبێت بە نۆ (٩)، سێ (٣) بەش بۆ باپیرەکە، و شەش (٦) بەشیش بۆ سێ براکە، بەمەش هەریەکەیان دوو (٢) بەشی دەکەوێت.

جا لێرەدا سێ یەکی میراتەکە زۆرە، و سوودی زیاترە بۆ باپیرەکە.

| | | | |
|---|---|---|---|
| ئەصڵی مەسئەلە | | ٣ ← × ٣ | ٩ |
| باپیرە | سێیەك | ١ | ٣ |
| سێ برا | عەصەبە | ٢ | ٦ |

سێیەم:

ژمارەی برا و خوشکەکان یەکسانە بە دوو بەرامبەری باپیرەکە.

کەسێك مردوە: باپیرە، و برایەك، و دوو خوشکی لە پاش بەجێ ماوە، ئەوا: ئەگەر باپیرەکە هاوبەشیان لەگەڵ دا بکات، میراتەکە دەکرێت بە شەش (٦) بەشەوە، دوو (٢) بەشی بۆ باپیرەکە، و دوو (٢) بەشیشی بۆ براکە، و دوو (٢) بەشیشی بۆ دوو خوشکەکە، هەر یەکەو بەشێك. بەڵام ئەگەر باپیرەکە سێ یەك ببات، ئەوا ئەصڵی مەسئەلەکە لە سێ یە، یەك (١) بەشی بۆ باپیرەکە، دوو بەشیشی بۆ برا و دوو خوشکەکە بە پێی یاسای: (للذّكر مثل حظّ الأنثيين)، بەمەش براکە یەك (١) بەش دەبات، و دوو خوشکەکەش یەك (١) بەش، جا لەبەر ئەوەی کە یەك دابەش ناکرێت بەسەر دوو دا، بۆیە دەبێت ئەصڵی مەسئەلەکە لێکدانی دوو بکەین، بەمەش ئەصڵی مەسئەلەکە دەبێت بە: شەش (٦)، دوو (٢) بەشی بۆ باپیرەکە، و دوو (٢) بەشیشی بۆ براکە، و دوو (٢) بەشیشی بۆ دوو خوشکەکە، هەریەکەو بەشێك.

جا وەك دەبینین جیاوازی نیە لەوەدا کە ئایا باپیرەکە برا بەشیان لەگەڵ دا بکات، یان سێ یەکی میراتەکە ببات، و لە هەر دوو شێوەکە دا بەشەکەی یەکسانن.

| ئەصڵی مەسئەلە | | ٦ |
|---|---|---|
| باپیرە | برابەشی = سێیەکی پاشماوە | ٢ |
| یەك برا | | ٢ |
| دوو خوشك | | ٢ |

## نمونەی ئەو حاڵەتانەی کە خاوەن بەشیان لەگەڵ دایە بەشی خاوەن بەشەکانیش یان نیوەیە یان لە نیوە کەمترە

ئەو خاوەن بەشانەی کە نیوە دەبەن برتین لە: مێرد، و کچ، و کچی کوڕ.
ئەو خاوەن بەشانەی کە لە نیوە کەمتر دەبەن بریتین لە: ژن، و دایك.
ئەو بەشانەی کە لە نیوە کەمترن بریتین لە: سێ یەك، و چوار یەك، و شەش یەك.

### یەکەم:

ژمارەی برا و خوشکەکان کەمترە لە دوو بەرامبەری باپیرەکە.

کەسێك مردوە: کچێك، و باپیرە، و برایەکی لە پاش بەجێ ماوە، ئەوا: کچەکە نیوە دەبات، و ئەصڵی مەسئەلەکەش لە دوو (٢) ە، کچەکە یەك (١) بەشی دەبات، ئەوەشی کە دەمێنێتەوە باپیرە و براکە بە هاوبەشی دەیبەن، بەڵام لەبەر ئەوی کە یەك بەشە، و دابەش ناکرێت بەسەر ژمارەیان دا کە دوو (٢)

کەسن، بۆیە ئەصڵی مەسئەلەکە لێکدانی دوو دەکەین، بەمەش ئەصڵی مەسئەلەکە دەبێت بە چوار (٤)، دوو (٢) بەشی بۆ کچەکە، و دوو (٢) بەشەکەی تریشی بۆ باپیرە و براکە، هەر یەکەیان بەشێك.

جا لێرەدا برا بەشی سوودی زیاترە بۆ باپیرەکە.

| ئەصڵی مەسئەلە | | ٢ ⟵× ٢ | ٤ |
|---|---|---|---|
| یەك کچ | نیوە | ١ | ٢ |
| باپیرە | برا بەش | ١ | ٢ |
| یەك برا | | | |

دووەم:

ژمارەی برا و خوشکەکان زیاترە لە دوو بەرامبەری باپیرەکە.

ژنێك مردوە: مێرد، و باپیرە، و سێ برای لە پاش بەجێ ماوە، ئەوا: مێردەکە نیوە دەبات، و باپیرەکەش سێ یەکی پاشماوەك دەبات، و ئەوەشی کە دەمێنێتەوە سێ براکە بە هاوبەشی دەیبەن، جا لێرەدا لەبەر دەرهاتنی بەشی باپیرەکە، پێویستە ئەصڵی مەسئەلەکە لێکدانی سێ بکەین، بەمەش ئەصڵی مەسئەلەکە دەبێت بە شەش (٦)، جا ئێستا مێردەکە نیوە دەبات کە دەکاتە سێ (٣) بەش، و سێ بەشیشی دەمێنێتەوە، و باپیرەکەش، سێ یەکی پاشماوەکە دەبات، کە دەکاتە یەك (١) بەش، و دوو (٢) بەشەکەی تریش بۆ سێ براکە، دیسان لەبەر ئەوەی کە دوو بەشەکە دابەش ناکرێت بەسەر سێ براکە دا، بۆیە پێویستە ئەصڵی مەسئەلە تازەکە — شەشەکە -- لێکدانی سێ بکەین کە ژمارەی براکانە، بەمەش ئەصڵی مەسئەلەکە دەبێتە هەژدە (١٨)، جا ئێستا مێردەکە نیوە دەبات کە دەکاتە نۆ (٩) بەش، و نۆ (٩) بەشیش دەمێنێتەوە، باپیرەکەش سێ یەکی ئەو نۆ (٩) بەشە دەبات کە دەکاتە سێ (٣) بەش، و شەش

(٦) بەشیش دەمێنێتەوە سێ براکە بە هاوبەشی دەیبەن، کە هەر یەکەیان دوو (٢) بەشی دەکەوێت.

جا لێرەدا سێ یەکی پاشماوە، شەش یەکی هەموو میراتەکە یەکسانن، و زۆرترن، و سوودیان زیاترە بۆ باپیرەکە.

| ئەصڵی مەسئەلە | | ٢ ← × ٣ | ٦ ← × ٣ | ١٨ |
|---|---|---|---|---|
| مێرد | نیوە | ١ | ٣ | ٩ |
| باپیرە | سێیەکی پاشماوە | ؟ | ١ | ٣ |
| سێ برا | عەصەبە | ؟ | ٢ | ٦ |

| ئەصڵی مەسئەلە | ٦ ← × ٣ | | ١٨ |
|---|---|---|---|
| مێرد | نیوە | ٣ | ٩ |
| باپیرە | شەش یەك | ١ | ٣ |
| سێ برا | عەصەبە | ٢ | ٦ |

## سێیەم:

ژمارەی برا و خوشکەکان یەکسانە بە دوو بەرامبەری باپیرەکە.

(١) پیاوێك مردوە: ژنێك، و باپیرە، و دوو برای لە پاش بەجێ ماوە، ئەوا: ژنەکە چوار یەك دەبات، و سێ (٣) بەشی دەمێنێتەوە، جا ئەگەر باپیرەکە هاوبەشیان لەگەڵ دا بکات، سێ (٣) بەشەکە دابەش دەکرێت بەسەر باپیرە، و دوو براکە دا کە هەر یەکەیان یەك (١) بەشی دەکەوێت، هەروەها ئەگەر باپیرەکە سێ یەکی پاشماوەکە ببات کە دەکاتە یەك (١) بەش، دوو (٢) بەشەکەش کە

دەمێنێتەوە، دوو براکە بە هاوبەشی بیبەن، کە هەر یەکەیان یەك (١) بەشی دەکەوێت.

بۆیە لێرەدا دەبینین کە جیاوازی نیە لەوەدا کە ئایا باپیرەکە برا بەشیان لەگەڵ دا بکات، یان سێ یەکی پاشماوە ببات، و لە هەر دوو شێوەکە دا بەشەکەی یەکسانن.

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| ئەصلی مەسئەلە | | | ٤ | ٤ |
| یەك ژن | چواریەك | | ١ | ١ |
| باپیرە | برابەشی = سێیەکی | | ٣ | ١ |
| دوو برا | پاشماوە | | | ٢ |

(٢) کەسێك مردوە: کچێك، و باپیرە، و دوو برای لە پاش بەجێ ماوە، ئەوا: کچەکە نیوە دەبات. جا ئەگەر باپیرەکە هاوبەشی بکات لەگەڵ دوو براکە دا، ئەوا ئەصلی مەسئەلەکە دەبێت بە شەش(٦) — کە لە ئەنجامی لێکدانی ئەصلی مەسئەلەی یەکەم کە دوە (٢) لە ژمارەی باپیرە و دوو براکە کە سێ (٣) کەسن — پەیدا دەبێت، جا ئێستا ئەگەر کچەکە نیوە ببات، ئەوا سێ (٣) بەش دەبات، و سێ بەشەکەی تریش بۆ باپیرە و دوو براکە کە هەر یەکەیان یەك (١) بەش دەبەن. هەروەها ئەگەر باپیرەکە سێ یەکی پاشماوە ببات، ئەوا لەبەر ئەوەی کە پاشماوەکە کە یەکە (١) بەشی باپیرەکەی لێ دەرنایەت، بۆیە ئەصلی مەسئەلەکە کە دوە (٢) لێکدانی سێ (٣) ی دەکەین، بەمەش ئەصلی مەسئەلەکە دەبێت بە شەش (٦)، ئەوجا ئێستا کچەکە نیوە دەبات کە دەکاتە سێ (٣) بەش، و سێ (٣) بەشیش دەمێنێتەوە، باپیرەکەش سێ یەکی دەبات کە دەکاتە یەك (١) بەش، و دوو بەشەکەشی کە دەمێنێتەوە دوو براکە بە هاوبەشی

دەیبەن، كە هەریەكەیان یەك (١) بەش دەبەن. هەروەها ئەگەر باپیرەكە شەش یەكی هەموو میراتەكە ببات، ئەوا ئەصڵی مەسئەلەكە شەش (٦) دەبێت، نیوەی كە دەكاتە سێ (٣) بەش كچەكە دەیبات، و شەش یەكیش كە دەكاتە یەك (١) بەش باپیرەكە دەیبات، و دوو (٢) بەشیش دەمێنێتەوە بۆ دوو براكە، و هەر یەكەیان یەك (١) بەش دەبەن. بۆیە لێرەدا دەبینین كە جیاوازی نیە لەوەدا كە ئایا باپیرەكە برا بەشیان لەگەڵ دا بكات، یان سێ یەكی پاشماوە ببات، یان شەش یەكی هەموو میراتەكە ببات، و لە هەر سێ شێوەكە دا بەشەكەی یەكسانن.

| | | | |
|---|---|---|---|
| ئەصڵی مەسئەلە | | ٢ ← × ٣ | ٦ |
| یەك كچ | نیوە | ١ | ٣ |
| باپیرە | برابەشی = سێیەكی پاشماوە | ١ | ١ |
| دوو برا | | | ٢ |

| | | |
|---|---|---|
| ئەصڵی مەسئەلە | | ٦ |
| یەك كچ | نیوە | ٣ |
| باپیرە | شەش یەك | ١ |
| دوو برا | عەصەبە | ٢ |

# نمونەی ئەو حاڵەتانەی کە خاوەن بەشیان لەگەڵ دایە بەشی خاوەن بەشەکانیش دوو سێ یەکە

ئەو خاوەن بەشانەی کە دوو سێ یەك دەبەن بریتین لە: دوو کچ، و دوو کچی کوڕ، و کچێك لەگەڵ کچی کوڕێك.

یەکەم:

باپیرە یەك خوشکی لەگەڵ دا بێت.

کەسێك مردوە: دوو کچ، و باپیرە، و خوشکێکی لە پاش بەجێ ماوە، ئەوا: دوو کچەکە دوو سێ یەك دەبەن، و ئەوەشی کە دەمێنێتەوە باپیرەکە دەبێتە هاوبەشی خوشکەکە بە پێی یاسای: ﴿للذّكر مثل حظّ الأنثيين﴾، کەواتە: ئەصڵی مەسئەلەکە لە سێ (٣) یە، دوو (٢) بەشی دوو کچەکە دەیبەن، و یەك (١) بەشیشی دەمێنێتەوە بۆ باپیرە و خوشکەکە، و ئەم یەك (١) بەشەش دابەش ناکرێت بە سەریان دا، بۆیە ئەصڵی مەسئەلەکە لێکدانی سێ (٣) دەکەین، بەمەش ئەصڵی مەسئەلەکە دەبێت بە نۆ (٩)، شەش (٦) بەشی بۆ دوو کچەکە، و سێ (٣) بەشەکەی تریش بۆ باپیرە و خوشکەکە، باپیرەکە دوو (٢) بەش دەبات، و خوشکەکەش یەك (١) بەش دەبات.

جا لێرەدا برا بەشی سوودی زیاترە بۆ باپیرەکە.

| ئەصڵی مەسئەلە | ٣ ⟵ ٣ × | | ٩ |
|---|---|---|---|
| دوو کچ | دووسێیەك | ٢ | ٦ |
| باپیرە | برا بەش | ١ | ٢ |
| یەك خوشك | | | ١ |

دوەم:

باپیرە برایەك، یان دوو خوشكی لەگەڵ دا بێت.

کەسێك مردوە: دوو کچ، و باپیرە، و برایەکی لە پاش بەجێ ماوە، ئەوا: دوو کچەکە دوو سێ یەك دەبەن، و ئەصڵی مەسئەلەکەش لە سێ یە، جا ئەگەر باپیرە بە برا بەشی میرات ببات، ئەوا دوو کچەکە لە سێ بەش دوو بەش دەبەن، و یەك بەشیش دەمێنێتەوە، باپیرە و براکە بە هاوبەشی دەیبەن، بەڵام لەبەر ئەوەی کە یەك بەشەکە دابەش ناکرێت بەسەر باپیرە و براکە دا، بۆیە ئەصڵی مەسئەلەکە لێکدانی دوو دەکەین – کە ژمارەی باپیرە و براکەیە ---، بەمەش ئەصڵی مەسئەلەکە دەبێت بە شەش (٦)، جا ئێستا دوو کچەکە دوو سێ یەك دەبەن کە دەکاتە چوار (٤) بەش، ئەوجا دوو (٢) بەش دەمێنێتەوە بۆ باپیرە و براکە، و ئەوانیش بە هاوبەشی ئەم دوو بەشە دەبەن، کە بۆ هەر یەکەیان دەکاتە یەك (١) بەش. هەروەها ئەگەر باپیرە شەش یەك ببات، ئەصڵی مەسئەلەکە شەشە (٦)، دوو سێ یەکی کە دەکاتە چوار (٤) بەش دوو کچەکە دەیبەن، و شەش یەکیشی کە دەکاتە یەك (١) بەش باپیرەکە دەیبات، و یەك (١) بەشیش دەمێنێتەوە براکە دەیبات.

بۆیە لێرەدا دەبینین کە جیاوازی نیە لەوەدا کە ئایا باپیرەکە برا بەشی بکات، یان شەش یەك ببات، چونکە لە هەردوو شێوەکە دا بەشەکەی یەکسانن.

| | | | |
|---|---|---|---|
| ئەصڵی مەسئەلە | | ٣ ← × ٢ | ٦ |
| دوو کچ | دووسێیەك | ٢ | ٤ |
| باپیرە | برا بەش | ١ | ١ |
| یەك برا | | | ١ |

| | | |
|---|---|---|
| ئەصڵی مەسئەلە | | ٦ |
| دوو کچ | دووسێیەك | ٤ |
| باپیرە | شەش یەك | ١ |
| یەك برا | عەصەبە | ١ |

**سێیەم:**

باپیرە کە لە برایەك، یان لە دوو خوشك زیاتری لەگەڵ دا بێت.

کەسێك مردوە: دوو کچ، و باپیرە، دوو برای لە پاش بەجێ ماوە، ئەوا: دوو کچەکە دوو سێ یەك دەبەن، و باپیرەکەش شەش یەك دەبات، و ئەصڵی مەسئەلەکەش شەشە (٦)، دوو کچەکە چوار (٤) بەشی دەبەن، و باپیرەکەش یەك (١) بەشی دەبات، و یەك بەشیش دەمێنێتەوە بۆ دوو براکە، ئەوجا لەبەر ئەوەی کە ئەم یەك بەشە دابەش ناکرێت بەسەر دوو براکەدا، بۆیە ئەصڵی مەسئەلەکە لێکدانی دوو دەکەین — کە ژمارەی دوو براکەیە --، بەمەش ئەصڵی مەسئەلەکە دەبێت بە دوازدە (١٢)، ئەوجا ئێستا دوو کچەکە هەشت (٨) بەش دەبەن، و باپیرەکەش دوو (٢) بەش دەبات، و دوو (٢) بەشیش دەمێنێتەوە بۆ دوو براکە، هەریەکەیان یەك (١) بەش دەبەن.

جا لێرەدا شەش یەك زۆرترە، و سوودی زیاترە بۆ باپیرەکە.

| | | | |
|---|---|---|---|
| ئەصڵی مەسئەلە | | ٦ ← × ٢ | ١٢ |
| دوو کچ | دووسێیەك | ٤ | ٨ |
| باپیرە | شەش یەك | ١ | ٢ |
| دوو برا | عەصەبە | ١ | ٢ |

## نمونەی ئەو حاڵەتانەی کە خاوەن بەشیان لەگەڵ دایە

## بەشی خاوەن بەشەکانیش لە نێوان نیوە، و دوو سێ یەك دایە

جا بزانە: کاتێك بەشی خاوەن بەشەکان لە نێوان نیوە، و دوو سێ یەك دایە کە کچ و ژن، یان کچی کوڕ و ژن بەیەکەوە کۆ ببنەوە.

### یەکەم:

باپیرە کۆ ببێتەوە لەگەڵ یەك برا، یان یەك خوشك، یان دوو خوشك.

پیاوێك مردوە: کچێك، و ژنێك، و باپیرە، و برایەکی لە پاش بەجێ ماوە، ئەوا: کچەکە نیوە دەبات، و ژنەکەش هەشت یەك دەبات، ئێستا ئەصڵی مەسئەلەکە لە هەشتە (٨)، کچەکە نیوەی دەبات کە دەکاتە چوار (٤)، و ژنەکەش هەشت یەك دەبات کە دەکاتە یەك (١)، ئەو سێ (٣) بەشەش کە ماوەتەوە بۆ باپیرە و براکە بە هاوبەشی، بەڵام لەبەر ئەوەی کە دابەش ناکرێت بە سەریاندا، بۆیە ئەصڵی مەسئەلەکە لێکدانی دوو دەکەین، بەمەش ئەصڵی مەسئەلەکە دەبێتە شازدە (١٦)، ئەوجا ئێستا کچەکە هەشت (٨) بەشی دەبات، و ژنەکەش دوو (٢) بەشی دەبات، و شەش (٦) بەشیش دەمێنێتەوە بۆ باپیرە، و براکە، و بەمەش هەر یەکەیان سێ (٣) بەشیان بەر دەکەوێت.

جا لێرەدا برا بەشی سوودی زیاترە بۆ باپیرەکە.

| ئەصڵی مەسئەلە | | ٨ ← × ٢ | ١٦ |
|---|---|---|---|
| یەك کچ | نیوە | ٤ | ٨ |
| یەك ژن | هەشت یەك | ١ | ٢ |
| باپیرە | برا بەش | ٣ | ٣ |
| یەك برا | | | ٣ |

دووەم:

باپیرە کۆ ببێتەوە لەگەڵ: برا و خوشکێك، یان دوو برا، یان سێ خوشك، یان زیاتر.

پیاوێك مردوە: کچی کوڕێك، و ژنێك، و باپیرە، و دوو برای لە پاش بەجێ ماوە، ئەوا: کچی کوڕەکە نیوە دەبات، و ژنەکەش هەشت یەك دەبات، ئێستا ئەصڵی مەسئەلەکە لە بیست و چوارە (٢٤)، کچی کوڕەکە نیوەی دەبات کە دەکاتە دوانزە (١٢)، و ژنەکەش هەشت یەك دەبات کە دەکاتە سێ (٣)، و باپیرەکەش شەش یەك دەبات کە دەکاتە چوار (٤)، و پێنج (٥) بەشیش دەمێنێتەوە دوو براکە بە هاوبەشی دەیبەن، بەڵام لەبەر ئەوەی کە دابەش ناکرێت بە سەریاندا، بۆیە ئەصڵی مەسئەلەکە لێکدانی دوو دەکەین، بەمەش ئەصڵی مەسئەلەکە دەبێت بە چل و هەشت (٤٨)، جا ئێستا: کچی کوڕەکە (٢٤) دەبات، و ژنەکەش (٦) دەبات، و باپیرەکەش (٨) دەبات، و(١٠) بەشیش دەمێنێتەوە بۆ دوو براکە، کە هەر یەکەیان پێنج (٥) بەشی دەکەوێت.

جا لێرەدا شەش یەك سوودی زیاترە بۆ باپیرەکە.

| ئەصڵی مەسئەلە | | ٢٤ ⟵ × ٢ | ٤٨ |
|---|---|---|---|
| یەك کچی کوڕ | نیوە | ١٢ | ٢٤ |
| یەك ژن | هەشت یەك | ٣ | ٦ |
| باپیرە | شەش یەك | ٤ | ٨ |
| دوو برا | عەصەبە | ٥ | ١٠ |

## نمونەی ئەو حاڵەتانەی کە خاوەن بەشیان لەگەڵ دایە بەڵام پاشماوەی میراتەکە یان شەش یەکە، یان لە شەش یەك کەمترە، یان هیچ لە خاوەن بەشەکان نامێنێتەوە

### یەکەم:

کەسێك مردوە: دوو کچ، و دایك، و باپیرە، و برایەکی لە پاش بەجێ ماوە، ئەوا: دوو کچەکە دوو سێ یەك دەبەن، و دایکەکەش شەش یەك دەبات، و ئەصڵی مەسئەلەکەش شەش (٦)، دوو کچەکە چوار (٤) بەش دەبەن، و دایکەکەش یەك (١) بەش دەبات، و بەمەش تەنها یەك بەش دەمێنێتەوە کە دەکاتە شەش یەکی میراتەکە، بۆیە باپیرەکە بە شەش یەك میرات دەبات، و هیچیش نامێنێتەوە بۆ براکە، و لە میراتەکە بێ بەش دەبێت.

| ئەصڵی مەسئەلە | | ٦ |
|---|---|---|
| دوو کچ | دووسێیەك | ٤ |
| دایك | شەش یەك | ١ |
| باپیرە | شەش یەك | ١ |
| یەك برا | عەصەبە | ٠ |

### نمونەیەکی تر:

کەسێك مردوە: کچێك، و کچی کوڕێك، و داپیرەیەك، و باپیرە، و برایەکی دایك و باوکی لە پاش بەجێ ماوە.

| ئەصڵی مەسئەلە | | ٦ |
|---|---|---|
| یەك کچ | نیوە | ٣ |
| یەك کچی کوڕ | شەش یەك | ١ |
| داپیرە | شەش یەك | ١ |
| باپیرە | شەش یەك | ١ |
| یەك برا | عەصەبە | ٠ |

## دوەم:

ژنێك مردوە: دوو كچ، و مێرد، و باپیرە، و برایەكی لە پاش بەجێ ماوە، ئەوا: دوو كچەكە دوو سێ یەك دەبەن، و مێردەكەش چوار یەك دەبات، و ئەصڵی مەسئەلەكەش لە دوازدەیە (١٢)، دوو كچەكە هەشت (٨) بەش دەبەن، و مێردەكەش سێ (٣) بەش دەبات، بەمەش تەنها یەك بەش دەمێنێتەوە كە لە شەش یەكی میراتەكە كەمترە، بۆیە باپیرەكە بە شەش یەك میرات دەبات، بەلاَم لەبەر ئەوەی كە پاشماوەی میراتەكە لە شەش یەك كەمترە، بۆیە ئەصڵی مەسئەلەكە زیاد دەكەین (عول) بۆ سیازدە (١٣)، تاوەكو شەش یەكی باپیرەكە تەواو ببێت، بەمەش باپیرەكە شەش یەكی خۆی دەبات كە دەكاتە دوو (٢) بەش، و هیچیش نامێنێتەوە بۆ براكە، و لە میراتەكە بێ بەش دەبێت.

| ئەصڵی مەسئەلە | | ١٢ ← ١ + | ١٣ |
|---|---|---|---|
| دوو كچ | دووسێیەك | ٨ | ٨ |
| مێرد | چواریەك | ٣ | ٣ |
| باپیرە | شەش یەك | ١ (؟) | ٢ |
| یەك برا | عەصەبە | ٠ | ٠ |

## نموونەیەكی تر:

ژنێك مردوە: مێرد، و كچێك، و كچی كوڕێك، و باپیرە، و برایەكی باوكی لە پاش بەجێ ماوە.

| ئەصڵی مەسئەلە | | ١٢ ← ١ + | ١٣ |
|---|---|---|---|
| مێرد | چواریەك | ٣ | ٣ |
| یەك كچ | نیوە | ٦ | ٦ |
| یەك كچی كوڕ | شەش یەك | ٢ | ٢ |
| باپیرە | شەش یەك | ١ | ٢ |
| یەك برا | عەصەبە | ٠ | ٠ |

## سێ یەم:

ژنێك مردوە: دوو کچ، و مێرد، و دایك، و باپیرە، و برایەکی لە پاش بەجێ ماوە، ئەوا: دوو کچەکە دوو سێ یەك دەبەن، و مێردەکەش چوار یەك دەبات، و دایکەکەش شەش یەك دەبات، و ئەصڵی مەسئەلەکەش لە دوازدەیە، دوو کچەکە هەشت (٨) بەش دەبەن، ، و مێردەکەش سێ (٣) بەش دەبات، و دایکەکەش دوو (٢) بەش دەبات، جا وەك دەبینین: ئەصڵی مەسئەلەکە دوو بەشی دایکەکە تەواو ناکات، بۆیە زیادی دەکەین (عول) بۆ سیازدە (١٣)، بەمەش دوو (٢) بەشی دایکەکە تەواو بوو، بەڵاَم ئێستا ئەگەر باپیرەکە شەش یەکی بۆ دابنێین کە دەکاتە دوو (٢) بەش، دەبینین کە هیچی بۆ نەماوەتەوە، بۆیە جارێکی تر ئەصڵی مەسئەلەکە زیاد دەکەین (عول) بۆ پازدە (١٥) ، تاوەکو شەش یەکی باپیرەکە تەواو ببێت، بەمەش باپیرەکە شەش یەکی خۆی دەبات کە دەکاتە دوو (٢) بەش، و هیچیش نامێنێتەوە بۆ براکە، و لە میراتەکە بێ بەش دەبێت.

| ئەصڵی مەسئەلە | | ١٢ ← + ١ | ١٣ ← + ٢ | ١٥ |
|---|---|---|---|---|
| دوو کچ | دووسێیەك | ٨ | ٨ | ٨ |
| مێرد | چواریەك | ٣ | ٣ | ٣ |
| دایك | شەش یەك | ١ (؟) | ٢ | ٢ |
| باپیرە | شەش یەك | ٠ (؟) | ٠ (؟) | ٢ |
| یەك برا | عەصەبە | ٠ | ٠ | ٠ |

## نمونەیەکی تر:

ژنێك مردوە: مێرد، و کچێك، و کچی کوڕێك، و دایك، و باپیر، و برایەکی باوکی لە پاش بەجێ ماوە.

| ئەصڵی مەسئەلە | | ١٢ ← + ١ | ١٣ ← + ٢ | ١٥ |
|---|---|---|---|---|
| مێرد | چواریەك | ٣ | ٣ | ٣ |
| یەك كچ | نیوە | ٦ | ٦ | ٦ |
| یەك كچی كوڕ | شەش یەك | ٢ | ٢ | ٢ |
| دایك | شەش یەك | ١ (؟) | ٢ | ٢ |
| باپیرە | شەش یەك | ٠ (؟) | ٠ (؟) | ٢ |
| یەك برا | عەصەبە | ٠ | ٠ | ٠ |

## کۆ بوونەوەی باپیرە لەگەڵ برا و خوشکی دایك و باوکی، و برا و خوشکی تەنها باوکی پێکەوە

## {مەسئەلە ژمێردراوەکان} (المسائل المعادّة)

هەر کاتێك باپیرە لەگەڵ براو خوشکی دایك و باوکی، و برا و خوشکی باوکی دا بەیەکەوە کۆ بوونەوە، ئەوا باپیرەکە هەر بە یەك لەو چوار شێوەیەی کە باسمان کردن — برا بەشی، سێ یەکی میراتەکە، سێ یەکی پاشماوەی میراتەکە، شەش یەکی میراتەکە --، کامیان زۆرتر، و بە سوودتربێت بەو شێوەیەیان میرات دەبات، ئەوجار برا و خوشکە دایك و باوکیەکان، برا و خوشکە باوکیەکان لەگەڵ خۆیان دا دەژمێرن لە دژی باپیرەکە، جا دوای ئەوەی کە باپیرەکە بەشە میراتی خۆی برد — بە هەرکام لەو چوار شێوە — ئەوا دەڕوانین:

(١) ئەگەر منداڵە دایك و باوکیەکان تەنها یەك نێرینەشیان تێدا بێت، ئەوا پاشماوەی میراتەکە هەمووی دەبەن بۆ خۆیان، جا ئەگەر تەنها نێرینە بوون، یان تەنها مێیینە بوون ئەوا: بە یاسای عەصەبەگەرایەتی پاشماوەکە دابەش دەکەن، بەلاّم ئەگەر نێرینە و مێیینە بە یەکەوە بوون، ئەوا بە یاسای: (للذکر مثل حظ الأنثیین) دابەشی دەکەن، و منداڵە باوکیەکانیش بە هۆی منداڵە دایك و باوکیەکانەوە لە میراتەکە بێ بەش دەبن.

بۆ نمونە: کەسێك مردوە: باپیرە، و برایەکی دایك و باوکی، و برایەکی باوکی لە پاش بەجێ ماوە، ئێستا برا دایك و باوکیەکە بە باپیرەکە دەڵێت: من، و ئەم برا باوکیەم هەر دووکمان بەرامبەر بە تۆ یەکسانین، لەوەدا کە هەر سێ کەمان بە هۆی باوکی مردوەکەوە بە مردوەکە دەگەین، بۆیە دەبێت هەر دووکمان لەگەڵ تۆدا بە هاوبەشی میراتەکە ببەین، بەم شێوەیە کە: بەشێك بۆ تۆ، و دوو بەشیش

بۆ ئێمە. جا باپیرەکەش کە بیر دەکاتەوە لەم مەسئەلەیەدا برا بەشی، و سێ یەك بۆ ئەم یەکسانە، بۆیە بەشی خۆی دەبات، و دەڕوات، ئەوجا برا دایك و باوکیەکە ڕوو دەکاتەوە برا باوکیەکە، و پێی دەڵێت: من لە دژی باپیرەکە تۆم کرد بە هاوبەشی خۆم، ئەگینا تاوەکو من وەستابم تۆ هیچ میرات نابەیت، بەمەش برا دایك و باوکیەکە پاشماوەی میراتەکە دەبات، و برا باوکیەکەش بێ بەش دەبێت.

| ئەصڵی مەسئەلە | ٣ | ٣ |
| --- | --- | --- |
| باپیرە | ١ | ١ |
| یەك برای دایك و باوکی | ١ | ٢ |
| یەك برای باوکی | ١ | ٠ |

(٢) ئەگەر منداڵە دایك و باوکیەکان نێرینەیان تێدا نەبوو، ئیتر یەك مێیینە بوو، یان زیاتر ئەوا:

أ. ئەگەر تەنها یەك مێیینە بوو، ئەوا لە دژی باپیرەکە منداڵە باوکیەکان دەکات بە هاوبەشی خۆی، بۆ ئەوەی کە بەشەکەی خۆی – کە نیوەیە -- بە هۆی ئەوانەوە تەواو بکات، ئەوجا ئەگەر نیوەکەی دەست کەوت، ئەوا باشە، ئەگینا ئەگەر کەمتر لە نیوەشی دەست بکەوێت دەبێت پێی ڕازی بێت، و داوای زیاتر نەکات.

## نموونەی (١):

پیاوێك مردوە: باپیرە، و خوشکێکی دایك و باوکی، و برایەکی باوکی لە پاش بەجێ ماوە، ئێستا خوشکەکە بە باپیرەکە دەڵێت: من، و براکەم دەبینە هاوبەشی تۆ لە میراتەکەدا. کەواتە میراتەکە دەکرێت بە پێنج (٥) بەشەوە، کە ژمارەی باپیرە، و خوشك، و براکەیە – هەر نێرینەیەك بەرامبەر بە دوو مێیینە --، جا لەبەر ئەوەی کە لەم مەسئەلەدا برا بەشی بە سوود ترە بۆ باپیرەکە، بۆیە

دوو (٢) بەش دەبات، و براکەش دوو (٢) بەش دەبات، و یەك (١) بەش بۆ خوشکەکە دەمێنێتەوە، ئەوجا خوشکەکە بە برا باوکیەکە دەڵێت: من خاوەن بەشی دیاری کراوم -- کە نیوەیە --، تاوەکو بەشی من تەواو نەبێت، نابێت تۆ هیچ ببەیت، کەواتە لە بەشەکەی خۆت نیوەکەم بۆ تەواو بکە، ئەوجا لەبەر ئەوەی کە پێنج نیوەی تەواوی نیە، پێنج (٥) بەشەکە لێکدانی دوو دەکەین، و دەبێت بە دە (١٠) بەش، چوار (٤) بەشی بۆ باپیرەکە بە بِرا بەشی، و نیوەی بۆ خوشکەکە کە دەکاتە پێنج (٥)، و یەك (١) بەشەکەش کە دەمێنێتەوە بۆ برا باوکیەکە بە عەصەبەگەرایەتی دەیبات.

ئەوجا بزانە کە زانایان بەم مەسئەلە دەڵێن: (عُشْرِيَّة زَيْد). [1]

| ئەصڵی مەسئەلە | | ٥ ⟵ × ٢ | ١٠ |
|---|---|---|---|
| باپیرە | برابەش | ٢ | ٤ |
| یەك خوشکی دایك و باوکی | | ١ | ٥ |
| یەك برای باوکی | | ٢ | ١ |

## نمونەی (٢):

پیاوێك مردوە: ژن، و باپیرە، و خوشکێکی دایك و باوکی، و خوشکێکی باوکی لە پاش بەجێ ماوە، ئەوا: ئەصڵی مەسئەلەکە چوارە (٤) — کە بەشی ژنەکەی لێ دەردەچێت --، جا ئێستا ژنەکە چوار یەك دەبات، کە دەکاتە یەك (١)بەش، و سێ (٣) بەشیش دەمێنێتەوە، ئەوجا خوشکە دایك و باوکیەکە بە باپیرەکە دەڵێت: من، و ئەم خوشکەم دەبینە هاوبەشی تۆ لە میراتەکەدا. بەڵام لەبەر ئەوەی کە سێ (٣) بەشەکە دابەش ناکرێت بەسەر چوار (٤) دا — کە

١) المهذب ٤١٩، المغني ٢١، الكنوز ٢٢١.

ژمارەی باپیرە و دوو خوشكەكەیە ---، بۆیە ئەصڵی مەسئەلەكە لێكدانی چوار دەكەین، و دەبێتە شازدە (١٦)، ئەوجا دووبارە دابەشی دەكەینەوە بە سەریان دا بەم شێوە: ژنەكە چوار (٤) بەش دەبات، و شەشیش بۆ باپیرەكە بە برا بەشی، و شەشیش (٦) بۆ دوو خوشكەكە، كە هەر یەكەیان سێ (٣) بەش دەبەن، ئەوجا خوشكە دایك و باوكیەكە ڕوو دەكاتە خوشكە باوكیەكە، و پێی دەڵێت: من خاوەن بەشی دیاری كراوم -- كە نیوەیە --، تاوەكو بەشی من تەواو نەبێت، نابێت تۆ هیچ ببەیت، كەواتە سێ (٣) بەشەكەی خۆت بدە بە من بۆ تەواو كردنی بەشەكەم، بەمەش بەشی خوشكە دایك و باوكیەكە دەبێت بە شەش (٦)، هەرچەندە لە نیوەی میراتەكەش كەمترە، چونكە نیوەی میراتەكە هەشتە (٨)، بەڵام دەبێت پێی ڕازی بێت، چونكە لەوە زیاتر نەماوەتەوە، ئیتر خوشكە باوكیەكەش بێ بەش دەبێت.

| ئەصڵی مەسئەلە | ٤ ← ٤ × | | ١٦ | | ١٦ |
|---|---|---|---|---|---|
| ژن | چواریەك | ١ | ٤ | | ٤ |
| باپیرە | برا بەشی | ٣ | ٦ | | ٦ |
| یەك خوشكی دایك و باوكی | | | ٣ | داوای نیوە دەكات | ٦ |
| یەك برای باوكی | | | ٣ | | ٠ |

## نموونەی (٣):

پیاوێك مردوە: ژنێك، و دایك، و باپیرە، و خوشكێكی دایك و باوكی، و خوشكێكی باوكی لەپاش بەجێ ماوە.

| | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ئەصڵی مەسئەلە | ٤ ×← ١٢ | | ٤٨ | ٤٨ | | ٤٨ |
| ژن | چواریەك | ٣ | ١٢ | ١٢ | | ١٢ |
| دایك | شەش یەك | ٢ | ٨ | ٨ | | ٨ |
| باپیرە | برابەشی | ٧ | ٢٨ | ١٤ | | ١٤ |
| خوشكێكی دایك و باوكی | | | | ٧ | داوای نیوە دەكات | ١٤ |
| خوشكێكی باوكی | | | | ٧ | | ٠ |

## نموونەی (٤):

پیاوێك مردوە: ژنێك، و دایك، و باپیرە، و خوشكێكی دایك و باوكی، و برایەكی باوكی لەپاش بەجێ ماوە.

| | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ئەصڵی مەسئەلە | | ٥ × ← ١٢ | ٦٠ | ٦٠ | | ٦٠ |
| ژن | چواریەك | ٣ | ١٥ | ١٥ | | ١٥ |
| دایك | شەش یەك | ٢ | ١٠ | ١٠ | | ١٠ |
| باپیرە | برابەشی | ٧ | ٣٥ | ١٤ | | ١٤ |
| خوشكێكی دایك و باوكی | | | | ٧ | داوای نیوە دەكات | ٢١ |
| برایەكی باوكی | | | | ١٤ | | ٠ |

ب.ئەگەر دوو مێیینە، یان زیاتر بوون، ئەوا لە دژی باپیرەکە منداڵە باوکیەکان دەکەن بە هاوبەشی خۆیان، بۆ ئەوەی کە بەشەکەی خۆیان -کە دوو سێ یەکە- بە هۆی ئەوانەوە تەواو بکەن، ئەوجا ئەگەر بەشەکەی خۆیانیان دەست کەوت، ئەوا باشە، ئەگینا ئەگەر کەمتر لە بەشی خۆشیان دەست بکەوێت دەبێت پێی ڕازی بن، و داوای زیاتر نەکەن.

## نمونەی (١):

پیاوێك مردوە: باپیرە، و دوو خوشکی دایك و باوکی، و برایەکی باوکی لە پاش بەجێ ماوە، جا لەم مەسئەلەیەدا برا بەشی، و سێ یەك بۆ باپیرەکە یەکسانن، بۆیە خوشکە دایك و باوکیەکان بە باپیرەکە دەڵێن: ئێمە، و ئەم برایەما دەبینە هاوبەشی تۆ لە میراتەکە دا. کەواتە میراتەکە دەکرێت بە شەش (٦) بەشەوە، سێ یەکی بۆ باپیرەکە کە دەکاتە دوو (٢) بەش، و دوو سێ یەکەکەی کە ماوەتەوە، کە دەکاتە چوار (٤) بەش، دوو (٢) بەشی بۆ دوو خوشکەکە، و دوو (٢) بەشیشی بۆ برا باوکیەکە، بەڵام دوو خوشکەکە بە برا باوکیەکە دەڵێن: ئێمە خاوەن بەشی دیاری کراوین -- کە دوو سێ یەکە --، تاوەکو بەشی ئێمە تەواو نەبێت، نابێت تۆ هیچ ببەیت، کەواتە دوو (٢) بەشەکەی خۆت بدە بە ئێمە بۆ تەواو کردنی بەشەکەمان، چونکە ئێمە لە دژی باپیرەکە تۆمان کردوە بە هاوبەشی خۆمان. بەمەش برا باوکیەکە بێ بەش دەبێت.

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| ئەصڵی مەسئەلە | ٦ | ٦ | | ٦ |
| باپیرە | برابەشی = سێیەك | ٢ | | ٢ |
| دوو خوشکی دایك و باوکی | | ٢ | داوای دووسێیەك دەکەن | ٤ |
| برایەکی باوکی | | ٢ | | ٠ |

## نمونەی (٢):

پیاوێك مردوە: باپیرە، و دوو خوشکی دایك و باوکی، و خوشکێکی باوکی لە پاش بەجێ ماوە، کەواتە میراتەکە دەکرێت بە پێنج (٥) بەشەوە، دوو (٢) بەشی بۆ باپیرەکە بە برا بەشی، سێ (٣) بەشەکەش کە ماوەتەوە بۆ دوو خوشکە دایك و باوکیەکان، هەرچەندە لە دووسێیەکی میراتەکەش کەمترە، بەڵام دەبێت پێی ڕازی بن، چونکە لەوە زیاتر نەماوەتەوە، ئیتر خوشکە باوکیەکەش بێ بەش دەبێت.

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| ئەصلی مەسئەلە | ٥ | ٥ | | ٥ |
| باپیرە | برابەشی | ٢ | | ٢ |
| دوو خوشکی دایك و باوکی | | ٢ | داوای دووسێیەك دەکەن | ٣ |
| خوشکێکی باوکی | | ١ | | ٠ |

## ئاگاداری

(١) ڕێك دەکەوێت لەو مەسئەلەی کە یەك خوشکی دایك و باوکی تێدایە – کە بەشەکەی نیوەیە --، ئەندازەیەك لە میراتەکە بمێنێتەوە، و زیاد بێت لە بەشی خوشکە دایك و باوکیەکە، جا ئەو زیادەیە خوشکە یان برا باوکیەکە بە عەصەبەگەرایەتی بیبات، وەك لە مەسئەلەی: (عُشْرِيَّةُ زَيْد) دا. بەڵام هەرگیز ڕێك ناکەوێت کە لەو مەسئەلەی کە دوو خوشکی دایك و باوکی یان زیاتری تێدایە -- کە بەشەکەیان دووسێیەکە --، هیچ لە میراتەکە بمێنێتەوە، و پاشان

بدرێت بە خوشکە یان برا باوکیەکە، بەڵکو ئەگەر هەر کەمیەک پەیدا ببێت، ئەوا ڕوو دەکاتە بەشی خوشك و برا دایك و باوکیەکان. [١]

(٢) کۆدەنگی زانایان هەیە لەسەر ئەوەی کە لە هەر مەسئەلەیەکدا باپیرە، و برای دایکی کۆبوونەوە بەیەکەوە، ئەوا: برا دایکیەکە لە میرات بێبەش دەبێت. [٢]

## مەسئەلەی (الأكدرية)

ئەگەر بە وردی ئەم باسەی میراتی باپیرە لەگەڵ خوشك و براکانت خوێندبێتەوە، بۆت دەرکەوتوە کە: بێجگە لە مەسئەلەکانی ژمێردراوەکان (المسائل المعادّة) نەبێت، لە هیچ مەسئەلەیەك دا کە خوشك کۆ بوویێتەوە لەگەڵ باپیرەدا، هەرگیز ئەو خوشکە وەك خاوەن بەشی دیاری کراو میراتی نەبردوە، چونکە ئەگەر وەك خاوەن بەشی دیاری کراو میرات ببات، ئەوا بەشەکەی لە بەشی باپیرەکە زیاتر دەبێت، ئەمەش ناگونجێت، چونکە ئێمە وتوومانە: ئەگەر باپیرە لەگەڵ برا و خوشك دا کۆ بویەوە، وا دادەنرێت کە ئەویش یەکێکە لە براکان، جا کەوابوو خوشك لەگەڵیدا وەك خاوەن بەش میرات نابات، بەڵکو ئەو خوشکە دەبێت بە (عصبة بالغير).

جا بزانە کە ئەم سێ ئیمامە: (زيد و شافعي و مالك) و جمهوری زانایان مەسئەلەیەکی تریشیان باس کردوە کە تیایدا خوشك لەگەڵ باپیرەدا کۆ دەبێتەوە، و لە هەمان کات دا ئەو خوشکە وەك خاوەن بەشی دیاری کراو میرات دەبات، و ناویان لێ ناوە: مەسئەلەی (الأكدرية) [٣]، وەك ئیمامی ڕەحەبی دەفەرموێت:

---

١) منهاج الطالبين بشرح المغني ٢٣.

٢) المجموع ١٨٢، الفقه الإسلامي ٧٧٥٨، الموسوعة / حالات الجد الصحيح / ب. الجد مع الإخوة ٣ / ٣٣، الفقه المنهجي ٢ / ٣١٦.

١) شرح الرحبية٩٩ — ١٠٠، الكنوز ٢٢٥.

والأخت لا فـرض مع الجد لـها فـيمـا عـــدا مســـألة كـــملـها
زوج، وأم، وهـــما تــمـــامـها فـاعـلم فـخيـــر أمـة عـلامـــها
تــعرف يا صـــاح بالأكـدرية وهـي بـــأن تـعـرفـها حـريـــة
فيفرض النصف لها والسدس له حتى تـعـول بالفروض الـمجـملة
ثم يعـودان إلى الـمقاســـمة كما مضى فاحفظه واشكر ناظمه

مەسئەلەکەش بریتیە لە:

ژنێك مردوە: مێرد، و دایك، و باپیرە، و یەك خوشکی دایك و باوکی یان یەك خوشکی باوکی.

لەم مەسئەلەیەدا شەش یەك دادەنرێت بۆ باپیرەکە، چونکە ئەگەر بە عەصەبەی دابنێین، ئەوا خوشکەکەش لەگەڵ خۆیدا دەکات بە عەصەبە، بەمەش بەشی باپیرەکە لە شەش یەك کەمتر دەبێتەوە، کە ئەمەش پێچەوانەی دەقی قورئانی پیرۆزە، جا کە باپیرەکە وەك خاوەن بەش میرات ببات، دەبێت خوشکەکەش وەك خاوەن بەش میرات ببات، چونکە خوشکیش بە ئایەتی قورئان بەشی بۆ دیاری کراوە، وە ناشگونجێت کە خاوەن بەشی دیاری کراو بەهۆی ئەوەی کە هەموو میراتەکە لە لایەن خاوەن بەشەکانەوە براوە، ئەم لە میراتەکە بێ بەش بکرێت، چونکە ئەوە یاسایەك بوو بۆ بێ بەش بوونی عەصەبە، وەك لە باسی بێ بەش بوونی عەصەبەدا بە نمونەوە ڕوونمان کردەوە.

جا لەم مەسئەلەیەدا: مێردەکە نیوە دەبات، و دایکەکەش سێ یەك دەبات، و باپیرەکەش شەش یەك دەبات، و ئەصڵی مەسئەلەکە لە شەشە (٦)، مێردەکە سێ (٣) بەش دەبات، و دایکەکەش دوو (٢) بەش دەبات، و باپیرەکەش یەك (١) بەش دەبات، بەمەش هیچ بۆ خوشکەکە نەماوەتەوە، بەڵام لەبەر ئەوەی کە هیچ کەسێك نیە ئەم خوشکە بێ بەش بکات، و باپیرەش نایکات بە عەصەبە،

بۆیە دەبێت بەشی دیاری کراوی خۆی بۆ دابنرێت، جا کەوابوو، خوشکەکەش نیوە دەبات کە دەکاتە سێ (٣) بەش، و مەسئەلەکە دەبێت بۆی زیاد بکرێت (عول)، بۆیە ئەصڵی مەسئەلەکە زیاد دەکەین بۆ نۆ (٩)، ئەوجا وەك باسمان کرد: نابێت بە هیچ شێوەیەك لە مەسئەلەیەك دا خوشك و باپیرە بە یەکەوە بن، و خوشکەکەش لە باپیرەکە زۆرتر بەش ببات، بۆیە لە پاش ئەوەی کە هەر یەك لە خوشك، و باپیرەکە بەشەکەی خۆیانیان وەرگرت، جارێکی تر دەگەڕێنەوە سەر یاسای عەصەبەگەرایەتی، و هەر دوو بەشەکە کە دەکاتە چوار(٤) بەش، وەکو برا و خوشك دابەشی دەکەن لە نێوان خۆیان دا، ئەو کاتە بەشەکان بەم شێوەیەی لێ دێت: باپیرەکە دوو سێ یەك دەبات، و خوشکەکەش سێ یەك دەبات، ئەوجا لەبەر ئەوەی کە چوار (٤) دابەش ناکرێت بەسەر سێ (٣) دا – کە ژمارەی باپیرە و خوشکەکەیە – بۆیە ئەصڵی مەسئەلە زیاد کراوەکە کە نۆ (٩) بوو لێکدانی سێی دەکەین، و دەبێتە بیست و حەوت (٢٧)، ئەوجا ئەگەر دوو بارە دابەشی کەینەوە بە سەریان دا، بەشی هەر یەکەیان بەم شێوەیەی لێ دێت: مێردەکە نۆ (٩) بەش دەبات، و دایکەکەش شەش (٦) بەش دەبات، و دوازدە (١٢) بەشیش دەمێنێتەوە، بۆ باپیرە و خوشکەکە، باپیرەکە هەشت (٨) بەش دەبات، و خوشکەکەش (٤) بەش دەبات، بە پێی یاسای: ﴿للذّکر مثل حظّ الأنثیین﴾.

| ئەصڵی مەسئەلە | | ٦ ⟵ ٣ + | ٩ | | ٩ ⟵ ٣× | ٢٧ | ٢٧ |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| مێرد | نیوە | ٣ | ٣ | | ٣ | ٩ | ٩ |
| دایك | سێیەك | ٢ | ٢ | | ٢ | ٦ | ٦ |
| باپیرە | شەش یەك | ١ | ١ | خوشکەکە دەکات بە عەصەبە | ٤ | ١٢ | ٨ |

| | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| خوشکێك | | ٠(؟) | داوای نیوە دەکات | ٣ | | | ٤ |

جا بزانە: ئەگەر لەم مەسئەلەیەدا لە جێگەی خوشکەکە برا بوایە، ئەوا لە میراتەکە بێ بەش دەبوو، چونکە هەموو میراتەکە لە لایەن خاوەن بەشەکانەوە دەبرا، و براکەش عەصەبە بوو، و هیچی بۆ نەدەمایەوە. وەك شێخی نودی دەفەرموێت:

ولو أخا فرضته منصوبا      مكان الأخت ما حوى نصيبا

ئەوجا لە سەرچاوە فیقهیەکان دا چەند هۆیەکیان هێناوەتەوە بۆ ناونانی ئەم مەسئەلەیە بە (الأكدرية):

(١) هەندێك وتوویانە: ئەو کەسەی کە پرسیاری لەم مەسئەلەیە کردوە ناوی (أكدر) بوە.

(٢) هەندێکی تر وتویانە ناوی مێردەکە بوە.

(٣) هەندێکی تر وتوویانە ناوی شاری مردوەکە بوە.

(٤) هەندێکی تر وتوویانە: لەبەر ئەوەی کە ئەم مەسئەلەیە مەزهەبی زەیدی کوڕی ثابتی (خوای لێ ڕازی بێت) لێڵ کردوە، بە هۆی ئەوەی کە لەگەڵ باپیرەدا بەشی بۆ خوشك داناوە، یان لەبەر ئەوەی کە زەید میراتی خوشکی لەم مەسئەلەیەدا لێڵ کردوە، چونکە سەرەتا نیوەی میراتەکەی پێ دا، و پاشان لێی سەندەوە، و کردی بە هاوبەشی باپیرەکە. (١)

٢) التحفة٤١٥، النهاية٢٦، المغني٢٣، شرح المنهج ٦ / ٩١، المجموع١٩٤—١٩٥، الدرة٩٩—١٠٠، الأنوار ٦، الكنوز٢٢٤

# بەشی سێیەم

## حیسابی مەسئەلەکان ( حساب المسائل )

کاتێك کە دەمانەوێت میرات دابەش بکەین بە شێوەیەکی ڕاست و درووست، وە هەر خاوەن مافێك مافی خۆی بدەینێ، ئەوا پێویستمان بە زانینی دوو بابەتی زۆر گرنگ دەبێت کە ئەوانیش:

(١) ئەصڵی مەسئەلەکان (أصول المسائل).

(٢) ساغ کردنەوەی مەسئەلەکان (تصحيح المسائل)

وە لە بۆ باش تێگەیشتن لەم دوو بابەتە گرنگەش پێویستمان بە زانینی چۆنێتی حساب کردنی ژمارە هەیە، چونکە زۆرێك لە مەسئەلە فرائضیەکان بابەتی حسابیان تێ دەکەوێت، بۆیە سەرەتا دەچینە سەر بابەتی نیسبەتی نێوان ژمارەکان.

## نیسبەتی نێوان ژمارەکان

بۆ ئەوەی کە بزانین چۆن مەسئەلەیەك ساغ دەکەینەوە، و چۆن ئەصڵی مەسئەلەکە دەدۆزینەوە، ئەوا پێویستیمان بە زانینی نیسبەتی نێوان ژمارەکان هەیە، کە بە گشتی چوار جۆر نیسبەت هەیە لە نێوانیاندا، کە ئەمانەن:

(١) **تماثل**: واتە هاووێنەیی: کە بە نیسبەتی نێوان دوو ژمارە دەوترێت کە یەکسان بن، بە جۆرێك ئەگەر لە یەکیان دەربکەیت هیچ نامێنێتەوە، وەك (٢=٢)، (٤ = ٤)، (٦ = ٦)، (٨ = ٨)، وە هەروەها.

(٢) تداخل: واتە بەناو یەکدا چوون: بە نیسبەتی نێوان ژمارەیەکی گەورە و ژمارەیەکی بچووك دەوترێت، کە ژمارە گەورەکە دابەش دەکرێت بەسەر ژمارە بچوکەکەدا بە دابەش کردنێکی دروست، بەبێ ئەوە هیچ لە دابەش کردنەکە بمێنێتەوە، بە مانایەکی تر: ئەگەر چەند جارێك ژمارە بچوکەکە لە ژمارە گەورەکە دەربکرێت، ژمارە گەورەکە هیچی نامێنێتەوە، وەك: نیسبەتی نێوان:

أ. (٢) لەگەڵ هەر یەك لەم ژمارانە (٤ ـ ٦ ـ ٨ ـ ١٠ ـ ١٢)، هەروەها ئەگەر دوو دوو زیاد بکرێت.

ب. (٣) لەگەڵ هەر یەك لەم ژمارانە (٦ ـ ٩ ـ ١٣ ـ ١٥ ـ ١٨)، هەروەها ئەگەر سێ سێ زیاد بکرێت.

ت. (٤) لەگەڵ هەر یەك لەم ژمارانە (٨ ـ ١٢ ـ ١٦ ـ ٢٠ ـ ٢٤) هەروەها ئەگەر چوار چوار زیاد بکرێت.

بە هەمان شێوە ئەگەر هەر ژمارەیەك وەر بگیرێت، و هەرجارێك بە ئەندازەی خۆی زیاد بکرێت.

(٣) توافق: واتە پێکهاتن، و ڕێککەوتن، و پێکەوە گونجان: بە نیسبەتی نێوان دوو ژمارە دەوترێت کە هیچکامیان دابەش ناکرێت بەسەر ئەوی تریاندا، بەڵام هەردووکیان دابەش دەکرێن بەسەر ژمارەیەکی تردا (بێجگە لە یەك)، وەك نیسبەتی نێوان ئەم ژمارانە:

أ. (٤ـ٦ـ١٠ـ١٤ـ١٨ـ٢٢ـ٢٦) کە هەموویان دابەش دەکرێن بەسەر (٢)دا.

ب. (٦ـ٩ـ١٥ـ٢١ـ٢٧ـ٣٣ـ٣٩) کە هەموویان دابەش دەکرێن بەسەر (٣)دا.

ت. (٨ـ١٢ـ٢٠ـ٢٨ـ٣٦ـ٤٤) کە هەموویان دابەش دەکرێن بەسەر (٤)دا.

پ. (١٠ـ١٥ـ٢٥ـ٣٥ـ٤٥ـ٥٥) کە هەموویان دابەش دەکرێن بەسەر (٥)دا.

ج. (١٢ـ١٨ـ٣٠ـ٤٢ـ ٥٤) کە هەموویان دابەش دەکرێن بەسەر (٦)دا.

تێبینی: ئەگەر دوو ژمارە نیسبەتی نێوانیان (تداخل) بوو، ئەوا بێگومان (توافق)یش لە نێوانیاندا هەیە، وەك لە نمونەکاندا دەردەکەوێت. شێخی نۆدیش دەفەرموێت:

كلّ تداخل له توافق        من غير عكس، والمراد المطلق

(٤) تبـاين: واتە لەیەك دووری،: بە نیسبەتی نێوان دوو ژمارە دەوترێت کە نە بەسەر یەکتریدا داەش دەبن، و نە بەسەر ژمارەیەکی تردا، وەك نیسبەتی نێوان هەر یەك لەم ژمارانە:

أ. (٢) لەگەڵ هەر یەك لەم ژمارانە (٣ ـ ٥ ـ ٧ ـ ٩ ـ ١١ ـ ١٣ ـ ١٥).
ب. (٣) لەگەڵ هەر یەك لەم ژمارانە (٥ ـ ٧ ـ ١١ ـ ١٣ ـ ١٧ ـ ١٩).
ت. (٤) لەگەڵ هەر یەك لەم ژمارانە (٥ ـ ٧ ـ ٩ ـ ١١ ـ ١٣ ـ ١٥).
پ. (٥) لەگەڵ هەر یەك لەم ژمارانە (٧ ـ ٩ ـ ١١ ـ ١٣ ـ ١٧ ـ ١٩).
ج. (٦) لەگەڵ هەر یەك لەم ژمارانە ( ١١ ـ ١٣ ـ ١٧ ـ ١٩ ـ ٢٣).
ح. (٧) لەگەڵ هەر یەك لەم ژمارانە (٩ ـ ١١ ـ ١٣ ـ ١٥ ـ ١٧ ـ ١٩).

جا ئێستا کە نیسبەتی نێوان ژمارەکانمان زانی، ئەوجا دەگەڕێینەوە سەر دوو بابەتە سەرەکی‌یەکەی خۆمان، وە بۆ ڕوون کردنەوەی ئەو دوو بابەتەش دەڵێین:

وەك لە پێشەوە باسمان کرد: بەشە دیاریکراوەکان شەش دانەن، کە دەکرێت بیانکەین بە دوو جۆرەوە:

(١) نیوە، و چواریەك، و هەشت یەك.

(٢) سێ یەك، و دوو سێ یەك، و شەش یەك.

مەخرەجی هەر یەك لەم بەشانە هەر بە ناوی ژێرەی بەشەکەوە ناو نراوە، تەنها نیوە نەبێت کە مەخرەجەکەی دووە، کە چی پێی دەوترێت نیوە، و پێی ناوترێت: دوو، ئەوەتا دەبینین کە مەخرەجی چوار یەك بریتیە لە: چوار، و هەشت

یەك بریتیە لە: هەشت، و مەخرەجی (سێیەك، و دووسێیەك) بریتیە لە سێ، و مەخرەجی شەش یەکیش بریتیە لە: شەش.

ئەوجا پاش ئەوەی کە مەخرەجی هەر یەك لە بەشەکانمان زانی، ئیتر دێینە سەر چۆنێتی ڕاست کردنەوەی مەسئەلەکان، بە جۆرێك کە هەریەك لە میرات بەرەکان سەهم و بەشە میراتی خۆیان ببەن بە تەواوەتی و بە بێ ئەوەی کە بەشەکەیان شکانەوەی تێدا بێت، وە دێینە سەر چۆنێتی دروست کردنی:

# ئەصڵی مەسئەلەکان

ئەویش بە پێی ئەم چەند یاسایە:

(١) ئەگەر میرات بەرەکان هەموو عەصەبە بوون، ئەوا: ئەصڵی مەسئەلەیان بریتیە لە ژمارەی سەرەکانیان، واتە: ژمارەیان چەند کەس بوو میراتەکە دەکرێت بەوەندە بەشەوە، و هەر کەسەو بەشێك دەبات.

بۆ نموونە: کەسێك بمرێت: سێ کوڕ، یان سێ مامی لە پاش بەجێ بمێنێت، ئەوا: ئەصڵی مەسئەلەکەیان بریتیە لە سێ (٣)، چونکە خۆشیان سێ (٣) کەسن، و هەر کەسەو بەشێك دەبات. ئەمە لە کاتێك دا کە هەموو میرات بەرەکان نێرینە بوون.

یان کەسێك مردوە: سێ ئافرەت کە ئازادیان کردبوو، لە پاشی بەجێ مابوون، ئەوا دووبارە ئەصڵی مەسئەلەکەیان بریتیە لە سێ (٣)، چونکە خۆشیان سێ (٣) کەسن، و هەر کەسەو بەشێك دەبات. ئەمەشیان لە کاتێك دا کە هەموو میرات بەرەکان مێیینە بوون.

بەڵام ئەگەر هاتوو میرات بەرەکان دوو پۆل بوون، واتە: هەندێکیان نێرینە، و هەندێکیشیان مێیینە بوون، وە لەیەك پلەدابوون لە دووری و نزیکیان لە

مردوەکەوە، ئەوا: بەشی هەر نێرینەیەك دادەنرێت بە بەشی دوو مێیینە، کەواتە: ئەگەر کەسێك بمرێت: کورێك، و کچێکی لە پاش بەجێ بمێنێت، ئەوا: میراتەکە دەکرێت بە سیٚ (٣) بەشەوە، دوو (٢) بەشی کورەکە دەیبات، و یەك (١) بەشیش کچەکە.

شێخی نۆدی لەم بارەیەوە دەفەرموێت:

إن عصباتٍ كانت الورّاث　وهم ذكور، أو هنَ إناث
فمال من أصابه المنية　بينهمُ يقسم بالسوية
وقدِّر الذكر أنثيين　عند اجتماع ذينك الصنفين
وعدد الرؤوس منهم قيل له　في عرف أهل الفنّ: أصل المسألة

(٢) ئەگەر لە مەسئەلەیەکدا یەك خاوەن بەشی دیاریکراوی تێدا بوو، ئەوا ئەصڵی ئەو مەسئەلەیە بریتیە لە مەخرەجی ئەو بەشە.

بۆ نمونە: کەسێك بمرێت: باوك و دایکی لەپاش بەجێ بمێنێت، ئەوا دایکی کە خاوەن بەشی دیاری کراوە سیٚ یەك دەبات، و ئەوەشی کە دەمێنێتەوە باوکی دەیبات بە عەصەبەگەرایەتی، کەواتە ئەصڵی مەسئەلەکە بریتیە لە سیٚ (٣) کە مەخرەجی بەشی دایکەکەیە، جا ئێستا دایکەکە یەك بەش دەبات، و دوو بەشیشی دەمێنێتەوە، و دەدرێت بە باوکەکە.

یان ئەگەر کەسێك بمرێت: دوو کچ، و برایەکی دایك و باوکی لە پاش بەجێ بمێنێت. ئەوا: دوو کچەکە دوو سیٚ یەك دەبەن، براکەش عەصەبەیە، کەواتە ئەصڵی مەسئەلەکە بریتیە لە سیٚ (٣) کە مەخرەجی بەشی دوو کچەکەیە، جا ئێستا دوو کچەکە دوو بەش دەبەن، و یەك بەشیش دەمێنێتەوە بۆ براکە.

یان ئەگەر پیاوێك بمرێت: ژنێك، و باوکی لە پاش بەجێ بمێنێت. ئەوا: ژنەکە چوار یەك دەبات، و باوکەکەش عەصەبەیە، کەواتە ئەصڵی مەسئەلەکە بریتیە لە

چوار (٤)، کە مەخرەجی بەشی ژنەکەیە، جا ئێستا ژنەکە یەك بەش دەبات، و سێ بەشیش دەمێنێتەوە بۆ باوکەکە.

(٣) ئەگەر لە مەسئەلەیەکدا زیاد لە خاوەن بەشێکی تێدا بوو، ئەوا سەیر دەکەین:

أ. ئەگەر بەشەکان هەموو لە یەك جۆر بوون، و مەخرەجی بەشەکانیش وەکویەك وەها بوون، ئەوا یەکێك لە مەخرەجەکان دەبێت بە ئەصلی مەسئەلەکە.

بۆ نمونە: ئەگەر کەسێك بمرێت: دوو خوشکی دایك و باوکی، و دوو خوشکی تەنها دایکی لە پاش بەجێ بمێنێت. ئەوا: دوو خوشکە دایك و باوکیەکە دوو سێ یەك دەبەن، و دوو خوشکە دایکیەکەش سێ یەك دەبەن، کەواتە ئەصلی مەسئەلەکە بریتیە لە سێ (٣).

یان ئەگەر ژنێك بمرێت: مێرد، و خوشکێکی دایك و باوکی لە پاش بەجێ بمێنێت. ئەوا: مێردەکە نیوە دەبات، و خوشکەکەش نیوە دەبات، کەواتە ئەصلی مەسئەلەکە بریتیە لە دوو (٢).

ب. ئەگەر بەشەکان هەموو لە یەك جۆر بوون، بەلاّم مەخرەجی بەشەکان جیاواز بوون لەیەك، بۆ نموونە لە جۆری یەکەم: نیوە، و چوار یەك. یان: نیوە، و هەشت یەك. وە لە جۆری دوەم: سێ یەك، و شەش یەك. یان: دوو سێ یەك، و شەش یەك. ئەوا ئەصلی مەسئەلە بریتیە لە مەخرەجە گەورەکەیان، چونکە مەخرەجە بچوکەکە دەچێت بە ناو مەخرەجە گەورەکەدا، و گەورەگەش دابەش دەبێت بەسەر بچوکەکەدا.

بۆ نمونە: ئەگەر پیاوێك بمرێت: ژنێك، و کچێکی لە پاش بەجێ بمێنێت. ئەوا: ژنەکە هەشت یەك دەبات، و کچەکەش نیوە دەبات. کەواتە ئەصلی مەسئەلەکە بریتیە لە هەشت (٨).

یان: ژنێك بمرێت: مێرد، و کچێکی لە پاش بەجێ بمێنێت. ئەوا: مێردەکە چوار یەك دەبات، و کچەکەش نیوە دەبات. کەواتە ئەصڵی مەسئەلەکە بریتیە لە چوار (٤).

یان کەسێك بمرێت: دایك، و دوو خوشکی تەنها دایکی لە پاش بەجێ بمێنێت. ئەوا: دایکەکە شەش یەك دەبات، و دوو خوشکە دایکیەکەش سێ یەك دەبەن. کەواتە ئەصڵی مەسئەلەکە بریتیە لە شەش (٦).

یان کەسێك بمرێت: دایك، و دوو خوشکی دایك و باوکی لە پاش بەجێ بمێنێت. ئەوا: دایکەکە شەش یەك دەبات، و دوو خوشکەکەش دوو سێ یەك دەبەن. کەواتە ئەصڵی مەسئەلەکە بریتیە لە شەش (٦).

ت. ئەگەر بەشەکان لە یەك جۆر نەبوون، ئەوا سەیر دەکەین:

١) ئەگەر نیوە، کە لە جۆری یەکەمە، کۆبوویەوە لە گەڵ هەرکام لە بەشەکانی جۆری دوەم، ئەوا ئەصڵی مەسئەلەکە بریتیە لە شەش (٦).

بۆ نموونە: ئەگەر ژنێك بمرێت: مێرد، و دوو خوشکی تەنها دایکی لە پاش بەجێ بمێنێت. ئەوا: مێردەکە نیوە دەبات، و دوو خوشکەکەش سێ یەك دەبەن، کەواتە ئەصڵی مەسئەلەکە بریتیە لە شەش (٦).

یان ئەگەر ژنێك بمرێت: مێرد، و دوو خوشکی دایك و باوکی لە پاش بەجێ بمێنێت. ئەوا: مێردەکە نیوە دەبات، و دوو خوشکەکەش دوو سێ یەك دەبەن، کەواتە ئەصڵی مەسئەلەکە بریتیە لە شەش (٦).

یان ئەگەر ژنێك بمرێت: مێرد، و دوو خوشکی دایك و باوکی، و دوو خوشکی تەنها دایکی لە پاش بەجێ بمێنێت. ئەوا: مێردەکە نیوە دەبات، و دوو خوشکە دایك و باوکیەکەش دوو سێ یەك دەبەن، و دوو خوشکە تەنها دایکیەکەش سێ یەك دەبەن کەواتە ئەصڵی مەسئەلەکە بریتیە لە شەش (٦).

یان ئەگەر ژنێك بمرێت: مێرد، و دایك، و دوو خوشكی تەنها دایكی لە پاش بەجێ بهێنێت. ئەوا: مێردەكە نیوە دەبات، و دایكەكەش شەش یەك دەبات، و دوو خوشكەكەش سێ یەك دەبەن، كەواتە ئەصڵی مەسئەلەكە بریتیە لە شەش(٦).

٢) ئەگەر چوار یەك كە لە جۆری یەكەمە، كۆبوویەوە لە گەڵ هەركام لە بەشەكانی جۆری دوەم، ئەوا ئەصڵی مەسئەلەكە بریتیە لە دوازدە (١٢).

بۆ نمونە: ئەگەر ژنێك بمرێت: مێرد، و دوو كچی لە پاش بەجێ بهێنێت. ئەوا مێردەكە چوار یەك دەبات، و دوو كچەكەش دوو سێ یەك دەبەن، كەواتە ئەصڵی مەسئەلەكە بریتیە لە دوازدە (١٢).

یان ئەگەر پیاوێك بمرێت: ژنێك، و دایكی لە پاش بەجێ بهێنێت. ئەوا: ژنەكە چوار یەك دەبات، و دایكەكەش سێ یەك دەبات، كەواتە ئەصڵی مەسئەلەكە بریتیە لە دوازدە (١٢).

یان ئەگەر پیاوێك بمرێت: ژنێك، و دایك، و دوو خوشكی تەنها دایكی لە پاش بەجێ بهێنێت. ئەوا: ژنەكە چوار یەك دەبات، و دایكەكەش شەش یەك دەبات، و دوو خوشكەكەش سێ یەك دەبەن، كەواتە ئەصڵی مەسئەلەكە بریتیە لە دوازدە (١٢).

یان ئەگەر پیاوێك بمرێت: ژنێك، و دایك، و دوو خوشكی دایك و باوكی لە پاش بەجێ بهێنێت. ئەوا: ژنەكە چوار یەك دەبات، و دایكەكەش شەش یەك دەبات، و دوو خوشكەكەش دوو سێ یەك دەبەن، كەواتە ئەصڵی مەسئەلەكە بریتیە لە دوازدە (١٢).

یان ئەگەر پیاوێك بمرێت: ژنێك، و دایك، و دوو خوشكی دایك و باوكی، و دوو خوشكی تەنها دایكی لە پاش بەجێ بهێنێت. ئەوا: ژنەكە چوار یەك دەبات،

و دایکەکەش شەش یەك دەبات، و دوو خوشکە دایك و باوکیەکەش دوو سیٚ یەك دەبەن، و دوو خوشکی تەنها دایکیەکەش سیٚیەك دەبەن، کەواتە ئەصلّی مەسئەلەکە بریتیە لە دوازدە (١٢).

٣) ئەگەر هەشت یەك کە لە جۆری یەکەمە، کۆبوویەوە لە گەلّ هەرکام لەو بەشانەی جۆری دوەم، کە دەگونجێت لەگەلّیاندا کۆببێتەوە، ئەوا ئەصلّی مەسئەلەکە بریتیە لە بیست و چوار (٢٤).

بۆ نمونە: ئەگەر پیاوێك بمرێت: ژنێك، و دوو کچی لە پاش بەجیٚ بهێنێت. ئەوا: ژنەکە هەشت یەك دەبات، و دوو کچەکەش دوو سیٚ یەك دەبەن، کەواتە ئەصلّی مەسئەلەکە بریتیە لە بیست و چوار (٢٤).

یان ئەگەر پیاوێك بمرێت: ژنێك، و دایك، و کوڕێکی لە پاش بەجیٚ بهێنێت. ئەوا: ژنەکە هەشت یەك دەبات، و دایکەکەش شەش یەك دەبات، و کوڕەکەش عەصەبەیە، کەواتە ئەصلّی مەسئەلەکە بریتیە لە بیست و چوار (٢٤).

یان ئەگەر پیاوێك بمرێت: ژنێك، و دایك، و دوو کچی لە پاش بەجیٚ بهێنێت. ئەوا: ژنەکە هەشت یەك دەبات، و دایکەکەش شەش یەك دەبات، و دوو کچەکەش دوو سیٚ یەك دەبەن، کەواتە ئەصلّی مەسئەلەکە بریتیە لە بیست و چوار (٢٤).

جا بزانە کە ناگونجێت هەشت یەك لەگەلّ سیّیەك دا کۆ ببێتەوە. چونکە هەشت یەك بەشی ژنێکە کە مێردە مردوەکەی منداڵی هەبێت، بەلاّم سێیەك بەشی دایك، یان چەند برایەکی دایکی کە مردوەکەیان منداڵی نەبێت. کەواتە لە هەشت یەکەکەدا دەبێت منداڵ هەبێت، بەلاّم لە سێیەکەکەدا دەبێت منداڵ نەبێت.

هەروەها ناگونجێت هەشت یەك لەگەڵ چواریەکدا کۆ ببێتەوە. چونکە وەك وتمان: هەشت یەك بەشی ژنێکە کە مێردە مردوەکەی منداڵی هەبێت، بەلاّم چواریەك بەشی مێردێکە کە ژنەکەی منداڵی هەبێت، یان بەشی ژنێکە کە مێردەکەی منداڵی نەبێت.

یەکێك لە شاعیران دەفەرموێت [1]:

والثمن في الميراث لا يجامع    ثلثا ولا ربعا وغير واقع

کەواتە دەکرێت بڵێین: هەر مەسئەلەیەك کە خاوەن بەشی دیاری کراوی تێدابێت، ئەوا ئەصڵی مەسئەلەکەی بریتیە لە یەکێك لەم حەوت ژمارە: (٢، ٣، ٤، ٦، ٨، ١٢، ٢٤).

تێبینی: زانایان یەکدەنگن لەوەدا کە ئەو حەوت ژمارەیەی کە باسمان کردن ئەصڵی مەسئەلەکانن، بەلاّم وەك لە باسی کۆبوونەوەی باپیرە و برا و خوشکەکاندا، باسی هەندێك حاڵەتمان کرد کە یەکێك لە بەشەکان بریتیە لە سێیەکی پاشماوە (ثلث الباقي)، بۆیە بە کۆبوونەوەی ئەم جۆرە بەشە لەگەڵ شەش یەك، یان شەش یەك و چوار یەك، ئەوا دوو ئەصڵی تر پەیدا دەبن بۆ مەسئەلەکان، کە بریتین لە:

(١) هەژدە (١٨)، لە هەر مەسئەلەیەکدا کە شەش یەك و سێیەکی پاشماوەی تێدا بێت.

(٢) سی و شەش (٣٦)، لە هەر مەسئەلەیەکدا کە چوار یەك و شەش یەك و سێیەکی پاشماوەی تیدا بێت.

---

١) الباجوري على الشنشوري ١٤٨، الأنوار ٣ / ٢٢٩.

لەبەر ئەوە زانایانی (متأخرین)ی مەزهەبی ئیمامی شافیعی ئەم دوو ژمارەشیان زیاد کردوە، بەمەش ئەصڵی مەسئەلەکان ژمارەیان بوو بە نۆ، کە ئەمانەن (٢، ٣، ٤، ٦، ٨، ١٢، ١٨، ٢٤، ٣٦). [١]

شێخی نۆدی لەم بارەیەوە دەفەرموێت:

فجملـــة الأصول سبـعة تـرى    مـخارج الفروض، واثنى عشرا
وضِعفه، و ذاك قول الســلف    لـكنها قـــد زاد بعـض الخلف
أصلين أخريين: ضِعف التسعة    وضِعف ضعفها، فصارت تسعة

١) المغني ٣٢، النهاية ٣٥، الكنوز ٢٢٩، ابن القاسم على الرحبية١٠٤، التحفة ٦ / ٤٣٠، الجمل، شرح المنهج ٦ / ١١٠، الكمثرى على الأنوار ٢ / ٨.

# باسی زیادکردن و بەرزکردنەوە (عول)

(عول) بە زیاد کردنی ژمارەی بەشی بەشە میراتەکان، و کەم بوونەوەی ئەندازەی بەشی میرات بەرەکان دەوترێت. بە مانایەکی تر: زیادکردنی ئەصڵی مەسئەلە، کە ئەم زیادکردنە لە ئەنجامی زۆری ژمارەی بەشی خاوەن بەشەکانەوە پەیدا دە بێت، و دەبێت بە هۆی کەم بوونەوەی بەشی خاوەن بەشەکان.

یەك لە شاعیران دەفەرموێت:[1]

العول أن يزاد في السهام فينقص النصاب عن تمام

جا بزانە کە ئەم پێناسەیە لە وشەی (عول)ەوە وەرگیراوە کە لە زمانەوانی دا بەمانای:

(١) بەرز بوونەوە، چونکە بەم زیاد بوونە، ژمارەی بەشی خاوەن بەشەکان بەرز دەبێتەوە بۆ زیاتر لە ئەصڵی مەسئەلەکە.

(٢) ستەم لێ کردن، چونکە لە مەسئەلەکە دا بەهۆی زۆری ژمارەی خاوەن بەشەکانەوە، ناچار دەبین کە بۆ دابەش کردنی ئەصڵی مەسئەلەکە بە سەریان دا، هەر خاوەن بەشێك ئەندازەیەك لە میراتەکەی کەم بکەینەوە، بەمەش جۆرە ستەمێکی تێدایە لە خاوەن بەشەکان، کە هیچ کامیان بەشی دیاری کراوی خۆیان پێ نەدراوە.

جا بزانە کە بە شێوەیەکی گشتی مەسئەلەکانی میرات سێ جۆریان هەیە[2]:

---

١) الكنوز ٢٢٩.

٢) المجموع ١٤٢-١٤٣، الفقه الإسلامي٧٨٢٠-٧٨٢١، المبسوط٧/٥٦٢، مغني ابن قدامة ٧/٣٢

(١) **المسألة العادلة:** بریتیە لەو مەسئەلەیەی کە ژمارەی بەشی خاوەن بەشەکان یەکسانە بە ئەصڵی مەسئەلەکە. جا دەکرێت ئەم یەکسانیە بەوە بێت کە مەسئەلەکە تەنها چەند میرات بەرێکی خاوەن بەشی دیاری کراوی تێدا بێت، و بەشەکانیشیان یەکسان بێت بە ئەصڵی مەسئەلەکە، وەك مەسئەلەی: مێرد، و خوشکی دایك و باوکی، مێردەکە نیوە دەبات، و خوشکەکەش نیوە دەبات، کەواتە ئەصڵی مەسئەلەکەش دووە (٢)، یەك بەشی بۆ مێردەکە، و یەك بەشیشی بۆ خوشکەکە. یان یەکسانیەکە بەوە دەبێت کە لەگەڵ خاوەن بەشە دیاری کراوەکان دا میرات بەری عەصەبەش هەیە، کە ئەوەی لە خاوەن بەشەکان دەمێنێتەوە بە عەصەبەگەرایەتی دەیبات، وەك مەسئەلەی: ژن، و دایك، و برای دایك و باوکی. ژنەکە چوار یەك دەبات، و دایکەکەش سێ یەك دەبات، و براکەش عەصەبەیە، کەواتە ئەصڵی مەسئەلەکە دوازدەیە (١٢)، سێ (٣) بەشی ژنەکە دەیبات، و چوار (٤) بەشیش دایکەکە دەیبات، و پێنج (٥) بەشیش دەمێنێتەوە براکە بە عەصەبەگەرایەتی دەیبات.

(٢) **المسألة العائلة:** بریتیە لەو مەسئەلەیەی کە ژمارەی بەشی خاوەن بەشەکان زیاترە لە ئەصڵی مەسئەلەکە، و میرات بەرەکانیش عەصەبەیان تێدا نیە. جا بۆ تەواو کردنی بەشی خاوەن بەشەکان دەبێت ئەصڵی مەسئەلەکە زیاد بکەین، کە ئەم زیاد کردنە دەبێتە هۆی کەم کردنەوەی بەشی خاوەن بەشەکان، هەر کەسەو بە گوێرەی بەشەکەی خۆی، چونکە زانایان فەرموویانە: وەك چۆنماڵی مردووی قەرزار، کە قەرزەکان لە ئەندازەی ماڵەکە زیاترن، یان ماڵێك کە وەصیەتی تێدا کرابێت، و سێ یەکی میراتەکەش بەشی وەصیەت بۆ کراوەکان نەکات، ئەوا بە ناچاری لە هەردوو شێوەکەدا دەبێت بەشی خاوەن قەرزەکان، و

بەشی وەصیەت بۆ کراوەکان، کەم بکرێتەوە، کەواتە دەبێت لە میراتیشدا هەر بەو شێوەیە بێت. (١)

(٣) **المسألة القاصرة:** بریتیە لەو مەسئەلەیەی کە ژمارەی بەشی خاوەن بەشەکان کەمترە لە ئەصڵی مەسئەلەکە، و میرات بەرەکانیش عەصەبەیان تێدا نیە کە پاشماوەی خاوەن بەشەکان ببات. بۆیە لەم جۆرە مەسئەلەیەدا پاشماوەی بەشی خاوەن بەشەکان دەگەڕێنرێتەوە بۆ خاوەن بەشەکان، هەر کەسەو بە گوێرەی بەشەکەی خۆی، تەنها ژن، و مێرد نەبێت کە بە کۆ دەنگی زانایان هیچیان بۆ ناگەڕێنرێتەوە، نمونەی ئەم جۆرە مەسئەلەیە بە دوور و درێژی لە باسی گەڕانەوەدا (رّد) ڕوون دەکەینەوە، گەر خوا بیەوێت.

ئەوجا بزانە کە (عول) نە لە سەردەمی حەزرەت (دروودی خوای لێ بێت)، و نە لە سەردەمی ئیمامی ئەبو بەکر (خوای لێ ڕازی بێت) دا نەکراوە، بەڵکو بۆ یەکەم جار لە سەردەمی ئیمامی عومەر دا (خوای لێ ڕازی بێت) کراوە، ئەویش کاتێك کە مەسئەلەی: مێرد، و دوو خوشکی دایك و باوکیان هێنایە خزمەتی، ئەویش هاوەڵانی پێغەمبەری (دروودی خوای لێ بێت) کۆ کردەوە، و فەرمووی: ئەگەر بە مێردەکە دەست پێ بکەم، و سەرەتا بەشی ئەو بدەم -- کە نیوەیە — ئەوا بەشی دوو خوشکەکە بە تەواوەتی نامێنێتەوە، و ئەگەر بە دوو خوشکەکەش دەست پێ بکەم، و بەشی ئەوان بدەم — کە دوو سێ یەکە -- ئەوا بەشی مێردەکە نامێنێتەوە، جا بزانم ئێوە ڕاتان چیە؟ یەك لە هاوەڵان کە (عباس یان علي یان زید) فەرمووی: ئەصڵی مەسئەلەکە زیاد بکە، دوو بارە ئەو هاوەڵە فەرمووی: باشە ئەگەر کابرا مردبێت، و شەش دیرهەمی لە پاش بەجێ مابێت، و کەسێك

---

١) المغني ٣٣، المجموع ١٤٣، شرح المنهج ٦ / ١١٢، المحلي ١٥٣، فتح الجواد ٤٢٥، الميراث المقارن ١٨٣.

سێ دیرهەمی لە لای بێت، و کەسێکی تریش چوار دیرهەم، ئایا میراتەکەی — کە شەش دیرهەمەکەیە — ناکەیت بە حەوت بەشەوە؟ ئیمامی عومەریش فەرمووی: بەڵێ دەیکەم بە حەوت بەشەوە. ئیتر هاوەڵەکەش فەرمووی: دەی کەوا بوو ئەمیش وەك ئەو لێ بکە. بەمەش کۆ دەنگی هاوەڵان دروست بوو لە مەسئەلەی (عول) دا. بەڵام لە پاش مردنی ئیمامی عومەر، عەبدوڵای کوڕی عەباس بە پێچەوانەی ئەم کۆ دەنگیە فەتوای دا. [1]

دیسان بزانە کە لە (فرائض ) دا ئەصڵی مەسئەلەکان تەنها سیانیان (عەول) یان تێدا دەکرێت، چونکە ئەو ژمارانەی کە دەبنە ئەصڵی مەسئەلە دەکرێن بە دوو جۆرەوە: [2]

(١) ژمارەی تەواو: بریتیە لەو ژمارەیەی کە ئەو کەرتانەی کە تێی دەکەوێت، یان یەکسان بن بە ژمارەکە خۆی. بۆ نمونە: شەش (٦)، نیوە، و سێ یەك، و شەش یەکی هەیە، کە هەموویان کۆ بکەینەوە (٣ + ٢ + ١) دەکاتەوە: شەش (٦). یان ئەو کەرتانەی کە تێی دەکەوێت زیاتر بن لە ژمارەکە خۆی. بۆ نموونە: دوازدە (١٢)، نیوە، و سێ یەك، و چوار یەك، و شەش یەکی هەیە، کە هەموویان کۆ بکەینەوە (٦ + ٤ + ٣ + ٢) دەکاتە: پازدە (١٥).

(٢) ژمارەی ناتەواو: بریتیە لەو ژمارەیەی کە ئەو کەرتانەی کە تێی دەکەوێت، کەمترە لە ژمارەکە خۆی، بۆ نمونە: چوار (٤)، نیوە، و چوار یەکی هەیە، کە هەردووکیان کۆ بکەینەوە (٢ + ١) دەکاتە: سێ (٣). وەهەروەها

---

١) السنن الكبرى ١٢٢٣٧، المستدرك ٧٩٨٥، الباجوري ١٤٥، الدر المنثور٢ / ٤٥٠، التحفة مع الشرواني٤٣١، النهاية ٣٥، المغني ٣٢، المجموع ١٤٤، الفقه الإسلامي٧٨٢٠، الإعانة ٢٤٢، الكنوز ٢٣١، المبسوط ٧ /٥٦٢.

٢) الباجوري على الشنشوري ١٤٤، المغني ٣٣، حاشيتا القليوبي و عميرة على المحلي ١٥٢، البجيرمي ٢٦٣، الجمل ٦ / ١١١، الكمثرى على الأنوار ٢ / ٨.

هەشت (٨)، نیوە، و چوار یەك، و هەشت یەکی هەیە، کە هەموویان کۆ بکەینەوە (٤ + ٢ + ١) دەکاتە حەوت (٧).

جا هەر ئەصڵی مەسئەلەیەك کە ژمارەیەکی تەواو بێت، وەك: (شەش، دوازدە، بیست و چوار )، ئەوا یان بەشی خاوەن بەشەکان لەگەڵی یەکسانن، یان زیاترن، و پێویستیان بە (عول) هەیە، بەڵام هەر ئەصڵی مەسئەلەیەك کە ژمارەیەکی ناتەواو بێت، ئەوا هەرگیز پێویست بە (عول) ناکات، چونکە وەك باسمان کرد: هەمیشە کۆی کەرتەکانی لە خۆی کەمترن، وەك لەمەولا ڕوونی دەکەینەوە

## زیاد کردن لە (شەش ) دا

شەش (٦): زیاد کردن تیایدا ڕوو دەدات یەکە یەکە تا دەگاتە دە (١٠).

أ. زیادبوونی شەش بۆ حەوت (٧): وەکو مەسئەلەی: مێرد، و دوو خوشکی دایك و باوکی. ئێستا ئەصڵی مەسئەلەکەیان لە شەشە (٦)، چونکە مێردەکە نیوە دەبات، و خوشکەکانیش لەسێ بەش دوو بەش دەبەن. بەم پێیە سێ (٣) بەشی بۆ مێردەکەیە، و چوار (٤) بەشیش بۆ دوو خوشکەکانە، ئێستا (٣+٤=٧) بە زیاد بوونی یەك (١).

| | | | |
|---|---|---|---|
| ئەصڵی مەسئەلە | | ٦ ⟵ + ١ | ٧ |
| مێرد | نیوە | ٣ | ٣ |
| دوو خوشکی دایك و باوکی | دوسێیەك | ٣ (؟) | ٤ |

ب.زیاد بوونی شەش بۆ هەشت (٨): وەکو مەسئەلەی: مێرد، و دوو خوشکی باوکی، ودایك. ئێستا ئەصڵی مەسئەلەکەیان لە شەشە (٦)، چونکە مێردەکە نیوە دەبات — کە دەکاتە سێ (٣) بەش --، دوو خوشکەکەش دوو سێ یەك دەبەن — کە دەکاتە (٤) بەش --، و دایکەکەش شەش یەك دەبات — کە دەکاتە یەك (١) بەش --، ئێستا (٣ + ٤ + ١ = ٨) بە زیاد بوونی دوو (٢).

| ئەصڵی مەسئەلە | | ٦ ← + ٢ | ٨ |
|---|---|---|---|
| مێرد | نیوە | ٣ | ٣ |
| دوو خوشکی دایك و باوکی | دووسێیەك | ٣ (؟) | ٤ |
| دایك | شەش یەك | ٠ (؟) | ١ |

جا بزانە کە ئەم مەسئەلەیە پێی دەوترێت: (المباهلة)، چونکە وەك باسمان کرد: پاش ئەوەی کە کۆ دەنگی هاوەڵان هاتە سەر ئەوەی کە (عول) کردن لە هەندێك مەسئەلە دا درووستە و بەڵکو پێویستیشە، عەبدوڵای کوڕی عەباس بە پێچەوانەی ئەم کۆ دەنگیەوە فەتوای دا، و فەرمووی: لەم مەسئەلەیە دا، مێردەکە نیوە دەبات، و دایکەکەش سێ یەك دەبات، و پاشماوەکەشی خوشکەکە دەیبات. [1] یان بە جۆرێکی تر فەرمووی: مێردەکە نیوە دەبات، و پاشماوەکەش بۆ دایك، و خوشکەکە دەبێت، بۆیە پرسیاری لێ کرا: بۆچی بە پێچەوانەی کۆ دەنگی هاوەڵانەوە فەتوا دەدەیت؟ ئەویش فەرمووی: (إن شاؤوا فلندع أبنائنا، وأبنائهم، ونسائنا، ونسائهم، و أنفسنا، وأنفسهم، ثمّ نبتهل، فنجعل لعنة الله على الكاذبين)، ئەوجا پێیان وت: ئەی لە کاتی کۆ دەنگیەکەدا بۆ وات نە

١) المغني ٣٥.

فەرمووی؟ ئەویش فەرمووی: ئیمامی عومەر پیاوێكی سامناك بوو.[١]

ت.زیاد بوونی شەش بۆ نۆ (٩): وەكو مەسئەلەی: مێرد، و دوو خوشكی باوكی، و دایك، و برایەكی دایكی. ئێستا ئەصڵی مەسئەلەكەیان لە شەشە (٦)، چونكە مێردەكە نیوە دەبات -كە دەكاتە سێ (٣) بەش-، دوو خوشكەكەش دوو سێ یەك دەبەن -كە دەكاتە (٤) بەش-، و دایكەكەش شەش یەك دەبات -كە دەكاتە یەك (١) بەش-، و برا دایكیەكەش شەش یەك دەبات — كە دەكاتە یەك (١) بەش، ئێستا (٣+٤+١+١=٩) بە زیادبوونی سێ(٣).

| ئەصڵی مەسئەلە | | ٦ ← + ٣ | ٩ |
|---|---|---|---|
| مێرد | نیوە | ٣ | ٣ |
| دوو خوشكی دایك و باوكی | دووسێیەك | ٣ (؟) | ٤ |
| دایك | شەش یەك | ٠ (؟) | ١ |
| یەك برای دایكی | شەش یەك | ٠ (؟) | ١ |

پ. زیاد بوونی شەش بۆ دە (١٠): وەكو مەسئەلەی: مێرد، و دوو خوشكی باوكی، و دایك، و دوو برای دایكی. ئێستا ئەصڵی مەسئەلەكەیان لە شەشە (٦)، چونكە مێردەكە نیوە دەبات —كە دەكاتە سێ (٣) بەش-، دوو خوشكەكەش دوو سێ یەك دەبەن —كە دەكاتە (٤) بەش-، و دایكەكەش شەش یەك دەبات —كە دەكاتە یەك (١) بەش-، و دوو برا دایكیەكەش سێ یەك دەبەن — كە دەكاتە دوو (٢) بەش، ئێستا (٣ + ٤ + ١ + ٢ = ١٠) بە زیاد بوونی چوار (٤).

---

٢) السنن الكبرى ١٢٢٣٧، تحفة الطلاب٤٣١-٤٣٢، النهاية ٣٥، المغني ٣٣، شرح المنهج ٦ / ١١٢، القليوبي١٥٢-١٥٣، الإعانة ٢٤٢.

| | | | |
|---|---|---|---|
| ئەصڵی مەسئەلە | | ٦ ⟵ ٤ + | ١٠ |
| مێرد | نیوە | ٣ | ٣ |
| دوو خوشکی دایك و باوکی | دووسێیەك | ٣ (؟) | ٤ |
| دایك | شەش یەك | ٠ (؟) | ١ |
| دوو برای دایکی | سێیەك | ٠ (؟) | ٢ |

جا بزانە کە ئەم مەسئەلەیە پێی دەوترێت: (أم الفروخ)، لەبەر ئەوەی کە چەند جارێك لەسەر یەك (عول) ی تێدا کراوە، چونکە ئەم مەسئەلەیە، هەر هەمان مەسئەلەی یەکەمە، کە (عول) ێکی تێدا کرا، پاشان لە مەسئەلەی دوەم دا (عول) ێکی تر، پاشان لە مەسئەلەی سێ یەم دا (عول) ێکی تر، پاشان خۆشی (عول) ێکی تێدا کرا، بەمەش ژمارەی (عول) ەکانی بوون بە چوار، جا زانایان فەرموویانە ئەم مەسئەلەیە وەك ئەو باڵدارە وەهایە کە بێچوویەکی زۆری لەگەڵ دایە.

هەروەها بە (الشريحية) ش ناو دەبرێت [١]، چونکە قاضي شورەیح [٢] بەم شێوەیە بڕیاری تێدا داوە.

---

١) المبسوط ٧ / ٥٦٢، المهذب ١٣٥، منار السبيل ٢ / ٥٤، مغني ابن قدامة٧ /٣٣، التحفة مع الشرواني ٤٣٢، المغني ٣٣، شرح المنهج ٦ / ١١٢، القليوبي١٥٣، الفقه الإسلامي ٧٨٠٨، الأنوار ٣ / ٢٤٢.

٢) ناوی شورەیحی کوڕی حارث ی کوڕی قەیسی کیندی کوفیيە، هەروەها پێشی دەوترێت: شورەیحی کوڕی شەرحەبیل، یەکێکە لەو کەسانەی کە هەم لە سەردەمی نەفامی، و هەم لە سەردەمی ئیسلامدا ژیاوە، بەڵام وتەی ڕاست لەسەر ئەوەیە کە بە هاوەڵی حەزرەت دانانرێت، بەڵکو بە تابیعی دادەنرێت، چونکە بە خزمەتی حەزرەت نەگەیشتوە، زۆر شارەزا بوە لە بواری شەرع و قەزاوەتدا، هەربۆیە ئیمامی عومەر کردویەتی بە قازی شاری کوفە، پاشان ئیمامی عەلیش هەر داینا وەتەوە بە قازی، ئیتر هەروا بە قازیيەتی ماوەتەوە، نزیکەی پەنجا و سێ ساڵ لەم پۆستەدا بوە، و حەوت ساڵیش لە شاری بەصرە

## زیاد کردن لە (دوازدە) دا

دوازدە (١٢): زیاد دەکرێت تا دەگاتە حەڤدە: بەڵام زیاد کردنەکەی تەنها بۆ تاکەکانە، نەك جووتەکان، وەك زیاد کردن بۆ:

أ. سیازدە (١٣): وەکو مەسئەلەی: ژن، و دایك، و دوو خوشکی دایك و باوکی. ئێستا ئەصڵی مەسئەلەکەیان لە دوازدەیە (١٢)، چونکە ژنەکە چوار یەك دەبات – کە دەکاتە سێ (٣) بەش --، و دایکەکە شەش یەك دەبات – کە دەکاتە دوو (٢) بەش --، و دوو خوشکەکەش دوو سێ یەك دەبەن – کە دەکاتە هەشت (٨) بەش --، ئێستا (٣ +٢ + ٨ = ١٣)، بە زیاد بوونی یەك (١).

| | | | |
|---|---|---|---|
| ئەصڵی مەسئەلە | | ١٢ ← + ١ | ١٣ |
| ژنێك | چواریەك | ٣ | ٣ |
| دایك | شەش یەك | ٢ | ٢ |
| دوو خوشکی دایك و باوکی | دووسێیەك | ٧ (؟) | ٨ |

بوە، هەتاوەکو سەردەمی حەجاجی کوڕی یوسف، ئیتر ساڵێك بەرلە وەفاتی لە قەزاوەت لابراوە، و پاشان فەوتی کردوە، لە تەمەنی سەد و بیست ساڵیدا، لە ساڵی حەفتا و هەشتی کۆچی. چەند فەرموودەیەکی حەزرەتی گێڕاوەتەوە لەم ئیمامانە (عومەر، عەلی، زەید، ئیبنو مەسعود، عەبدوڕحمانی کوڕی ئەبو بەکری صیدیق). بڕوانە: تهذیب الکمال ١٢ / ٤٣٧، و الإصابة في تمییز الصحابة، ٣ / ٣٤٤، و تذکرة الحفاظ ١ / ٥٩.

ب.پازده (١٥): وەکو مەسئەلەی: ژن، و دایك، و دوو خوشکی دایك و باوکی، و برایەکی دایکی. ئێستا ئەصڵی مەسئەلەکەیان لە دوازدەیە (١٢)، چونکە ژنەکە چوار یەك دەبات — کە دەکاتە سێ (٣) بەش --، و دایکەکە شەش یەك دەبات — کە دەکاتە دوو (٢) بەش --، و دوو خوشکەکەش دوو سێ یەك دەبەن — کە دەکاتە هەشت (٨) بەش --، و برا دایکیەکەش شەش یەك دەبات — کە دەکاتە دوو (٢) بەش --، ئێستا (٣ +٢ + ٨ + ٢ = ١٥)، بە زیاد بوونی سێ (٣).

| | | | |
|---|---|---|---|
| ئەصڵی مەسئەلە | | ١٢ ← + ٣ | ١٥ |
| ژنێك | چواریەك | ٣ | ٣ |
| دایك | شەش یەك | ٢ | ٢ |
| دوو خوشکی دایك و باوکی | دووسێیەك | ٧ (؟) | ٨ |
| یەك برای دایکی | شەش یەك | ٠ (؟) | ٢ |

ت.حەڤدە (١٧): وەکو مەسئەلەی: ژن، و دایك، و دوو خوشکی دایك و باوکی، و دوو برای دایکی. ئێستا ئەصڵی مەسئەلەکەیان لە دوازدەیە (١٢)، چونکە ژنەکە چوار یەك دەبات — کە دەکاتە سێ (٣) بەش --، و دایکەکە شەش یەك دەبات — کە دەکاتە دوو (٢) بەش --، و دوو خوشکەکەش دوو سێ یەك دەبەن — کە دەکاتە هەشت (٨) بەش --، و دوو برا دایکیەکەش سێ یەك دەبەن — کە دەکاتە چوار (٤) بەش --، ئێستا (٣ +٢ + ٨ + ٤ = ١٧)، بە زیاد بوونی پێنج (٥).

| ئەصڵی مەسئەلە | | ١٢ ← + ٥ | ١٧ |
|---|---|---|---|
| ژنێك | چواریەك | ٣ | ٣ |
| دایك | شەش یەك | ٢ | ٢ |
| دوو خوشکی دایك و باوکی | دووسێیەك | ٧ (؟) | ٨ |
| دوو برای دایکی | سێیەك | ٠ (؟) | ٤ |

نمونەیەکی تر: پیاوێك مردوە: سێ (٣) ژن، و دوو (٢) نەنك، و هەشت (٨) خوشکی باوکی، و چوار (٤) خوشکی دایکی لەپاش بەجێ ماوە.

ئێستا ئەصڵی مەسئەلەکە دوازدە (١٢) یە، چونکە، ژنەکان چوار یەك دەبەن — کە دەکاتە سێ (٣) بەش --، و نەنکەکانیش شەش یەك دەبەن — کە دەکاتە دوو (٢) بەش، و خوشکە باوکیەکانیش دوو سێ یەك دەبەن — کە دەکاتە هەشت (٨) بەش --، و خوشکە دایکیەکانیش سێ یەك دەبەن — کە دەکاتە چوار (٤) بەش --، ئێستا (٣ + ٢ + ٨ + ٤ = ١٧) بە زیاد بوونی پێنج (٥). جا وەك دەبینین: هەر یەك لەو ئافرەتانە یەك (١) بەشی دەکەوێت. جا بزانە کە ئەم مەسئەلەیە پێی دەوترێت: أم الأرامل، چونکە بێوەژنێکی زۆری تێدایە، وە پێشی دەوترێت: (الدینارية الصغرى)، چونکە هەریەکە لە ئافرەتەکان تەنها یەك دیناری دەکەوێت. وە پێشی دەوترێت: أم الفروج، چونکە هەموو میرات بەرەکان تیایدا مێیینەن.[1]

١) مغني ابن قدامة٧ /٣٥، التحفة مع الشرواني ٤٣٢، النهاية ٣٦، المغني ٣٣، الفقه الإسلامي٧٨٠٩، الكنوز ٢٣٦، الأنوار ٣ / ٢٤٣.

| ئەصڵی مەسئەلە | | ١٢ ← + ٥ | ١٧ |
| --- | --- | --- | --- |
| سێ ژن | چوار یەك | ٣ | ٣ |
| دوو نەنك (داپیرە) | شەش یەك | ٢ | ٢ |
| هەشت خوشكی دایك و باوكی | دووسێیەك | ٧ (؟) | ٨ |
| چوار خوشكی دایكی | سێیەك | ٠ (٤) | ٤ |

## زیاد كردن لە (بیست و چوار) دا

بیست و چوار (٢٤): زیاد دەكرێت تەنها بۆ بیست و حەوت (٢٧):
وەكو مەسئەلەی: دوو كچ، و دایك، و باوك، و ژن. ئێستا ئەصڵی مەسئەلەكەیان لە بیست و چوارە (٢٤)، چونكە دوو سێ یەكی دوو كچەكە دەیبەن – كە دەكاتە شازدە (١٦) بەش، و دایكەكەش شەش یەك دەبات – كە دەكاتە چوار (٤) بەش، و باوكەكەش شەش یەك دەبات – كە دەكاتە چوار (٤) بەش، و ژنەكەش هەشت یەك دەبات – كە دەكاتە سێ (٣) بەش، ئێستا (١٦ + ٤ + ٤ + ٣ = ٢٧)، بە زیاد بوونی سێ (٣).

جا بزانە كە: ئەم مەسئەلەیە پێی دەوترێت: (البخيلة)، بەهۆی ئەوەوە كە كەم عەولی تێدا دەكرێت، یان یەك جار عەولی تێدا دەكرێت. هەروەها پێشی دەوترێت: (المنبرية) [1]. لە باسی كۆرپەدا هۆی ناونانەكەی بەم ناوە ڕوون دەكەینەوە.

١) التحفة ٦ / ٤٣٢، المغني ٣ / ٢١، منار السبيل ٢ / ٥٤، شرح منتهى الإرادات ٢ / ٥١٩، الدرة ١٠٦، الفقه الإسلامي ٧٨٠٥، ٧٨٢٤، الكنوز ٢٣٦.

| ئەصڵی مەسئەلە | | ٢٤ ← + ٣ | ٢٧ |
|---|---|---|---|
| دوو کچ | دووسێیەك | ١٦ | ١٦ |
| دایك | شەش یەك | ٤ | ٤ |
| باوك | شەش یەك | ٤ | ٤ |
| ئەك ژن | هەشت یەك | ٠ (؟) | ٣ |

لە بارەی ئەو سێ ئەصڵی مەسئەلانەی کە عەولیان تێدا دەکرێت، ئیمامی رەحەبی دەفەرموێت:

فهذه الثلاثة الأصول        إن كثرت فروعها تعول
فتبلغ الستة عقد العشرة        في صورة معروفة مشتهرة
وتلحق التي تليها بالأثر        في العول إفرادا إلى سبع عشر
والعدد الثالث قد يعول        بثمنها، فاعمل بما أقول

# باسی ساغ کردنەوەی مەسئەلەکان (تصحیح المسائل)

پاش ئەوەی کە زانیمان ئەصڵی مەسئەلەکان چۆن دروست دەکرێن، ئەوجا دێینە سەر ئەوەی کە بزانین: ئایا میرات بەرەکان ئەو بەشەی کە لە میراتەکە دەیانکەوێت، بەبێ شکانەوە، و بە ساغی دابەش دەکرێت بەسەریاندا، ئەو کاتە مەسئەلەکە خۆی ساغە و پێویستی بە هیچ نیە.

بۆ نمونە: ئەگەر ژنێك بمرێت: مێرد و سێ کوڕی لە پاش بەجێ بهێڵێت. ئەوا مێردەکە چواریەك دەبات، و سێ بەشیشی دەمێنێتەوە بۆ سێ کوڕەکە و بە ساغی دابەش دەکرێت بە سەریاندا.

نمونەیەکی تر: ئەگەر پیاوێك بمرێت: ژنێك، و حەوت کوڕی لە پاش بەجێ بهێڵێت. ئەوا ژنەکە هەشت یەك دەبات، و حەوت بەشیشی دەمێنێتەوە بۆ حەوت کوڕەکە و بە ساغی دابەش دەکرێت بە سەریاندا.

نمونەیەکی تر: ئەگەر پیاوێك بمرێت: ژنێك، و سێ کوڕ و کچێکی لە پاش بەجێ بهێڵێت. ئەوا ژنەکە هەشت یەك دەبات، و حەوت بەشیشی دەمێنێتەوە بۆ سێ کوڕ و یەك کچەکە، ئەمانیش بە پێی یاسای (للذکر مثل حظ الأنثیین) ژمارەیان دەبێت بە حەوت، کەواتە ئەوەی کە دەمێنێتەوە بە ساغی دابەش دەکرێت بە سەریاندا.

بەڵام ئەگەر وەها ڕێك کەوت کە بەشی هەندێك لە میرات بەرەکان لە ئەصڵی مەسئەلەکە بە ساغی و بەبێ کەرت دابەش نەدەکرا بە سەریاندا، ئەوا پێویست دەکات کە ئەصڵی مەسئەلەکە بە جۆرێك زیاد بکرێت _ نەك بەو زیاد کردنەی کە لە باسی عەول دا باسمان لێوە کرد _ کە بەبێ شکانەوە و بەبێ کەرت و بە ساغی دابەش بکرێت بەسەر هەموو میرات بەرەکاندا، و هەرکەسەو بەشی خۆی

بە ساغی بەربکەوێت، جا بەم کارەش دەوترێت: ساغ کردنەوەی مەسئەلەکان (تصحيح المسائل)

کەواتە: ساغ کردنەوەی مەسئەلەکان بریتییە لە: لێکدانی ئەصڵی مەسئەلەیەك _ بە عەول یان بەبێ عەول _ لە کەمترین ژمارە تاوەکو وەهای لێبێت کە بە ساغی و بەبێ کەرتکردن دابەش ببێت بەسەر میرات بەرەکاندا، و هەرکەسەو بەشی خۆی بە ساغی بەربکەوێت.

ئەوجا ئەم ساغ کردنەوەش بە پێی چەند یاسایەك دەبێت، کە پەیوەندی بە نیسبەتی نێوان ژمارەکانەوە هەیە، هەروەها ئەم ساغ کردنەوەش لە مەسئەلەیەکەوە بۆ مەسئەلەیەکی تر دەگۆڕێت، بەپێی ئەوەی کە: ئایا ئەو میرات بەرانەی کە بەشەکەیان بە ساغی دابەش ناکرێت بە سەریاندا یەك کۆمەڵن، یان زیاتر. بۆیە ئێمەش ئەم باسە دەکەین بە دوو بەشەوە.

(١) حاڵەتێك کە بەشی یەك کۆمەڵ میرات بەر بەساغی دابەش ناکرێت بەسەر ژمارەیاندا.

(٢) حاڵەتێك کە بەشی زیاد لە یەك کۆمەڵ میرات بەر بەساغی دابەش ناکرێت بەسەر ژمارەیاندا.

## حاڵەتی یەکەم

ئەو حاڵەتەیە کە بەشی یەك کۆمەڵە میرات بەر بەساغی دابەش ناکرێت بەسەر ژمارەی میرات بەرانی هەمان کۆمەڵەدا.

لەم حاڵەتەدا تەماشای نیسبەتی نێوان بەشی میرات بەرەکانی کۆمەڵەکە لەگەڵ ژمارەی میرات بەرەکانی ئەو کۆمەڵەیە دەکەین:

(١)ئەگەر نیسبەتی نێوان بەشی میرات بەرەکان لەگەڵ ژمارەی میرات بەرەکاندا (توافق) بوو، ئەوا (وفق)ی ژمارەی میرات بەرەکان وەردەگرین، و

لێکدانی ئەصڵی مەسئەلەکەی دەکەین، بەمەش ژمارەکە بوو بە چەند، ئەو ژمارەیە دەبێت بە ئەصڵی مەسئەلەکە، و بە ساغی دابەش دەکرێت بە سەریاندا.

بۆ نمونە: کەسێك مردوە: دایك و چوار مامی لەپاش بەجێ ماوە.

سەرەتا دەڵێین: دایکەکە سێیەك دەبات، و مامەکانیش عەصەبەن، کەواتە ئەصڵی مەسئەلەکە بریتیە لە سێ (٣).

جا ئێستا دایکەکە یەك بەش دەبات، و مامەکانیش دوو بەشیان بۆ دەمێنێتەوە.

وەك دەبینین: لە نێوان بەشی مامەکان کە دوو بەشە، و ژمارەی مامەکان کە چوار مامن، (توافق) ی نیوە هەیە، بۆیە دێین (وفق) ی ژمارەی مامەکان وەردەگرین کە دەکاتە دوو، وە ئەم دووە لێکدانی ئەصڵی مەسئەلەکە دەکەین، بەمەش ئەصڵی مەسئەلەکە دەبێت بە شەش (٦).

ئێستا دووبارە مەسئەلەکە دروست دەکەینەوە:

دایکەکە دوو بەش دەبات، و چوار بەشیش دەمێنێتەوە بۆ چوار مامەکە. بەمەش بەشی مامەکان بە ساغی و بەبێ شکانەوە دابەش دەکرێت بە سەریاندا. (٤ ÷ ٤ = ١).

| | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ئەصڵی مەسئەلە | | | ٣ | | ٢ × ٣ | ٦ | ٦ |
| دایك | | سێیەك | ١ | | | ٢ | ٢ |
| مام | چوار مام | عەصەبە | ٢ | ٢ ÷ ٤ =؟ | ٢، ٤ توافق<br>٢ ÷ ٢ = ١<br>٤ ÷ ٢ = ٢ | ٤ | ١ |
| مام | | | | | | | ١ |
| مام | | | | | | | ١ |
| مام | | | | | | | ١ |

نمونەیەکی تر: کەسێك مردوە: دایك، و باوك، و دە کچی لەپاش بەجێ ماوە.
سەرەتا دەڵێین: هەریەك لە دایك و باوکەکە شەش یەك دەبەن، و کچەکانیش دووسێیەك دەبەن، کەواتە ئەصڵی مەسئەلەکە بریتیە لە شەش (٦).
جا ئێستا: دایکەکە یەك بەش دەبات، و باوکەکەش یەك بەش دەبات، و کچەکانیش چواربەش دەبەن.
وەك دەبینین: لە نێوان بەشی کچەکان کە چوار بەشە، و ژمارەی کچەکان کە دە کچە، (توافق)ی نیوەیی هەیە، بۆیە دێین (وفق)ی ژمارەی کچەکان وەردەگرین کە دەکاتە پێنج، و ئەم پێنجەش لێکدانی ئەصڵی مەسئەلەکە دەکەین، بەمەش ئەصڵی مەسئەلەکە دەبێت بە سی (٣٠).
ئێستا دووبارە مەسئەلەکە دروست دەکەینەوە: دایکەکە پێنج بەش دەبات، و باوکەکەش پێنج بەش دەبات، و کچەکانیش بیست بەش دەبەن.
بەمەش بەشی کچەکان بە ساغی دابەش دەکرێت بەسەریاندا. (٢٠÷١٠=٢).

| | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ئەصڵی مەسئەلە | | | ٦ | ٦ ← × ٥ | ٣٠ | |
| دایك | | شەش یەك | ١ | | ٥ | |
| باوك | | شەش یەك | ١ | | ٥ | |
| کچ | دە کچ | دووسێیەك | ٤ ÷ ١٠ =؟ | ٤ ÷ ٢ = ٢<br>١٠ ÷ ٢ = ٥ | ٢٠ | ٢ |
| کچ | | | | | | ٢ |
| کچ | | | | | | ٢ |
| کچ | | | | | | ٢ |
| کچ | | | | | | ٢ |
| کچ | | | | | | ٢ |
| کچ | | | | | | ٢ |
| کچ | | | | | | ٢ |
| کچ | | | | | | ٢ |
| کچ | | | | | | ٢ |

(٢)ئەگەر نیسبەتی نێوان بەشی میرات بەرەکان لەگەڵ ژمارەی میرات بەرەکاندا (تباین) بوو، ئەوا ژمارەی میرات بەرەکان لێکدانی ئەصڵی مەسئەلەکە دەکەین، بەمەش ژمارەکە بوو بە چەند، ئەو ژمارەیە دەبێت بە ئەصڵی مەسئەلەکە، و بە ساغی دابەش دەکرێت بە سەریاندا.

بۆ نمونە: پیاوێك مردوە: ژنێك، و دوو برای باوکی لەپاش بەجێ ماوە.

سەرەتا دەڵێین: ژنەکە چواریەك دەبات، و براکانیش عەصەبەن. کەواتە ئەصڵی مەسئەلەکە بریتیە لە چوار.

جا ئێستا ژنەکە یەك بەش دەبات، و سێ بەشیش دەمێنێتەوە بۆ براکان.

وەك دەبینین: لە نێوان بەشی براکان، و ژمارەی براکاندا (تباین) هەیە، بۆیە ژمارەی براکان لێکدانی ئەصڵی مەسئەلەکە دەکەین، بەمەش ئەصڵی مەسئەلەکە دەبێت بە هەشت (٨).

ئێستا دووبارە مەسئەلەکە دروست دەکەینەوە: ژنەکە دوو بەش دەبات، و شەش بەشیش دەمێنێتەوە بۆ دوو براکە.

بەمەش بەشی برا باوکییەکان بەساغی دابەش دەکرێت بە سەریاندا (٦ ÷ ٢ = ٣).

| | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ئەصڵی مەسئەلە | | | ٤ | | ٢ × ٤ | ٨ | ٨ |
| ژن | | چواریەك | ١ | | | ٢ | ٢ |
| برای باوکی | دوو برای باوکی | عەصەبە | ٣ | ٣ ÷ ٢ =؟ | ٣، ٢ | ٦ | ٣ |
| برای باوکی | | | | | تباین | | ٣ |

نمونەیەکی تر: ژنێك مردوە: مێرد، و یەك داپیرە، و سێ برای دایکی لەپاش بەجێ ماوە.

سەرەتا دەڵێین: مێردەکە نیوە دەبات، داپیرەکەش شەش یەك دەبات، و برا دایکییەکانیش سێیەك دەبەن. کەواتە ئەصڵی مەسئەلەکە بریتیە لە شەش (٦).

جا ئێستا مێردەکە سێ بەش دەبات، و داپیرەکەش یەك بەش دەبات، و برا دایکییەکانیش دوو بەش دەبەن.

وەك دەبینین: لە نێوان بەشی برا دایکییەکان و ژمارەی برا دایکییەکاندا (تباین) هەیە، بۆیە ژمارەی برا دایکییەکان لێکدانی ئەصڵی مەسئەلەکە دەکەین، بەمەش ئەصڵی مەسئەلەکە دەبێت بە هەژدە (١٨).

ئێستا دووبارە مەسئەلەکە دروست دەکەینەوە: مێردەکە نۆ بەش دەبات، و داپیرەکەش سێ بەش دەبات، برا دایکییەکانیش شەش بەش دەبەن.

بەمەش بەشی برا دایکییەکان بەساغی دابەش دەکرێت بە سەریاندا (٦ ÷ ٣ = ٢).

| | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ئەصڵی مەسئەلە | | | ٦ | ٦ × ٣ | | ١٨ | |
| مێرد | | نیوە | ٣ | | | ٩ | |
| یەك داپیرە | | شەش یەك | ١ | | | ٣ | |
| برای دایکی | سێ برای دایکی | سێیەك | ٢ | ٢ ÷ ٣ =؟ | تباین | ٦ | ٢ |
| برای دایکی | | | | | | | ٢ |
| برای دایکی | | | | | | | ٢ |

ئەوجا بزانە کە نیسبەتی نێوان بەشی میرات بەرەکان، لەگەڵ ژمارەیان، تەنها ئەو دوو ئەگەرەی سەرەوەی هەیە و بەس، ئەگەرچی وەك باسمان کرد نیسبەتی نێوان ژمارەکان چوار جۆرە، چونکە ئەگەر نیسبەتەکە (تماثل) بوو، ئەوا

بەشە میراتەکە بەساغی و بەبێ شکانەوە دابەش دەبێت بەسەر ژمارەی میرات بەرەکاندا، وە ئەگەر نیسبەتی نێوانیشیان تداخل بێت، ئەوا ئەگەر ژمارەی میرات بەرەکان ژمارە بچوکەکە بوو، ئەوا بە هەمان شێوە بەشە میراتەکە دابەش دەکرێت بەسەریاندا بەساغی و بەبێ شکانەوە، بەلاّم ئەگەر بەشە میراتەکە ژمارە بچوکەکە بێت، ئەوا ئەگەرچی پێی دەوترێت (تداخل)، بەلاّم لە هەمان کاتیشدا بە (توافق) دادەنرێت، چونکە وەك باسمان کرد: هەموو (تداخل) ێك بە (توافق) دادەنرێت، بەلاّم هەموو (توافق) ێك بە (تداخل) دانانرێت، کەواتە لەم حالّەتەشدا هەر بەر (توافق) دەکەوێت، بۆیە وتمان نیسبەتی نێوان بەشە میراتەکە لەگەلّ ژمارەی میرات بەرەکان تەنها یان (توافق) ە، یان (تباین) ە.[1]

## حالّەتی دوەم

ئەو حالّەتەیە کە بەشی زیاد لە یەك کۆمەلّ میرات بەر بەساغی دابەش ناکرێت بەسەر ژمارەی میرات بەرەکانیاندا.

لەم حالّەتەشدا، بە هەمان شێوەی حالّەتی یەکەم سەرەتا تەماشای نیسبەتی نێوان بەشی هەر کۆمەلّە میرات بەرێك و ژمارەی میرات بەرانی ئەو کۆمەلّە دەکەین، بۆیە دەکرێت بلّێین: سێ شێوەمان هەیە:

(١)نیسبەتی نێوان بەشە میراتی هەردوو کۆمەلّەکە لەگەلّ ژمارەی میرات بەرانی خۆیاندا بریتیە لە (توافق).

(٢)نیسبەتی نێوان بەشە میراتی هەردوو کۆمەلّەکە لەگەلّ ژمارەی میرات بەرانی خۆیاندا بریتیە لە (تباین).

(٣)نیسبەتی نێوان بەشە میراتی کۆمەلّەیەکیان لەگەلّ ژمارەی میرات بەرەکانی هەمان کۆمەلّەدا بریتیە لە (توافق)، بەلاّم نیسبەتی نێوان بەشە میراتی

---

١) الشروانی ٤٣٣، الجمل ٦ / ١١٢، البجیرمي ٣ / ٢٦٤، اللمع ١٣٨، ابن آدم١٣٠.

کۆمەڵەکەی تر لەگەڵ ژمارەی میرات بەرانی کۆمەڵەکەی خۆیدا بریتیە لە (تباین).

جا هەرکاتێك نیسبەتەکە (توافق) بوو، ئەوا ژمارەی میرات بەرەکان دەگێڕینەوە بۆ (وفق) ەکەی. بەڵام ئەگەر نیسبەتەکە (تباین) بوو، ئەوا دەست لە هیچ نادەین، و وەك خۆی دەیهێڵینەوە.

ئەوجا پاش ئەوەی کە لە شێوەی (توافق) ەکەدا گەڕاندمانەوە بۆ (وفق)، و لە شێوەی (تباین)ەکەشدا وەك خۆی هێشتمانەوە، ئیتر تەماشای نیسبەتی نێوان ژمارەی میرات بەرانی کۆمەڵەی یەکەم، و ژمارەی میرات بەرانی کۆمەڵەی دوەم دەکەین، کە ئەویش خۆی لە چوار شێوەدا دەبینێتەوە.

(١) نیسبەتی نێوان ژمارەی هەردوو کۆمەڵەکە (تماثل) ە.

(٢) نیسبەتی نێوان ژمارەی هەردوو کۆمەڵەکە (تداخل) ە.

(٣) نیسبەتی نێوان ژمارەی هەردوو کۆمەڵەکە (توافق) ە.

(٤) نیسبەتی نێوان ژمارەی هەردوو کۆمەڵەکە (تباین) ە.

ئەوجا لە شێوەی یەکەمدا (تماثل)، یەکێك لە دوو ژمارەکە وەردەگرین، و لێکدانی ئەصڵی مەسئەلەکەی دەکەین، گەیشت بە چەند، ئەو ژمارەیە دەبێت بە ئەصڵی مەسئەلەکە، و مەسئەلەکەش لەو ژمارەیەدا دروست و ساغە.

وە لە شێوەی دوەمدا (تداخل) ژمارەی کام کۆمەڵە میرات بەریان ژمارە زۆرەکە بوو، ئەو ژمارەیە وەردەگرین، و لێکدانی ئەصڵی مەسئەلەکەی دەکەین، گەیشت بە چەند، ئەو ژمارەیە دەبێت بە ئەصڵی مەسئەلەکە، و مەسئەلەکەش لەو ژمارەیەدا دروست و ساغە.

وە لە شێوەی سێیەمدا (توافق)، (وفق) ی یەکێك لە دوو ژمارەکە وەردەگرین، و لێکدانی تەواوی ژمارەی دوەمی دەکین، ژمارەیەکمان دەست دەکەوێت، ئەو ژمارەیە لێکدانی ئەصڵی مەسئەلەکەی دەکەین، گەیشت بە

چەند، ئەو ژمارەیە دەبێت بە ئەصڵی مەسئەلەکە، و مەسئەلەکەش لەو ژمارەیەدا دروست و ساغە.

وە لە شێوەی چوارەمدا (تباين)، هەردوو ژمارەکە لێکدانی یەك دەکەین، و ژمارەیەکی ترمان دەست دەکەوێت، ئەو ژمارەیە لێکدانی ئەصڵی مەسئەلەکەی دەکەین، گەیشت بە چەند، ئەو ژمارەیە دەبێت بە ئەصڵی مەسئەلەکە، و مەسئەلەکەش لەو ژمارەیەدا دروست و ساغە.

شێخی نۆدی لەم بارەیەوە دەفەرموێت:

وإن على صنفين منها تنكسر فعمل التصحيح ليس بعسر
إذ قوبلت سهام كلّ بعدد رؤوسه، فإن توافقا يردّ
عدده لوفقه، و إلاّ فإنها بحاله يخلّى
فالعددان من كلا الصنفين متى يكونا متماثلين
ضربت منهما تمام العدد في أصلها بعولها، إن يوجد
و إن تداخلا ضربت الأكثرا في ذلك الأصل بعول قد جرى
و إن توافقا بجزء، فاعمد لضرب وفق عدد في عدد
مع ضربك الحاصل في ذا الأصل مع عولها عند وجود العول
و إن يكونا متباينين فاضرب تمام عدد من ذين
في العدد الآخر و اضرب ما حصل في الأصل بالعول، فأينما وصل
فمنه قد صحّت، ولا كسر معه كذا على ثلاثة، و أربعة

جا بۆ ئەوەی کە بزانیت بەشی هەر کۆمەڵە میرات بەرێك دەبێت بە چەند، ئەوا بەشەکەی لە ئەصڵی مەسئەلەکەدا لێکدانی ئەو ژمارە کۆتاییە بکە کە لێکدانی ئەصڵی مەسئەلەکەت کردوە لە سەرەتاوە، ئەو ژمارەیەش پێی دەوترێت (جزء السهم)، ئیتر بەشی هەر کۆمەڵە میرات بەرێکت بە ساغی بۆ دەردەکەوێت. وەك شێخی نۆدی دەفەرموێت:

وكلّ صنف تعرف النصيب له من عدد قد بلغته المسألة
بضرب حصة له يحويها من أصلها فيما ضربت فيها
فالمنتهی نصيبه المعلوم و هو علی عدده المقسوم

کەواتە دەکرێت بڵێین: شێوەکانی حاڵەتی دوەم ژمارەیان دوازدە (١٢) شێوەیە، کە لە ئەنجامی لێکدانی سێ شێوەی یەکەم لە چوار شێوەی دوەم پەیدا دەبێت.

جا بزانە کە ئەم دوازدە شێوەمان هەیە بۆ ئەو مەسئەلانەی کە پێویستیان بە (عول) نیە، و هەروەها بۆ ئەو مەسئەلانەش کە پێویستیان بە (عول) هەیە.

ئێستا دەچینە سەر هەریەکە لەو دوازدە شێوەیە بە نمونەوە:

## شێوەی یەکەم

نیسبەتی نێوان بەشە میراتی هەردوو کۆمەڵەکە لەگەڵ ژمارەی میرات بەرانی خۆیاندا بریتیە لە(توافق)، و پاشان نیسبەتی نێوان ژمارەی دوو کۆمەڵەکە بریتیە لە (تماثل).

بۆ نمونە: کەسێك مردوە: دایك، و شەش برای دایکی، و دوازدە خوشکی باوکی لەپاش بەجێ ماوە.

سەرەتا دەڵێین: دایکەکە شەش یەك دەبات، و برا دایکییەکانیش سێیەك دەبەن، و خوشکە باوکییەکانیش دووسێیەك دەبەن، کەواتە ئەصڵی مەسئەلەکە بریتیە لە شەش (٦).

جا ئێستا، دایکەکە یەك بەش دەبات، و برا دایکییەکانیش دوو بەش دەبەن، و خوشکە باوکییەکانیش چوار بەشیان دەکەوێت، بەلأم لەبەر ئەوەی کە تەنها سێ بەش ماوە، و بەشی خوشکەکان تەواو ناکات، بۆیە مەسئەلەکە (عول)

ی تێدادەکەین بۆ حەوت (٧)، ئیتر خوشکە باوکییەکانیش بە تەواوەتی بەشی خۆیان دەبەن.

بەڵام ئێستا وەك دەبینین: نە بەشی براکان بە ساغی دابەش دەکرێت بەسەر ژمارەیاندا، و نە بەشی خوشکەکانیش بە ساغی دابەش دەکرێت بە سەریاندا، وە لە هەمان کاتدا لە نێوان بەشی براکان، و ژمارەیان (توافق) هەیە، وە لە نێوان بەشی خوشکەکان و ژمارەی ئەوانیشدا هەر (توافق) هەیە، بۆیە سەرەتا (وفق) ی ژمارەکانیان وەر دەگرین بەم شێوەیە: براکان (٦)، و بەشەکەیان (٢)، و خوشکەکان (١٢)، و بەشەکەیان (٤).

ئێستا (وفق) ی ژمارەی براکان دەکاتە (٣)، وە (وفق) ی ژمارەی خوشکەکانیش هەر دەکاتە (٣).

جا وەك دەبینین: ئێستا هەردوو ژمارەکە بوون بە (٣)، وە نیسبەتی نێوانیشیان بریتیە لە (تماثل)، بۆیە یەکێکیان وەردەگرین، و لێکدانی ئەصڵی مەسئەلە (عول) تێداکراوەکەی دەکەین، و دەبێت بە بیست و یەك (٢١). جا ئێستا دووبارە مەسئەلەکە دروست دەکەینەوە.

دایکەکە سێ بەش دەبات، و برا دایکییەکانیش شەش بەش دەبەن، و خوشکە باوکییەکانیش دوازدە بەش دەبەن. بەمەش هەم بەشی برا دایکییەکان، و هەم بەشی خوشکە باوکییەکانیش بە ساغی دابەش دەبێت بە سەریاندا.

## خشتەی شێوەی یەکەم

| | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ئەصڵی مەسئەلە | | | ٦ + ١ | ٧ × ٣ | | ٢١ | ٢١ |
| دایك | | شەش یەك | ١ | ١ | | ٣ | ٣ |
| برای دایکی | شەش برای دایکی | سێیەك | ٢ | ٢ | ٣، ٦ توافق ٦ ÷ ٢ = ٣ | ٦ | ١ |
| برای دایکی | | | | | | | ١ |
| برای دایکی | | | | | | | ١ |
| برای دایکی | | | | | | | ١ |
| برای دایکی | | | | | | | ١ |
| برای دایکی | | | | | | | ١ |
| خوشکی باوکی | دوازدە خوشکی باوکی | دوو سێیەك | ٣؟ | ٤ | ٤، ١٢ توافق ١٢ ÷ ٤ = ٣ | ١٢ | ١ |
| خوشکی باوکی | | | | | | | ١ |
| خوشکی باوکی | | | | | | | ١ |
| خوشکی باوکی | | | | | | | ١ |
| خوشکی باوکی | | | | | | | ١ |
| خوشکی باوکی | | | | | | | ١ |
| خوشکی باوکی | | | | | | | ١ |
| خوشکی باوکی | | | | | | | ١ |
| خوشکی باوکی | | | | | | | ١ |
| خوشکی باوکی | | | | | | | ١ |
| خوشکی باوکی | | | | | | | ١ |
| خوشکی باوکی | | | | | | | ١ |

## شێوەی دووەم

نیسبەتی نێوان بەشە میراتی هەردوو کۆمەڵەکە لەگەڵ ژمارەی میرات بەرانی خۆیاندا بریتیە لە(توافق)، و پاشان نیسبەتی نێوان ژمارەی دوو کۆمەڵەکە بریتیە لە (تداخل).

بۆ نمونە: کەسێك مردوە: دایك، و هەشت برای دایکی، و هەشت خوشکی باوکی لەپاش بەجێ ماوە.

سەرەتا دەڵێین: دایکەکە شەش یەك دەبات، و برا دایکیەکانیش سێیەك دەبەن، و خوشکە باوکیەکانیش دووسێیەك دەبەن، کەواتە ئەصڵی مەسئەلەکە بریتیە لە شەش (٦).

جا ئێستا، دایکەکە یەك بەش دەبات، و برا دایکیەکانیش دوو بەش دەبەن، و خوشکە باوکیەکانیش چوار بەشیان دەکەوێت، بەڵام لەبەر ئەوەی کە تەنها سێ بەش ماوە، و بەشی خوشکەکان تەواو ناکات، بۆیە مەسئەلەکە (عول) ی تێدادەکەین بۆ حەوت (٧)، ئیتر خوشکە باوکیەکانیش بە تەواوەتی بەشی خۆیان دەبەن.

بەڵام ئێستا وەك دەبینین: نە بەشی براکان بە ساغی دابەش دەکرێت بەسەر ژمارەیاندا، و نە بەشی خوشکەکانیش بە ساغی دابەش دەکرێت بە سەریاندا، وە لە هەمان کاتدا لە نێوان بەشی براکان، و ژمارەیان (توافق) هەیە، وە لە نێوان بەشی خوشکەکان و ژمارەی ئەوانیشدا هەر (توافق) هەیە، بۆیە سەرەتا (وفق) ی ژمارەکانیان وەر دەگرین بەم شێوەیە: براکان (٨)، و بەشەکەیان (٢)، و خوشکەکان (٨)، و بەشەکەیان (٤).

ئێستا (وفق) ی ژمارەی براکان دەکاتە (٢)، وە (وفق) ی ژمارەی خوشکەکانیش دەکاتە (٤).

جا وەك دەبینین: نیسبەتی نێوان هەردوو (وفق) ەکە بریتیە لە (تداخل)، بۆیە زۆرەکەیان وەردەگرین، و لێکدانی ئەصڵی مەسئەلە (عول) تێداکراوەکەی دەکەین، و دەبێت بە بیست و هەشت (٢٨). جا ئێستا دووبارە مەسئەلەکە دروست دەکەینەوە.

دایکەکە چوار بەش دەبات، و برا دایکیەکانیش هەشت بەش دەبەن، و خوشکە باوکیەکانیش شازدە بەش دەبەن. بەمەش هەم بەشی برا دایکیەکان، و هەم بەشی خوشکە باوکیەکانیش بە ساغی دابەش دەبێت بە سەریاندا.

خشتەی شێوەی دووەم

| ئەصڵی مەسئەلە | | | ١+٦ | ٤ × ٧ | | ٢٨ | ٢٨ |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| دایك | | شەش یەك | ١ | ١ | | ٤ | ٤ |
| برای دایکی | هەشت برای دایکی | سێیەك | ٢ | ٢ | ٢، ٨ توافق<br>٨ ÷ ٢ = ٤ | ٨ | ١ |
| برای دایکی | | | | | | | ١ |
| برای دایکی | | | | | | | ١ |
| برای دایکی | | | | | | | ١ |
| برای دایکی | | | | | | | ١ |
| برای دایکی | | | | | | | ١ |
| برای دایکی | | | | | | | ١ |
| برای دایکی | | | | | | | ١ |
| خوشکی باوکی | هەشت خوشکی باوکی | دووسێیەك | ٣؟ | ٤ | ٤، ٨ توافق<br>٨ ÷ ٤ = ٢ | ١٦ | ٢ |
| خوشکی باوکی | | | | | | | ٢ |
| خوشکی باوکی | | | | | | | ٢ |
| خوشکی باوکی | | | | | | | ٢ |
| خوشکی باوکی | | | | | | | ٢ |
| خوشکی باوکی | | | | | | | ٢ |
| خوشکی باوکی | | | | | | | ٢ |
| خوشکی باوکی | | | | | | | ٢ |

## شێوەی سێیەم

نیسبەتی نێوان بەشە میراتی هەردوو کۆمەڵەکە لەگەڵ ژمارەی میرات بەرانی خۆیاندا بریتیە لە(توافق)، و پاشان نیسبەتی نێوان ژمارەی دوو کۆمەڵەکە بریتیە لە (توافق).

بۆ نمونە: کەسێك مردوە: دایك، و دوازدە برای دایکی، و شازدە خوشکی باوکی لەپاش بەجێ ماوە.

سەرەتا دەڵێین: دایکەکە شەش یەك دەبات، و برا دایکیەکانیش سێیەك دەبەن، و خوشکە باوکیەکانیش دووسێیەك دەبەن، کەواتە ئەصڵی مەسئەلەکە بریتیە لە شەش (٦).

جا ئێستا، دایکەکە یەك بەش دەبات، و برا دایکیەکانیش دوو بەش دەبەن، و خوشکە باوکیەکانیش چوار بەشیان دەکەوێت، بەلاّم لەبەر ئەوەی کە تەنها سێ بەش ماوە، و بەشی خوشکەکان تەواو ناکات، بۆیە مەسئەلەکە (عول)ی تێدادەکەین بۆ حەوت (٧)، ئیتر خوشکە باوکیەکانیش بە تەواوەتی بەشی خۆیان دەبەن.

بەلاّم ئێستا وەك دەبینین: نە بەشی براکان بە ساغی دابەش دەکرێت بەسەر ژمارەیاندا، و نە بەشی خوشکەکانیش بە ساغی دابەش دەکرێت بە سەریاندا، وە لە هەمان کاتدا لە نێوان بەشی براکان، و ژمارەیان (توافق) هەیە، وە لە نێوان بەشی خوشکەکان و ژمارەی ئەوانیشدا هەر (توافق) هەیە، بۆیە سەرەتا (وفق) ی ژمارەکانیان وەر دەگرین بەم شێوەیە: براکان (١٢)، و بەشەکەیان (٢)، و خوشکەکان (١٦)، و بەشەکەیان (٤).

ئێستا (وفق)ی ژمارەی براکان دەکاتە (٦)، وە (وفق)ی ژمارەی خوشکەکانیش دەکاتە (٤).

جا وەك دەبینین: نیسبەتی نێوان هەردوو (وفق) ەکە بریتیە لە (توافق)، بۆیە (وفق) ی یەکێکیان وەردەگرین، و لێکدانی تەواوی ئەوی تری دەکەین، بەمەش ژمارەیەك پەیدا دەبێت کە بریتیە لە (١٢)، ئەوجا ئەم ژمارەیە لێکدانی ئەصڵی مەسئەلە (عول) تێداکراوەکەی دەکەین، و دەبێت بە هەشتا و چوار (٨٤). جا ئێستا دووبارە مەسئەلەکە دروست دەکەینەوە.

دایکەکە دوازدە بەش دەبات، و برا دایکیەکانیش بیست و چوار بەش دەبەن، و خوشکە باوکیەکانیش چل و هەشت بەش دەبەن. بەمەش هەم بەشی برا دایکیەکان ، و هەم بەشی خوشکە باوکیەکانیش بە ساغی دابەش دەبێت بە سەریاندا.

## خشتەی شێوەی سێیەم

| ئەصڵی مەسئەلە | | | ٦ + ١ | ٧ × ١٢ | | ٨٤ | ٨٤ |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| دایك | | شەش یەك | ١ | ١ | | ١٢ | ١٢ |
| برای‌دایکی | دوازده | سێیەك | ٢ | ٢ | ٢، ١٢ توافق | ٢٤ | ٢ |
| برای‌دایکی | برای | | | | ١٢ ÷ ٢ =٦ | | ٢ |
| برای‌دایکی | دایکی | | | | | | ٢ |
| برای‌دایکی | | | | | | | ٢ |
| برای‌دایکی | | | | | | | ٢ |
| برای‌دایکی | | | | | | | ٢ |
| برای‌دایکی | | | | | | | ٢ |
| برای‌دایکی | | | | | | | ٢ |
| برای‌دایکی | | | | | | | ٢ |
| برای‌دایکی | | | | | | | ٢ |
| برای‌دایکی | | | | | | | ٢ |
| برای‌دایکی | | | | | | | ٢ |
| خوشکی‌باوکی | شازده | دوو | ٣؟ | ٤ | ٤، ١٦ توافق | ٤٨ | ٣ |
| خوشکی‌باوکی | خوشکی | سێیەك | | | ١٦ ÷ ٤ = | | ٣ |
| خوشکی‌باوکی | باوکی | | | | ٤ | | ٣ |
| خوشکی‌باوکی | | | | | | | ٣ |
| خوشکی‌باوکی | | | | | | | ٣ |
| خوشکی‌باوکی | | | | | | | ٣ |
| خوشکی‌باوکی | | | | | | | ٣ |
| خوشکی‌باوکی | | | | | | | ٣ |
| خوشکی‌باوکی | | | | | | | ٣ |
| خوشکی‌باوکی | | | | | | | ٣ |
| خوشکی‌باوکی | | | | | | | ٣ |
| خوشکی‌باوکی | | | | | | | ٣ |
| خوشکی‌باوکی | | | | | | | ٣ |
| خوشکی‌باوکی | | | | | | | ٣ |
| خوشکی‌باوکی | | | | | | | ٣ |
| خوشکی‌باوکی | | | | | | | ٣ |

## شێوەی چوارەم

نیسبەتی نێوان بەشە میراتی هەردوو کۆمەڵەکە لەگەڵ ژمارەی میرات بەرانی خۆیاندا بریتیە لە(توافق)، و پاشان نیسبەتی نێوان ژمارەی دوو کۆمەڵەکە بریتیە لە (تباین).

بۆ نمونە: کەسێك مردوە: دایك، و شەش برای دایکی، و هەشت خوشکی باوکی لەپاش بەجێ ماوە.

سەرەتا دەڵێین: دایکەکە شەش یەك دەبات، و برا دایکییەکانیش سێیەك دەبەن، و خوشکە باوکییەکانیش دووسێیەك دەبەن، کەواتە ئەصڵی مەسئەلەکە بریتیە لە شەش (٦).

جا ئێستا، دایکەکە یەك بەش دەبات، و برا دایکییەکانیش دوو بەش دەبەن، و خوشکە باوکییەکانیش چوار بەشیان دەکەوێت، بەڵام لەبەر ئەوەی کە تەنها سێ بەش ماوە، و بەشی خوشکەکان تەواو ناکات، بۆیە مەسئەلەکە (عول)ی تێدادەکەین بۆ حەوت (٧)، ئیتر خوشکە باوکییەکانیش بە تەواوەتی بەشی خۆیان دەبەن.

بەڵام ئێستا وەك دەبینین: نە بەشی براکان بە ساغی دابەش دەکرێت بەسەر ژمارەیاندا، و نە بەشی خوشکەکانیش بە ساغی دابەش دەکرێت بە سەریاندا، وە لە هەمان کاتدا لە نێوان بەشی براکان، و ژمارەیان (توافق) هەیە، وە لە نێوان بەشی خوشکەکان و ژمارەی ئەوانیشدا هەر (توافق) هەیە، بۆیە سەرەتا (وفق) ی ژمارەکانیان وەر دەگرین بەم شێوەیە: براکان (٦)، و بەشەکەیان (٢)، و خوشکەکان (٨)، و بەشەکەیان (٤).

ئێستا (وفق) ی ژمارەی براکان دەکاتە (٣)، وە (وفق) ی ژمارەی خوشکەکانیش دەکاتە (٢).

جا وەك دەبینین: نیسبەتی نێوان هەردوو (وفق) ەکە بریتیە لە (تباین)، بۆیە هەردوو (وفق) ەکە لێکدانی یەکتر دەکەین، بەمەش ژمارەیەك پەیدا دەبێت کە بریتیە لە (٦)، ئەوجا ئەم ژمارەیە لێکدانی ئەصڵی مەسئەلە (عول) تێداکراوەکەی دەکەین، و دەبێت بە چل و دوو (٤٢). جا ئێستا دووبارە مەسئەلەکە دروست دەکەینەوە.

دایکەکە شەش بەش دەبات، و برا دایکییەکانیش دوازدە بەش دەبەن، و خوشکە باوکییەکانیش بیست و چوار بەش دەبەن. بەمەش هەم بەشی برا دایکییەکان، و هەم بەشی خوشکە باوکییەکانیش بە ساغی دابەش دەبێت بە سەریاندا.

خشتەی شێوەی چوارەم

| ئەصڵی مەسئەلە | | | ٦ + ١ | ٧ × ٦ | | ٤٢ | ٤٢ |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| دایك | | شەش یەك | ١ | ١ | | ٦ | ٦ |
| برای‌دایکی | شەش برای دایکی | سێیەك | ٢ | ٢ | ٢، ٦ توافق<br>٦ ÷ ٢ = ٣ | ١٢ | ٢ |
| برای‌دایکی | | | | | | | ٢ |
| برای‌دایکی | | | | | | | ٢ |
| برای‌دایکی | | | | | | | ٢ |
| برای‌دایکی | | | | | | | ٢ |
| برای‌دایکی | | | | | | | ٢ |
| خوشکی‌باوکی | هەشت خوشکی باوکی | دووسێیەك | ٣؟ | ٤ | ٤، ٨ توافق<br>٨ ÷ ٤ = ٢ | ٢٤ | ٣ |
| خوشکی‌باوکی | | | | | | | ٣ |
| خوشکی‌باوکی | | | | | | | ٣ |
| خوشکی‌باوکی | | | | | | | ٣ |
| خوشکی‌باوکی | | | | | | | ٣ |
| خوشکی‌باوکی | | | | | | | ٣ |
| خوشکی‌باوکی | | | | | | | ٣ |
| خوشکی‌باوکی | | | | | | | ٣ |

## شێوەی پێنجەم

نیسبەتی نێوان بەشە میراتی هەردوو کۆمەڵەکە لەگەڵ ژمارەی میرات بەرانی خۆیاندا بریتیە لە(تباين)، و پاشان نیسبەتی نێوان ژمارەی دوو کۆمەڵەکە بریتیە لە (تماثل).

بۆ نمونە: کەسێك مردوە: سێ کچ، و سێ برای باوکی لەپاش بەجێ ماوە.

سەرەتا دەڵێین: کچەکان دووسێیەك دەبەن، و براکانیش عەصەبەن، کەواتە ئەصڵی مەسئەلەکە بریتیە لە سێ.

جا ئێستا کچەکان دوو بەش دەبەن، و یەك بەشیش دەمێنێتەوە بۆ براکان.

بەلاّم وەك دەبینین: نە بەشی کچەکان بە ساغی دابەش دەبێت بەسەریاند، و نە بەشی براکانیش بە ساغی دابەش دەبێت بە سەریاندا، وە لە هەمان کاتدا لە نێوان هەردوو بەش، و ژمارەی هەردوو کۆمەڵەکەدا (تباين) هەیە. بۆیە هیچ دەستیان لێ نادەین، وە نیسبەتی نێوان ژمارەی هەردوو کۆمەڵەکەش بریتیە لە (تماثل)، بۆیە یەکێکیان وەردەگرین، و لێکدانی ئەصڵی مەسئەلەکەی دەکەین، و دەبێت بە نۆ (٩). جا ئێستا دووبارە مەسئەلەکە دروست دەکەینەوە.

کچەکان شەش بەش دەبەن، و سێ بەشیش دەمێنێتەوە بۆ براکان. بەمەش هەم بەشی کچەکان، و هەم بەشی براکانیش بە ساغی دابەش دەکرێت بەسەریاندا.

خشتەی شێوەی پێنجەم

| ئەصڵی مەسئەلە | | | ٣ | ٣ × ٣ | ٩ | ٩ |
|---|---|---|---|---|---|---|
| کچ | سێ کچ | دووسێیەك | ٢ | ٢، ٣ تباين | ٦ | ٢ |
| کچ | | | | | | ٢ |
| کچ | | | | | | ٢ |
| برای باوکی | سێ برای باوکی | عەصەبە | ١ | ١، ٣ تباين | ٣ | ١ |
| برای باوکی | | | | | | ١ |
| برای باوکی | | | | | | ١ |

# شێوەی شەشەم

نیسبەتی نێوان بەشە میراتی هەردوو كۆمەڵەكە لەگەڵ ژمارەی میرات بەرانی خۆیاندا بریتیە لە(تباین)، و پاشان نیسبەتی نێوان ژمارەی دوو كۆمەڵەكە بریتیە لە (تداخل).

بۆ نمونە: كەسێك مردوە: سێ كچ، و شەش برای باوكی لەپاش بەجێ ماوە.

سەرەتا دەڵێین: كچەكان دووسێیەك دەبەن، و براكانیش عەصەبەن، كەواتە ئەصڵی مەسئەلەكە بریتیە لە سێ.

جا ئێستا كچەكان دوو بەش دەبەن، و یەك بەشیش دەمێنێتەوە بۆ براكان.

بەڵام وەك دەبینین: نە بەشی كچەكان بە ساغی دابەش دەبێت بەسەریاند، و نە بەشی براكانیش بە ساغی دابەش دەبێت بە سەریاندا، وە لە هەمان كاتدا لە نێوان هەردوو بەش، و ژمارەی هەردوو كۆمەڵكەدا (تباین) هەیە. بۆیە هیچ دەستیان لێ نادەین، وە نیسبەتی نێوان ژمارەی هەردوو كۆمەڵەكەش بریتیە لە (تداخل)، بۆیە زۆرەكەیان وەردەگرین، و لێكدانی ئەصڵی مەسئەلەكەی دەكەین، و دەبێت بە هەژدە (١٨). جا ئێستا دووبارە مەسئەلەكە دروست دەكەینەوە.

كچەكان دوازدە بەش دەبەن، و شەش بەشیش دەمێنێتەوە بۆ براكان. بەمەش هەم بەشی كچەكان، و هەم بەشی براكانیش بەساغی دابەش دەكرێت بەسەریاندا.

خشتەی شێوەی شەشەم

| ئەصڵی مەسئەلە | | | ٣ | ٣ × ٦ | ١٨ | ١٨ |
|---|---|---|---|---|---|---|
| كچ | سێ كچ | دووسێیەك | ٢ | ٢، ٣ تباین | ١٢ | ٤ |
| كچ | | | | | | ٤ |
| كچ | | | | | | ٤ |
| برای باوكی | شەش برای باوكی | عەصەبە | ١ | ١، ٦ تباین | ٦ | ١ |
| برای باوكی | | | | | | ١ |
| برای باوكی | | | | | | ١ |
| برای باوكی | | | | | | ١ |
| برای باوكی | | | | | | ١ |
| برای باوكی | | | | | | ١ |

## شێوەی حەوتەم

نیسبەتی نێوان بەشە میراتی هەردوو کۆمەڵەکە لەگەڵ ژمارەی میرات بەرانی خۆیاندا بریتیە لە(تباین)، و پاشان نیسبەتی نێوان ژمارەی دوو کۆمەڵەکە بریتیە لە (توافق).

بۆ نمونە: کەسێك مردوە: نۆ کچ، و شەش برای باوکی لەپاش بەجێ ماوە.

سەرەتا دەڵێین: کچەکان دووسێیەك دەبەن، و براکانیش عەصەبەن، کەواتە ئەصڵی مەسئەلەکە بریتیە لە سێ. جا ئێستا کچەکان دوو بەش دەبەن، و یەك بەشیش دەمێنێتەوە بۆ براکان.

بەلاّم وەك دەبینین: نە بەشی کچەکان بە ساغی دابەش دەبێت بەسەریاند، و نە بەشی براکانیش بە ساغی دابەش دەبێت بە سەریاندا، وە لە هەمان کاتدا لە نێوان هەردوو بەش، و ژمارەی هەردوو کۆمەڵکەدا (تباین) هەیە. بۆیە هیچ دەستیان لێ نادەین، وە نیسبەتی نێوان ژمارەی هەردوو کۆمەڵەکەش بریتیە لە (توافق)، بۆیە (وفق) ی یەکێکیان وەردەگرین، و لێکدانی ئەوی تری دەکەین، بەمەش ژمارەیەك پەیدا دەبێت، کە بریتیە لە هەژدە (١٨)، جا ئەم هەژدەیە لێکدانی ئەصڵی مەسئەلەکە دەکەین، و دەبێت بە پەنجا و چوار (٥٤). جا ئێستا دووبارە مەسئەلەکە دروست دەکەینەوە.

کچەکان سی و شەش بەش دەبەن، و هەژدە بەشیش دەمێنێتەوە بۆ براکان. بەمەش هەم بەشی کچەکان، و هەم بەشی براکانیش بە ساغی دابەش دەکرێت بەسەریاندا.

## خشتەی شێوەی حەوتەم

| ئەصڵی مەسئەلە | | | ٣ | ٣ × ١٨ | ٥٤ | ٥٤ |
|---|---|---|---|---|---|---|
| کچ | نۆ کچ | دووسێیەك | ٢ | ٢، ٩ تباین | ٣٦ | ٤ |
| کچ | | | | | | ٤ |
| کچ | | | | | | ٤ |
| کچ | | | | | | ٤ |
| کچ | | | | | | ٤ |
| کچ | | | | | | ٤ |
| کچ | | | | | | ٤ |
| کچ | | | | | | ٤ |
| کچ | | | | | | ٤ |
| برای باوکی | شەش برای باوکی | عەصەبە | ١ | ١، ٦ تباین | ١٨ | ٣ |
| برای باوکی | | | | | | ٣ |
| برای باوکی | | | | | | ٣ |
| برای باوکی | | | | | | ٣ |
| برای باوکی | | | | | | ٣ |
| برای باوکی | | | | | | ٣ |

# شێوەی هەشتەم

نیسبەتی نێوان بەشە میراتی هەردوو کۆمەڵەکە لەگەڵ ژمارەی میرات بەرانی خۆیاندا بریتیە لە(تباین)، و پاشان نیسبەتی نێوان ژمارەی دوو کۆمەڵەکەش هەر بریتیە لە (تباین).

بۆ نمونە: کەسێك مردوە: سێ کچ، و دوو برای باوکی لەپاش بەجێ ماوە.

سەرەتا دەڵێین: کچەکان دووسێیەك دەبەن، و براکانیش عەصەبەن، کەواتە ئەصڵی مەسئەلەکە بریتیە لە سێ.

جا ئێستا کچەکان دوو بەش دەبەن، و یەك بەشیش دەمێنێتەوە بۆ براکان.

بەلاّم وەك دەبینین: نە بەشی کچەکان بە ساغی دابەش دەبێت بەسەریاند، و نە بەشی براکانیش بە ساغی دابەش دەبێت بە سەریاندا، وە لە هەمان کاتدا لە نێوان هەردوو بەش، و ژمارەی هەردوو کۆمەڵکەدا (تباین) هەیە. بۆیە هیچ دەستیان لێ نادەین، هەروەها نیسبەتی نێوان ژمارەی هەردوو کۆمەڵەکەش بریتیە لە (تباین)، بۆیە ژمارەی هەردوو کۆمەڵەکە لێکدانی یەکتر دەکەین، و ژمارەیەکمان بۆ دەردەچێت کە بریتیە لە شەش (٦)، ئەوجا ئەم شەشە لێکدانی ئەصڵی مەسئەلەکە دەکەین، و دەبێت بە هەژدە (١٨). جا ئێستا دووبارە مەسئەلەکە دروست دەکەینەوە.

کچەکان دوازدە بەش دەبەن، و شەش بەشیش دەمێنێتەوە بۆ براکان. بەمەش هەم بەشی کچەکان، و هەم بەشی براکانیش بە ساغی دابەش دەکرێت بەسەریاندا.

خشتەی شێوەی هەشتەم

| ئەصڵی مەسئەلە | | | ٣ | ٣ × ٦ | ١٨ | ١٨ |
|---|---|---|---|---|---|---|
| کچ | سێ کچ | دووسێیەك | ٢ | ٢، ٣ تباین | ١٢ | ٤ |
| کچ | | | | | | ٤ |
| کچ | | | | | | ٤ |
| برای باوکی | دوو برای باوکی | عەصەبە | ١ | ١، ٢ تباین | ٦ | ٣ |
| برای باوکی | | | | | | ٣ |

## شێوەی نۆیەم

نیسبەتی نێوان بەشە میراتی کۆمەڵەیەکیان لەگەڵ ژمارەی میرات بەرەکانی هەمان کۆمەڵەدا بریتییە لە (توافق)، بەلاّم نیسبەتی نێوان بەشە میراتی کۆمەڵەکەی تر لەگەڵ ژمارەی میرات بەرانی کۆمەلەکەی خۆیدا بریتییە لە (تباین)، و پاشان نیسبەتی نێوان ژمارەی دوو کۆمەڵەکە بریتیە لە (تماثل).

بۆ نمونە: کەسێك مردوە: شەش کچ، و سێ برای باوکی لەپاش بەجێ ماوە.

سەرەتا دەڵێین: کچەکان دووسێیەك دەبەن، و براکانیش عەصەبەن، کەواتە ئەصڵی مەسئەلەکە بریتیە لە سێ.

جا ئێستا کچەکان دوو بەش دەبەن، و یەك بەشیش دەمێنێتەوە بۆ براکان.

بەلاّم وەك دەبینین: نە بەشی کچەکان بە ساغی دابەش دەبێت بەسەریاند، و نە بەشی براکانیش بە ساغی دابەش دەبێت بە سەریاندا، وە لە هەمان کاتدا لە نێوان بەشی کچەکان، و ژمارەیاندا (توافق) هەیە، بەلاّم لە نێوان بەشی براکان و ژمارەیاندا (تباین) هەیە، بۆیە دێین (وفق) ی ژمارەی کچەکان وەردەگرین کە بریتیە لە (٣)، ئەوجا لە نێوان ئەم (وفق) ە، و ژمارەی براکاندا (تماثل) هەیە، بۆیە یەکێکیان وەردەگرین، و پاشان لێکدانی ئەصڵی مەسئەلەکەی دەکەین، بەمەش ئەصڵی مەسئەلەکە دەبێت بە نۆ (٩). جا ئێستا دووبارە مەسئەلەکە دروست دەکەینەوە.

کچەکان شەش بەش دەبەن، و سێ بەشیش دەمێنێتەوە بۆ براکان. بەمەش هەم بەشی کچەکان، و هەم بەشی براکانیش بە ساغی دابەش دەکرێت بەسەریاندا.

خشتەی شێوەی نۆیەم

| | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ئەصڵی مەسئەلە | | | ٣ | ٣ × ٣ | ٩ | ٩ |
| كچ | شەش كچ | دووسێیەك | ٢ | ٢، ٦ توافق ٦ ÷ ٢ = ٣ | ٦ | ١ |
| كچ | | | | | | ١ |
| كچ | | | | | | ١ |
| كچ | | | | | | ١ |
| كچ | | | | | | ١ |
| كچ | | | | | | ١ |
| برای باوكی | سێ برای باوكی | عەصەبە | ١ | ١، ٣ تباین | ٣ | ١ |
| برای باوكی | | | | | | ١ |
| برای باوكی | | | | | | ١ |

## شێوەی دەیەم

نیسبەتی نێوان بەشە میراتی کۆمەڵەیەکیان لەگەڵ ژمارەی میرات بەرەکانی هەمان کۆمەڵەدا بریتیە لە (توافق)، بەلاّم نیسبەتی نێوان بەشە میراتی کۆمەڵەکەی تر لەگەڵ ژمارەی میرات بەرانی کۆمەلەکەی خۆیدا بریتیە لە (تباین)، و پاشان نیسبەتی نێوان ژمارەی دوو کۆمەڵەکە بریتیە لە (تداخل).

بۆ نمونە: کەسێك مردوە: چوار کچ، و چوار برای باوکی لەپاش بەجێ ماوە.

سەرەتا دەڵێین: کچەکان دووسێیەك دەبەن، و براکانیش عەصەبەن، کەواتە ئەصڵی مەسئەلەکە بریتیە لە سێ.

جا ئێستا کچەکان دوو بەش دەبەن، و یەك بەشیش دەمێنێتەوە بۆ براکان.

بەلاّم وەك دەبینین: نە بەشی کچەکان بە ساغی دابەش دەبێت بەسەریاندا، و نە بەشی براکانیش بە ساغی دابەش دەبێت بە سەریاندا، وە لە هەمان کاتدا لە نێوان بەشی کچەکان، و ژمارەیاندا (توافق) هەیە، بەلاّم لە نێوان بەشی براکان و ژمارەیاندا (تباین) هەیە، بۆیە دێین (وفق) ی ژمارەی کچەکان وەردەگرین کە بریتیە لە (٢)، ئەوجا لە نێوان ئەم (وفق) ە، و ژمارەی براکاندا (تداخل) هەیە، بۆیە زۆرەکەیان _ کە بریتیە لە ژمارەی براکان _ وەردەگرین، و پاشان لێکدانی ئەصڵی مەسئەلەکەی دەکەین، بەمەش ئەصڵی مەسئەلەکە دەبێت بە دوازدە (١٢). جا ئێستا دووبارە مەسئەلەکە دروست دەکەینەوە.

کچەکان هەشت بەش دەبەن، و چوار بەشیش دەمێنێتەوە بۆ براکان. بەمەش هەم بەشی کچەکان و هەم بەشی براکانیش بە ساغی دابەش دەکرێت بەسەریاندا.

## خشتەی شێوەی دەیەم

| | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ئەصڵی مەسئەلە | | | ٣ | ٣ × ٤ | ١٢ | ١٢ |
| كچ | چوار كچ | دووسێیەك | ٢ | ٢، ٤ توافق | ٨ | ٢ |
| كچ | | | | ٤ ÷ ٢ = ٢ | | ٢ |
| كچ | | | | | | ٢ |
| كچ | | | | | | ٢ |
| برای باوكی | چوار برای باوكی | عەصەبە | ١ | ١، ٤ تباین | ٤ | ١ |
| برای باوكی | | | | | | ١ |
| برای باوكی | | | | | | ١ |
| برای باوكی | | | | | | ١ |

## شێوەی یازدەیەم

نیسبەتی نێوان بەشە میراتی کۆمەڵەیەکیان لەگەڵ ژمارەی میرات بەرەکانی هەمان کۆمەڵەدا بریتیە لە (توافق)، بەڵام نیسبەتی نێوان بەشە میراتی کۆمەڵەکەی تر لەگەڵ ژمارەی میرات بەرانی کۆمەلەکەی خۆیدا بریتیە لە (تباین)، و پاشان نیسبەتی نێوان ژمارەی دوو کۆمەڵەکە بریتیە لە (توافق).

بۆ نمونە: کەسێك مردوە: هەشت کچ، و شەش برای باوکی لەپاش بەجێ ماوە.

سەرەتا دەڵێین: کچەکان دووسێیەك دەبەن، و براکانیش عەصەبەن، کەواتە ئەصڵی مەسئەلەکە بریتیە لە سێ. جا ئێستا کچەکان دوو بەش دەبەن، و یەك بەشیش دەمێنێتەوە بۆ براکان.

بەڵام وەك دەبینین: نە بەشی کچەکان بە ساغی دابەش دەبێت بەسەریاندا، و نە بەشی براکانیش بە ساغی دابەش دەبێت بە سەریاندا، وە لە هەمان کاتدا لە نێوان بەشی کچەکان، و ژمارەیاندا (توافق) هەیە، بەڵام لە نێوان بەشی براکان و ژمارەیاندا (تباین) هەیە، بۆیە دێین (وفق) ی ژمارەی کچەکان وەردەگرین کە بریتیە لە (٤)، ئەوجا لە نێوان ئەم (وفق) ە، و ژمارەی براکاندا (توافق) هەیە، بۆیە دێین (وفق) ی یەکێکیان لێکدانی ئەوی تر دەکەین، ژمارەیەکمان بۆ دەردەچێت کە بریتیە لە دوازدا (١٢)، و پاشان ئەم دوازدەیە لێکدانی ئەصڵی مەسئەلەکە دەکەین، بەمەش ئەصڵی مەسئەلەکە دەبێت بە سی و شەش (٣٦). جا ئێستا دووبارە مەسئەلەکە دروست دەکەینەوە.

کچەکان بیست و چوار بەش دەبەن، و دوازدە بەشیش دەمێنێتەوە بۆ براکان. بەمەش هەم بەشی کچەکان، و هەم بەشی براکانیش بە ساغی دابەش دەکرێت بەسەریاندا.

| | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ئەصلی مەسئەلە | | | ٣ | ٣ × ١٢ | ٣٦ | ٣٦ |
| کچ | هەشت کچ | دووسێیەک | ٢ | ٢، ٨ توافق | ٢٤ | ٣ |
| کچ | | | | ٨ ÷ ٢ = ٤ | | ٣ |
| کچ | | | | | | ٣ |
| کچ | | | | | | ٣ |
| کچ | | | | | | ٣ |
| کچ | | | | | | ٣ |
| کچ | | | | | | ٣ |
| کچ | | | | | | ٣ |
| برای باوکی | شەش برای باوکی | عەصەبە | ١ | ١، ٦ تباین | ١٢ | ٢ |
| برای باوکی | | | | | | ٢ |
| برای باوکی | | | | | | ٢ |
| برای باوکی | | | | | | ٢ |
| برای باوکی | | | | | | ٢ |
| برای باوکی | | | | | | ٢ |

## شێوەی دوازدەیەم

نیسبەتی نێوان بەشە میراتی کۆمەڵەیەکیان لەگەڵ ژمارەی میرات بەرەکانی هەمان کۆمەڵەدا بریتیە لە (توافق)، بەلاّم نیسبەتی نێوان بەشە میراتی کۆمەڵەکەی تر لەگەڵ ژمارەی میرات بەرانی کۆمەلەکەی خۆیدا بریتیە لە (تباین)، و پاشان نیسبەتی نێوان ژمارەی دوو کۆمەڵەکە بریتیە لە (تداخل).

بۆ نمونە: کەسێك مردوە: چوار کچ، و سێ برای باوکی لەپاش بەجێ ماوە.

سەرەتا دەڵێین: کچەکان دووسێیەك دەبەن، و براکانیش عەصەبەن، کەواتە ئەصڵی مەسئەلەکە بریتیە لە سێ.

جا ئێستا کچەکان دوو بەش دەبەن، و یەك بەشیش دەمێنێتەوە بۆ براکان.

بەلاّم وەك دەبینین: نە بەشی کچەکان بە ساغی دابەش دەبێت بەسەریاندا، و نە بەشی براکانیش بە ساغی دابەش دەبێت بە سەریاندا، وە لە هەمان کاتدا لە نێوان بەشی کچەکان، و ژمارەیاندا (توافق) هەیە، بەلاّم لە نێوان بەشی براکان و ژمارەیاندا (تباین) هەیە، بۆیە دێین (وفق) ی ژمارەی کچەکان وەردەگرین کە بریتیە لە (٢)، ئەوجا لە نێوان ئەم (وفق) ە، و ژمارەی براکاندا (تباین) هەیە، بۆیە لێکدانی یەکتریان دەکەین، و دەبێت بە شەش، و پاشان ئەم شەشە لێکدانی ئەصڵی مەسئەلەکە دەکەین، بەمەش ئەصڵی مەسئەلەکە دەبێت بە هەژدە(١٨).

جا ئێستا دووبارە مەسئەلەکە دروست دەکەینەوە.

کچەکان دوازدە بەش دەبەن، و شەش بەشیش دەمێنێتەوە بۆ براکان. بەمەش هەم بەشی کچەکان، و هەم بەشی براکانیش بە ساغی دابەش دەکرێت بەسەریاندا.

خشتەی شێوەی دوازدەیەم

| ئەصڵی مەسئەلە | | | ٣ | ٣ × ٦ | ١٨ | ١٨ |
|---|---|---|---|---|---|---|
| کچ | چوار کچ | دووسێیەك | ٢ | ٢، ٤ توافق<br>٤ ÷ ٢ = ٢ | ١٢ | ٣ |
| کچ | | | | | | ٣ |
| کچ | | | | | | ٣ |
| کچ | | | | | | ٣ |
| برای باوکی | سێ برای باوکی | عەصەبە | ١ | ١، ٣ تباین | ٦ | ٢ |
| برای باوکی | | | | | | ٢ |
| برای باوکی | | | | | | ٢ |

ئەوجا بزانە: ئەگەر بەشی سێ کۆمەڵە میرات بەر، یان چوار کۆمەڵە میرات بەر بەساغی دابەش نەدەکرا بەسەر ژمارەی میرات بەرەکانی ئەو کۆمەڵانەدا، ئەوا هەمان هەنگاوەکانی ئەو دوازدە شێوەیەی پێشەوە دەنێین بۆ ساغ کردنەوەی مەسئەلەکان.

## نمونەیەکی سێ کۆمەڵی

کەسێك مردوە: دوو داپیرە، و سێ برای دایکی، و دوو مامی باوکی لەپاش بەجێ ماوە.

سەرەتا دەڵێین: داپیرەکان شەش یەك دەبەن، و برا دایکی‌یەکانیش سێ یەك دەبەن، و مامەکانیش عەصەبەن، کەواتە ئەصڵی مەسئەلەکە بریتیە لە شەش(٦).

جا ئێستا داپیرەکان یەك بەش دەبەن، و برا دایکی‌یەکانیش دوو بەش دەبەن، و سێ بەشیش دەمێنێتەوە بۆ مامەکان.

بەلاّم وەك دەبینین: نە بەشی داپیرەکان بە ساغی دابەش دەبێت بەسەریاندا، و نە بەشی براکانیش بە ساغی دابەش دەبێت بە سەریاندا، وە نە بەشی مامەکانیش بەساغی دابەش دەبێت بەسەریاندا، وە لە هەمان کاتدا لە نێوان هەریەك لە کۆمەڵەکان، و ژمارەیاندا (تباین) هەیە، بۆیە ژمارەی میرات بەرەکانی هەر سێ کۆمەڵەکە وەك خۆیان وەردەگرین، ئەوجا تەماشای نیسبەتی نێوان ژمارەی میرات بەرانی هەر سێ کۆمەڵەکە دەکەین، دەبینین لە نێوانیان ژمارەی داپیرەکان، و مامەکاندا (تماثل) هەیە، بۆیە یەکێکیان وەردەگرین، وە لە نێوان ئەو ژمارە و ژمارەی براکاندا (تباین) هەیە، بۆیە لێکدانی یەکتریان دەکەین، و دەبێت بە شەش (٦)، پاشان ئەم شەشە لێکدانی ئەصڵی مەسئەلەکە دەکەین، و دەبێت بە سی و شەش (٣٦). جا ئێستا دووبارە مەسئەلەکە دروست دەکەینەوە.

داپیرەکان شەش بەش دەبەن، و برا دایکی‌یەکانیش دوازدە بەش دەبەن، هەژدە بەشیش دەمێنێتەوە بۆ مامەکان، بەمەش هەم بەشی داپیرەکان بە ساغی دابەش دەکرێت بەسەریاندا، و هەم بەشی برا دایکی‌یەکانیش بە ساغی دابەش

دەکرێت بەسەریاندا، و هەم بەشی مامەکانیش بەساغی دابەش دەکرێت بەسەریاندا.

خشتەی نمونەیەکی سێ کۆمەڵی

| | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ئەصڵی مەسئەلە | | | ٦ | ٦ | ٦ × ٦ | ٣٦ | ٣٦ |
| داپیرە | دوو داپیرە | شەش یەك | ١ | ١ ÷ ٢ =؟ تباین | ٢ | ٦ | ٣ |
| داپیرە | | | | | | | ٣ |
| برای دایکی | سێ برای دایکی | سێیەك | ٢ | ٢ ÷ ٣ =؟ تباین | ٣ | ١٢ | ٤ |
| برای دایکی | | | | | | | ٤ |
| برایدایکی | | | | | | | ٤ |
| مامی باوکی | دوو مامی باوکی | عەصەبە | ٣ | ٣ ÷ ٢ =؟ تباین | ٢ | ١٨ | ٩ |
| مامی باوکی | | | | | | | ٩ |

## نمونەیەکی چوار کۆمەڵی

پیاوێك مردوە: دوو ژن، چوار داپیرە، و سێ برای دایکی، و دوو مامی باوکی لەپاش بەجێ ماوە

سەرەتا دەڵێین: ژنەکان چواریەك دەبەن، و داپیرەکانیش شەش یەك دەبەن، و برا دایکی‌یەکانیش سێ یەك دەبەن، و مامەکانیش عەصەبەن، کەواتە ئەصڵی مەسئەلەکە بریتیە لە دوازدە (١٢). جا ئێستا ژنەکان سێ بەش دەبەن، و داپیرەکانیش دوو بەش دەبەن، و برا دایکی‌یەکانیش چوار بەش دەبەن، و سێ بەشیش دەمێنێتەوە بۆ مامەکان.

بەلاّم وەك دەبینین: تەنها لە نێوان بەشی داپیرەکان، و ژمارەی داپیرەکاندا (توافق) هەیە، بۆیە (وفق) ی ژمارەی داپیرەکان وەردەگرین کە دەکاتە دوو. ئەگینانە بەشی ژنەکان بەساغی دابەش دەکرێت بەسەریاندا، و نە بەشی براکانیش بە ساغی دابەش دەبێت بە سەریاندا، وە نە بەشی مامەکانیش بەساغی دابەش دەبێت بەسەریاندا، وە لە هەمان کاتدا لە نێوان هەریەك لە بەشەکان، و ژمارەی میرات بەرانی کۆمەڵەکاندا (تباین) هەیە، بۆیە ژمارەی میرات بەرەکانی ئەم سێ کۆمەڵەیە وەك خۆیان وەردەگرین، ئەوجا تەماشای نیسبەتی نێوان ژمارەی میرات بەرانی هەر چوار کۆمەڵەکە دەکەین، دەبینین لە نێوان (وفق) ی ژمارەی داپیرەکان، و ژمارەی ژنەکان، و مامەکاندا (تماثل) هەیە، بۆیە یەکێکیان وەردەگرین، وە لە نێوان ئەو ژمارە، و ژمارەی براکاندا (تباین) هەیە، بۆیە لێکدانی یەکتریان دەکەین، و دەبێت بە شەش (٦)، پاشان ئەم شەشەیە لێکدانی ئەصڵی مەسئەلەکە دەکەین، و دەبێت بە حەفتا ودوو (٧٢). جا ئێستا دووبارە مەسئەلەکە دروست دەکەینەوە.

ژنەکان هەژدە بەش دەبەن، و داپیرەکانیش دوازدە دەبەن، و برا دایکی‌یەکانیش بیست و چوار دەبەن، هەژدەش دەمێنێتەوە بۆ مامەکان، بەمەش

هەم بەشی ژنەکان، و هەم بەشی داپیرەکان، و هەم بەشی برا دایکیيەکان، و هەم بەشی مامەکانیش بەساغی دابەش دەکرێت بەسەریاندا.

خشتەی نمونەیەکی چوار کۆمەڵی

| ئەصڵی مەسئەلە | | | ١٢ | ١٢ | ١٢ × ٦ | ٧٢ | ٧٢ |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ژن | دوو ژن | چواریەك | ٣ | ٣ ÷ ٢ = ؟ | ٢ | ١٨ | ٩ |
| ژن | | | | تباین | | | ٩ |
| داپیرە | چوار داپیرە | شەش یەك | ٢ | ٢ ÷ ٤ = ؟ | ٢ | ١٢ | ٣ |
| داپیرە | | | | توافق | | | ٣ |
| داپیرە | | | | ٤ ÷ ٢ = ٢ | | | ٣ |
| داپیرە | | | | | | | ٣ |
| برای دایکی | سێ برای دایکی | سێیەك | ٤ | ٤ ÷ ٣ = ؟ | ٣ | ٢٤ | ٨ |
| برای دایکی | | | | تباین | | | ٨ |
| برایدایکی | | | | | | | ٨ |
| مامی باوکی | دوو مامی باوکی | عەصەبە | ٣ | ٣ ÷ ٢ = ؟ | ٢ | ١٨ | ٩ |
| مامی باوکی | | | | تباین | | | ٩ |

ئەوجا بزانە کە بێجگە لەو مەسئەلانەی کە پەیوەندیان بە (ولاء، و معتق، و معتقة) ەوە هەیە، کە دەگونجێت شکانەوەکە بەسەر زیاد لە چوار کۆمەڵ میرات بەردا بێت، ئەگینا، بە گوێرەی بەدوادا چوونێك کە زانایان کردوویانە لەم بابەتەدا، هیچ مەسئەلەیەکیان دەست نەکەوتوە کە شکانەوەکە بەسەر زیاد لە چوار کۆمەڵ میرات بەر بێت، بەڵکو ئەوەی کە دەست کەوتوە، هیچ مەسئەلەیەك لە چوار کۆمەڵ تێنەپەڕیوە.[1]

شێخی نۆدی دەفەرموێت:

ولا يزيد في سوى الولاء      وذاك معلوم بالاستقراء

١) التحفة ٦ / ٤٣٥، شرح المنهج ٦ / ١١٤، النهاية ٣٨، المغني ٣٦.

ئەوجا لەپاش هەموو ساغ کردنەوەی مەسئەلەیەکدا ئەگەر بتەوێت بزانیت هەر کۆمەڵە میرات بەرێك لە پاش ساغ کردنەوەی مەسئەلەکە بەشە میراتەکەیان دەبێت بە چەند، ئەوا ئەو بەشە بهێنە کە لە سەرەتادا لە ئەصڵی مەسئەلەکە دەیانبرد، پاشان لێکدانی ئەو ژمارەیەی بکە کە بۆ ساغ کردنەوەکە لێکدانی ئەصڵی مەسئەلەکەت کردبوو، ئیتر ئەو بەشەت بۆ دەردەچێت کە بە ساغی و بەبێ شکانەوە دابەش دەبێت بەسەر میرات بەرەکاندا.

شێخی نۆدی دەفەرموێت:

| | |
|---|---|
| وكلّ صنف تعرف النصيب له | من عدد قد بلغته المسألة |
| بضرب حصة له يحويها | من أصلها فيما ضربت فيها |
| فالمنتهى نصيبه المعلوم | وهو على عدده المقسوم |

ئێستا لەم نمونەی کۆتاییدا وەك وتمان: سەرەتا ژنەکان سێ بەش دەبەن، و داپیرەکانیش دوو بەش دەبەن، و برا دایکییەکانیش چوار بەش دەبەن، و سێ بەشیش دەمێنێتەوە بۆ مامەکان.

بەڵام کە ویستمان مەسئەلەکە ساغ بکەینەوە، هاتین ئەصڵی مەسئەلەکە کە دوازدە بوو، لێکدانی شەشمان کرد، جا ئێستاش بەشی هەر کۆمەڵێك لە میرات بەرەکان لێکدانی ئەم شەشە بکەین، ئەوا ئەو بەشەمان بۆ دەردەچێت کە لەپاش ساغ کردنەوەی مەسئەلەکە هەر کۆمەڵە میرات بەرێك دەیبەن، بەمەش: ژنەکان هەژدە بەش دەبەن، و داپیرەکانیش دوازدە بەش دەبەن، و برا دایکییەکانیش بیست و چوار بەش دەبەن، هەژدە بەشیش دەمێنێتەوە بۆ مامەکان.

# باسی گواستنەوەی میرات لە مردوویەك بۆ مردوویەکی تر

## ( المناسخات )

لە شەرعدا ئەوەیە کە: یەکێك یان زیاتر لە میرات بەرەکانی مردویەك بمرێت لە پێش دابەشکردنی میراتەکە.

جا ئەگەر کەسێك مرد و چەند میرات بەرێکی هەبوو چی خاوەن بەشی دیاری کراو بن، یان عەصەبە )، وە یەکێك یان زیاتر لەو میرات بەرانە مرد لە پێش دابەش کردنی میراتەکە، ئەوا ئەو مەسئەلەیە خۆی لە چوار شێوە دا دەبینێتەوە:

(١) میرات بەرانی مردووی دوەم هەر هەمان میرات بەرانی مردووی یەکەمن، وە بە یەك شێوەش لە هەردوو مردوەکە میرات دەبەن، جا لەم شێوەیە دا: میراتەکە لە نێوان میرات بەرەکاندا وەها دابەش دەکرێت وەك بوترێت کە مردووی دوەم هەر میرات بەری مردووی یەکەم نەبوە. بۆ نمونە: ئەگەر کەسێك بمرێت: چەند برایەك، و چەند خوشکێکی باوکی لە پاش بەجێ بمێنێت، جا ئەگەر یەکێك لەم برا و خوشکانە بمرێت، ئەوا: میراتەکە دابەش دەکرێت بەسەر ئەوانەیان دا کە ماون بە پێی یاسای: (للذکر مثل حظ الأنثیین)، ئیتر بە بێ ئەوەی کە گوێ بدرێتە مردووی دوەم، و وەها دادەنرێت کە ئەو هەر نەش بوە. شێخی نۆدی دەفەرموێت:

إن تنحصر ورثة فیمن بقي     وورثوه إرثهم من سابق

یجعل کأن المیِّت الثاني ما     کان، و الإرث بینهم قد قسما

ئاگاداری: مەرج نیە لەم شێوەیەدا میرات بەرەکانی مردووی یەکەم هەموویان میرات بەربن لە مردووی دوەم، وە مەرج نیە هەمووشیان میرات بەری

عەصەبە بن، بەڵکو دەگونجێت خاوەن بەشی دیاری کراوبن، وە مەرج نیە کە بە هەمان وەسفی پێشوو میرات لە مردووی دوەم ببەن.[1]

بۆ نموونە: پیاوێك مردوە: چەند کوڕێك، و چەند کچێکی لە پاش بەجێ ماوە. ئەوجا پێش ئەوەی کە میراتەکە دابەش بکرێت بە سەریان دا یەکێك لە کوڕەکان، یان کچەکان مرد، ئەوا: میرات بەرەکانی مردووی دوەم هەر هەمان میرات بەرانی مردووی یەکەمن، بەلاّم لێرەدا بە سیفاتی جیاواز لە سیفاتی پێشوویان، چونکە لە مردووی یەکەم دا کوڕ و کچ بوون، بەلاّم لە مردووی دوەم دا برا و خوشکن.

(٢) میرات بەرانی مردووی دوەم هەر هەمان میرات بەرانی مردووی یەکەمن، بەڵام شێوەی میرات بردنیان لە مردووی یەکەمەوە بۆ مردووی دوەم جیاوازە.

(٣) میرات بەرانی مردووی دوەم جیاوازن لە میرات بەرانی مردووی یەکەم.

(٤) میرات بەرانی مردووی دوەم هەندێکیان هەمان میرات بەرانی مردووی یەکەمن، و هەندێکیشیان جیاوازن.

ئەوا: لەم سێ شێوەیە دا بۆ هەریەك لە دوو مردوەکە مەسئەلەیەك درووست دەکەین، ئەوجا تەماشای بەشی مردوە دوەمەکە دەکەین لە مەسئەلەی یەکەم دا، و بەراوردی دەکەین لەگەڵ ئەصڵی مەسئەلەی دوەم دا، تاوەکو بزانین پەیوەندی لە نێوانیان دا چیە؟ جا ئەگەر:

أ. بەشی مردوە دوەمەکە لە مەسئەلەی یەکەمدا دابەش دەبوو بەسەر ئەصڵی مەسئەلە دوەمەکە دا، ئەوا: ئاسانە، و ئاشکرایە. بۆ نمونە: ژنێك مردوە: مێرد، و دوو خوشکی باوکی لە پاش بەجێ ماوە، پاشان یەکێك لە خوشکەکان مرد: کچێك، و خوشکەکەی تری لەپاش بەجێ ما. ئەوا مەسئەلەی یەکەم "ژنێك بمرێت ...هتد" لە شەشە (٦)، چونکە مێردەکە نیوە دەبات کە دەکاتە سێ (٣)،

---

[1] التحفة ٦ / ٤٣٦، النهاية ٣٩، المغني ٣٧، القليوبي ١٥٥.

و دوو خوشکەکەش دوو سیٚ یەك دەبەن، کە دەکاتە: چوار (٤)، بەمەش ئەصڵی مەسئەلەکە زیاد دەکرێت (عەول) بۆ حەوت (٧). وە مەسئەلەی دوەم "پاشان یەکێك ...هتد" لە دوە (٢)، چونکە: کچەکە نیوە دەبات، و خوشکەکەش بە عەصەبەگەرایەتی نیوەکەی تر دەبات، ئێستا تەماشا دەکەین: بەشی مردوە دوەمەکە -کە یەکێك لە خوشکەکانە- لە مەسئەلەی یەکەمدا دوو (٢) ە، و بە ساغی دابەش دەکرێت بەسەر کچ، و خوشکەکە دا، و هەر یەکەیان یەك (١) بەشیان دەکەوێت.

ب.لە نێوان بەشی مردووی دوەم لە مەسئەلەی یەکەمدا، و ئەصڵی مەسئەلەی دوەم دا (توافق) هەبوو، ئەوا (وفق) ی ئەصڵی مەسئەلەی دوەم لێك دەدرێت لەگەڵ ئەصڵی مەسئەلەی یەکەمدا، ئەو کاتە ژمارەکە بوو بە چەند، هەردوو مەسئەلەکە لەو ژمارەیە دا ڕێك دەخرێن، ئەوجا هەر میرات بەرێك لە مەسئەلەی یەکەم دا چەندی وەرگرتبێت، لێکدانی دەکەین لەگەڵ (وفق) ی ئەصڵی مەسئەلەی دوەم، چەند دەرچوو ئەوەندە دەبات. و هەر میرات بەرێك لە مەسئەلەی دوەم دا چەندی وەرگرتبێت، لێکدانی دەکەین لەگەڵ (وفق) ی بەشی مردووی دوەم لە مەسئەلەی یەکەم دا، چەند دەرچوو ئەوەندە دەبات.

ت.لە نێوان بەشی مردووی دوەم لە مەسئەلەی یەکەمدا، و ئەصڵی مەسئەلەی دوەم دا (تباین) هەبوو، ئەوا: تەواوی ئەصڵی مەسئەلەی دوەم لێك دەدرێت لەگەڵ ئەصڵی مەسئەلەی یەکەم دا، ئەو کاتە ژمارەکە بوو بە چەند، هەردوو مەسئەلەکە لەو ژمارەیە دا ڕێك دەخرێن، ئەوجا هەر میرات بەرێك لە مەسئەلەی یەکەم دا چەندی وەرگرتبێت، لێکدانی دەکەین لەگەڵ تەواوی ئەصڵی مەسئەلەی دوەم، چەند دەرچوو ئەوەندە دەبات. و هەر میرات بەرێك لە مەسئەلەی دوەم دا چەندی وەرگرتبێت، لێکدانی دەکەین لەگەڵ تەواوی بەشی مردووی دوەم لە مەسئەلەی یەکەم دا، چەند دەرچوو ئەوەندە دەبات.

نمونەی (توافق) وەك:

کەسێك مردوە: دوو نەنك، و سێ خوشکی لەپاش بەجێ ماوە -- سێ خوشکەکە یەکێکیان باوك و دایکی، و یەکێکی تریان تەنها باوکی، و ئەوی تریان تەنها دایکی --، پاشان خوشکە تەنها دایکیەکە مرد: خوشکێکی تەنها دایکی، کە ئەم خوشکە دایکیە خوشکی باوك و دایکی بوو لە مەسئەلەی یەکەمدا بۆ مردووی یەکەم، و دوو خوشکی باوك و دایکی، و دایکی دایکی لە پاش بەجێ ما، کە ئەم نەنکە یەکێك لەو دوو نەنکە بوو کە لە مەسئەلەی یەکەمدا هەبوون. ئەوا: مەسئەلەی یەکەم لە شەشە (٦)، و لە دوازدە (١٢) ساغ دەکرێتەوە -بە لێك دانی ژمارەی دوو نەنکەکە لە شەش-، و مەسئەلەی دوەمیش- پاشان خوشکە تەنها دایکیەکە مرد...هتد ) لە شەش (٦)ە، و بەشی مردوە دوەمەکە لە مەسئەلەی یەکەمدا بریتیە لە: دوو (٢)، جا ئەم دوو (٢) بەشە لەگەڵ ئەصڵی مەسئەلەی دوەم دا کە شەشە (٦)، (توافقی نیوەیی) هەیە لە نێوانیان دا، بۆیە: نیوەی ئەصڵی مەسئەلەی دوەم کە دەکاتە: سێ (٣)، لێك دەدرێت لە تەواوی مەسئەلەی یەکەم کە دوازدە (١٢) یە، و دەبێت بە سی و شەش (٣٦)، ئەوجا هەر یەك لە دوو نەنکەکە لە مەسئەلەی یەکەمدا شەش یەك دەبەن، کە دەکاتە یەك (١)، جا ئەم یەك (١) بەشە، لێك دەدرێت لە نیوەی مەسئەلەی دوەم، کە: سێ (٣) یە، بەمەش بەشی هەر یەکە لە نەنکەکان دەبێت بە سێ (٣)، و نەنکی مەسئەلەی دوەمیش لە مەسئەلەی دوەم دا یەك (١) بەش بوو، وە ئەو بەشە لەپاش لێك دانی لە یەك، کە نیوەی بەشی مردوە دوەمەکەیە لە مەسئەلەی یەکەمدا ، هەر دەکاتەوە: یەك (١)، وە خوشکە باوکی و دایکیەکە لە مەسئەلەی یەکەمدا شەش (٦) بەشی بردبوو، جا ئەم شەش (٦) بەشە بە لێکدانی لە سێ (٣) — کە نیوەی ئەصڵی مەسئەلەی دوەمە -- دەکاتە هەژدە (١٨)، وە لە مەسئەلەی دوەمدا یەك (١) بەش دەبات، وە ئەو یەك (١)

بەشە لەپاش لێکدانی لە نیوەی بەشی مردوە دوەمینەکە لە مەسئەلەی یەکەمدا هەر دەکاتەوە: یەك (١)، وە خوشکە تەنها باوکیەکە لە مەسئەلەی یەکەمدا دوو (٢) دەبات، و ئەم دوو (٢) ە، بە لێکدانی لە نیوەی مەسئەلەی دوەم، کە سێ (٣) یە دەبێت بە شەش (٦)، وە دوو خوشکە باوك و دایکیەکەش لە مەسئەلەی دوەمدا چوار (٤) دەبەن، و ئەم چوارە (٤)، هەر بە چواری دەمێنێتەوە، چونکە بە لێکدانی لەگەڵ نیوەی بەشی مردووی دوەم لە مەسئەلەی یەکەم دا، کە: یەکە، هەر دەکاتەوە چوار (٤).

## نموونەی (تباین) وەك:

پیاوێك مردوە: ژنێك، و سێ کوڕ، و کچێکی لە پاش بەجێ ماوە، پاشان کچەکە مرد: دایك — کە ژنی مردووی یەکەمە ---، و سێ برای لە پاش بەجێ ماوە. ئەوا: مەسئەلەی یەکەم لە هەشتە (٨)، یەك (١) بەشی ژنەکە دەیبات، وە هەرسێ کوڕەکەش شەش (٦) دەبەن، و کچەکەش یەك (١) دەبات، وە مەسئەلەی دوەمیش لە شەشە (٦) ، دایکەکە شەش یەك دەبات، کە دەکاتە یەك (١)، و پێنج (٥) بەشیش دەمێنێتەوە بۆ سێ براکە، جا لەبەر ئەوەی کە ئەم پێنج بەشە دابەش ناکرێت بەسەر سێ براکە دا، بۆیە مەسئەلەکە لە هەژدە (١٨) ساغ دەبێتەوە، لە ئەنجامی لێکدانی ژمارەی براکان کە سێ یە لە شەش ، ئەوجا دەبینین کە: بەشی مردووی دوەم — کچەکە -- لە مەسئەلەی یەکەمدا کە یەك (١) بوو، (تباین) ی هەیە لەگەڵ ئەصڵی مەسئەلەی دوەم دا کە پاش ساغ کردنەوە بوو بە: هەژدە (١٨)، بۆیە ئێستا: تەواوی ئەصڵی مەسئەلەی دوەم کە هەژدەیە (١٨) لێکدەدرێت لەتەواوی ئەصڵی مەسئەلەی یەکەم کە هەشتە (٨)، و دەکاتە سەد و چل و چوار (١٤٤ )، ئەوجا: ژنەکە لە مەسئەلەی یەکەمدا یەك (١) ی بردبوو، لەپاش لێکدانی لە ئەصڵی مەسئەلەی دوەم دەبێت بە: هەژدە

(١٨)، وە لە مەسئەلەی دووەمدا —کە دایکەکەیە- سێ (٣) دەبات، لەپاش لێکدانی لە بەشی مردوە دووەمەکە لە مەسئەلەی یەکەمدا کە یەکە (١) هەر دەکاتەوە: سێ (٣)، وە هەریەکە لە سێ کوڕەکە لە مەسئەلەی یەکەمدا دوو بەشیان بردبوو، جا ئێستا لەپاش لێکدانی لە هەژدە (١٨) دەبێت بە سی و شەش (٣٦ )، وە لە مەسئەلەی دووەمیشدا پێنج (٥) دەبەن، جا ئێستا لە پاش لێکدانی لە بەشی مردوی دووەم لە مەسئەلەی یەکەمدا، کە: یەکە (١) هەر دەکاتەوە: پێنج (٥).

ئەوجا بزانە: ئەگەر میرات بەرێکی سێیەمیش مرد، ئەوا: ئەو ژمارەیەی کە هەردوو مەسئەلەکەی یەکەم و دووەمی لێ ساغ بوەتەوە، دەبێت بە مەسئەلەیەکی تازە، و بە مەسئەلەی یەکەم دادەنرێت، و مەسئەلەی مردووی سێ یەمیش بە مەسئەلەی دووەم دادەنرێت، واتە: تەماشای پەیوەندی نێوان بەشی مردووی سێ یەم، لە گەڵ ئەصڵی مەسئەلەی سێ یەم دەکەین، ئایا دابەش دەبێت بە سەری دا، یان (توافق)، یان (تباین) هەیە لە نێوانیان دا.[١]

## چەند نموونەیەکی (مناسخات) کە پێویستیان بە پرسیار کردن هەیە لە بارەی سیفەتی مردوەکە، و میرات بەرەکانەوە

هەندێك مەسئەلە هەیە کە پێویستە پرسیار بکرێت تیایدا، ئایا مردوەکە نێرینەیە، یان مێینەیە؟، و ئایا میرات بەرەکان منداڵی یەك دایکن، یان زیاتر؟، چونکە بڕیاری شەرعی بە گوێرەی وەڵامی ئەم پرسیارانە دەگۆڕێت، وا دەبێت کە بەشی میرات بەرێك زیاد دەکات، یان کەم دەکات، نموونەکانیش وەك ئەمانە:[٢]

---

١) المغني ٣٨.
٢) الفقه الإسلامي ٧٩١٤ — ٧٩١٥.

(١) دوو برای باوکی، و دوو خوشکی دایك و باوکی. جا ئەگەر یەکێك لە دوو براکە مرد، ئەوا پێویستە بپرسین: ئایا هەردوو براکە لە یەك دایکن، یان دایکیان جیاوازە؟، چونکە ئەگەر لە یەك دایك بن، ئەوا: مانای وایە کە برای دایك و باوکین، بەمەش: هەموو میراتەکە بۆ براکە دەبێت، و خوشکەکانیش بێ بەش دەبن، بەڵام ئەگەر لە دوو دایکی جیاواز بن، ئەوا: لەگەڵ خوشکەکان دا هەموو میراتەکە دەبەن، و خوشکەکانیش بێ بەش نابن.

(٢) دوو خوشکی دایکی، و دوو خوشکی دایك و باوکی، جا ئەگەر یەکێك لە دوو خوشکە دایکیەکە مرد، ئەوا پێویستە بپرسین: ئایا هەردوو خوشکە دایکیەکە لە یەك باوکیشن، یان باوکیان جیاوازە؟ چونکە ئەگەر لە یەك باوکیش بن، ئەوا دوو خوشکە دایك و باوکیەکە دەبن بە: خوشکی دایکی بۆ ئەم دوو خوشکە، بەڵام ئەگەر لە دوو باوکی جیاواز بن، ئەوا هەر چوار خوشکەکە دەبنە خوشکی تەنها دایکی.

(٣) پێنج خوشك، و مامێك، پێویستە بپرسین: ئایا مردوەکە نێرینەیە، یان مێیینە؟، و ئایا خوشکەکانیش خوشکی دایکی مردوەکەن، یان خوشکی باوکی، یان خوشکی دایك و باوکین؟، یان هەندێکیان خوشکی دایکین، و هەندێکی تریشیان باوکین؟ چونکە بە گوێرەی وەڵامی هەر یەك لەم پرسیارانە بڕیاری شەرعیش دەگۆڕێت.

(٤) چوار کچ، و مامێك، جا ئەگەر یەکێك لە کچەکان بمرێت، ئەوا پێویستە بپرسین: ئایا هەر چوار کچەکە منداڵی یەك دایکن، یان منداڵی چەند دایکێکن؟

(٥) کەسێك بمرێت: دایك، و باوك، و دوو کچی لە پاش بەجێ بمێنێت، پاشان یەکێك لە کچەکان بمرێت: مێردی لە پاش بەجێ بمێنێت، ئەوا پێویستە بپرسین: ئایا مردوەکە نێرینەیە، یان مێیینە؟، جا ئەگەر مێیینە بوو، ئەوا پێویستە بپرسین: ئایا دوو کچەکە لە یەك مێردن، یان لە دوو مێرد. جا بزانە کە

ئەم مەسئەلەیە پێی دەوترێت: (المأمونية)، چونکە: کاتێك کە خەلیفە (مأمون) ویستی یەحیای کوڕی ئەکثە م تاقی بکاتەوە بۆ ئەوەی کە بیکات بە قاضی، ئەویش یەکسەر پرسیاری کرد، بۆیە (مأمون) وتی: مانای وایە وەڵامەکەش ئەزانی بۆیە ئەم پرسیارە دەکەیت.[١]

(٦) مێرد، و چوار کچ، و مامێك، جا ئەگەر یەکێك لە کچەکان بمرێت، ئەوا: پێویستە بپرسین: ئایا مێردەکە باوکی کچە مردوەکەیە، یان نا؟، وە ئایا ئەو کچانەی تر کە ماون، ئەوانیش لە یەك مێردن، یان لە چەند مێردێکن؟

(٧) پیاوێك مردوە: دوو برا، و دوو نەنکی لە پاش بەجێ ماوە، جا ئەگەر یەکێك لە دوو براکە مرد، ئەوا پێویستە بپرسین: ئایا دوو براکە برای دایك و باوکی بوون، یان نا؟ چونکە ئەگەر تەنها برای باوکی بن، ئەوا تەنها ئەو نەنکەی کە دایکی باوکە میرات دەبات، وە ئەگەر تەنها برای دایکی بن، ئەو نەنکەی کە دایکی دایکە میرات دەبات، وە ئەگەر برای دایك و باوکی بن، ئەوا: هەردوو نەنکەکە میرات دەبەن.

(٨) دە کوڕە مام، ئەگەر یەکێکیان بمرێت، ئەوا: پێویستە بپرسین: ئایا هەموویان کوڕی یەك دایکن، یان نا؟

(٩) دایك و باوك و سێ برا، جا ئەگەر دایکەکە مرد، ئەوا پێویستە بپرسین: ئایا باوکی مردوەکە مێردی دایکی مردوەکە بوە، یان طلاقی داوە.

---

١) المغني ٣٨، الفقه الإسلامي ٧٩١٤.

# بەشی چوارەم

## گەڕاندنەوە ( ردّ )

بریتیە لە گەڕاندنەوەی ئەوەی کە لە بەشی خاوەن بەشەکان زیادە بەسەر ئەو خاوەن بەشانەی کە دروستە بۆیان بگەڕێنرێتەوە، هەر کەسەو بەگوێرەی بەشەکەی خۆی. واتە بەشی خاوەن بەشەکان زیاد دەکات، و سەهمەکانیش کەم دەکات. [(١)]

جا وەك لە سەرەتاوە باسمان کرد، کە ئەگەر کەسێك بمرێت، و میرات بەری عەصەبەی نەبێت، و (بيت المال ) یش بە گوێرەی شەرع نەدەبرا بە ڕێوە، ئەوا: ئەوەی کە زیادە لە بەشی خاوەن بەشەکان هەرکەسەو بە گوێرەی بەشی خۆی بۆی ڕەد دەکرێتەوە، تەنها مێرد، و ژن نەبێت کە هیچیان بۆ ڕەد ناکرێتەوە.

ئیمامی رەحەبی دەفەرموێت:

إن أبقت الفروض بعد التركة ... وليس ثمّ عاصبٌ قد مَلكَه
فرُدّه لِمَنْ سوى الزوجينِ ... من كلّ ذي فرض بغير مين

کەواتە بۆ ئەوەی کە مەسئەلەیەك گەڕاندنەوەی تێدا ڕوو بدات، ئەوا پێویستە ئەم سێ مەرجە هاتبنەدی [(٢)]:

(١) مەسئەلەکە خاوەن بەشی دیاریکراوی تێدابێت.

(٢) مەسئەلەکە عەصەبەی تێدا نەبێت.

(٣) دەبێت لە بەشی خاوەن بەشەکان زیادە بمێنێتەوە، بە جۆرێك کە میرات بەرەکان هەموو میراتەکە نەبەن.

---

١) النهاية ٣٨، المغني ٣٦، شرح المنهج ٦ / ٦٤.

٢) الفقه المنهجي ٢ / ٣٩٦، الميراث المقارن ١٨٠.

بەلاّم ئێستا دێینە سەر ئەوەی کە بزانین: ئایا ئەم ڕەد کردنەوەیە چۆن دەبێت؟ وەك ئەوەی کە زانایان باسیان کردوە، گەڕاندنەوەی پاشماوەی بەشی خاوەن بەشەکان بەسەریان دا، و چۆنێتی درووست کردنی مەسئەلەکانی بە دوو ڕێگا دەبێت:

## ڕێگەی یەکەم: بە درێژی (مُفصّل)

بریتیە لەوەی کە لەسەر یاسای چۆنێتی درووست کردنی مەسئەلەکان بڕۆین، و مەسئەلەکە درووست بکەین، و هەر خاوەن بەشێك بەشی دیاری کراوی خۆی بدرێتیٚ، ئەوجا هەرچیەك لە ئەصلّی مەسئەلەکە مایەوە بگەڕێنرێتەوە بەسەر خاوەن بەشەکان دا، هەر کەسەو بە گوێرەی ئەندازەی بەشەکەی خۆی، تەنها ژن، و مێرد نەبێت، کە هیچیان بۆ ناگەڕێنرێتەوە.

جا ئەگەر کەسێك بمرێت:

١) تەنها یەك خاوەن بەش میرات بەری هەبێت، وەك: تەنها کچێك، ئەوا هەموو میراتەکە دەبات، نیوەی وەك خاوەن بەش، و نیوەکەی تریش بە گەڕاندنەوە.

٢) چەند کەسێك میرات بەری هەبێت، بەلاّم هەموو میرات بەرەکان بە یەك جۆر میرات ببەن، ئەوا دیسان هەموو میراتەکە دەبەن، وەك: دوو کچ، یان دوو خوشك، ئەوا دوو سیٚ یەکی میراتەکە وەك خاوەن بەش دەبەن، و پاشماوەکەش دەگەڕێنرێتەوە بۆیان، و بە یەکسانی بە سەریان دا دابەش دەکرێت.

٣) چەند کەسێك میرات بەری هەبێت، و هەر یەك لە میرات بەرەکانیش بە جۆرێك میرات ببەن، ئەوا هەر یەکەیان بەشی دیاری کراوی خۆی دەدرێتیٚ، و پاشماوەکەش دەگەڕێنرێتەوە بۆیان، هەر کەسەو بە گوێرەی بەشی خۆی.

ئەوجا بۆ تێگەیشتن لە چۆنێتی جێ بەجێ كردنی ئەم یاسایە، سێ نمونە دەهێنینەوە:

(١) نە مێرد، نە ژنی تێدا نەبێت.

(٢) مێردی تێدا بێت.

(٣) ژنی تێدا بێت.

## نمونەی یەكەم

## نە مێرد، نە ژنی تێدا نەبێت وەك:

كەسێك مردوە: كچێك، و دایكێكی لە پاش بەجێ ماوە.

كچەكە (نیوە ) دەبات، و دایكەكەش (شەش یەك ) دەبات، مەسئەلەكە لە شەشە (٦)، نیوەی كە دەكاتە سێ (٣) بۆ كچەكە، و شەش یەكی كە دەكاتە یەك (١) بۆ دایكەكە، و دووی (٢) دەمێنێتەوە، ئێستا ئەگەر سەیر بكەین دەبینین كە كچەكە سێ ئەوەندە و سێ بەرامبەری دایكەكەی بردوە، بۆیە دەڵێین: لەو دوو بەشەی كە ماوەتەوە سێ بەرامبەری دایكەكە دەبات، ئێستا دەكرێت ئەو دوو (٢) بەشەی كە ماوەتەوە بیكەین بە چوار (٤) بەشەوە (واتە چوار نیوە )، وە دەشكرێت كە دوەكە لێكدانی دوو بكەین تاوەكو ببێتە چوار بەش (و دابەش كردنەكە نیوەی تێ نەكەوێت، و ئاسان تر بێت )، جا لێرەدا دایكەكە یان لە دوو بەشەكە (نیوەی بەشێكی ) دەكەوێت، یان لە چوار بەشەكە یەك بەشی دەكەوێت، كەواتە ئێستا ئەصڵی مەسئەلەكە كە شەشە (٦) لێكدانی دووی (٢) دەكەین، و دەكاتە دوازدە (١٢)، ئەوجار سەر لە نوێ دابەشی دەكەینەوە:

كچەكە نیوەی (١٢) دەبات كە دەكاتە (٦)، و دایكەكە شەش یەك دەبات كە دەكاتە (٢)، و (٦+٢ )دەكاتە (٨)، لە (١٢) ەكە (٤) دەمێنێتەوە، لەم چوارەش (٣) بۆ كچەكە، و (١) بۆ دایكەكە، كەواتە سەر جەم بەشی كچەكە بوو

بە (٦+٣) کە دەکاتە (٩)، و سەرجەم بەشـی دایکەکـەش بـوو بـە (٢+١) کـە دەکاتە (٣).

| | | | | |
|---|---|---|---|---|
| ئەصڵی مەسئەلە | | ٦ ← × ٢ | ١٢ | ١٢ |
| یەك كچ | نیوە | ٣ | ٦ ← + ٣ | ٩ |
| دایك | شەش یەك | ١ | ٢ ← + ١ | ٣ |
| پاشماوە | | ٢ | ٤ | ٠ |

بەڵاَم لەم کاتەشدا دەتوانین کە ژمارەکان زیاتر بـچووك بکەینـەوە و بەمـەش ئەصڵی مەسئەلەکە کەمتر دەبێتەوە بەم شێوەیە: وەك وتـان: کـچەکە لـە (١٢) بەش (٩) بەش دەبات، و دایکەکەش (٣) بەش دەبات، جا ئێـستا دەکرێـت کـە هەر سێ ژمارەکە (١٢، ٩، ٣ ) دابەشی (٣) ی بکەین، ئەو کاتـە مەسـئەلەکە بەم شێوەیەی لێ دێت: ئەصڵی مەسئەلە (٣/١٢) دەبێتە (٤)، و بەشـی کـچەکە (٣/٩) دەبێتە (٣)، و بەشی دایکەکە (٣/٣) دەبێتە (١)، و بـە کـۆ کردنـەوەی بەشەکان کە (٣ + ١) دەبێتە (٤) کە ئەصڵی مەسئەلەکەیە بە کورت کراوەیی.

| | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| ئەصڵی مەسئەلە | | ٦ ← × ٢ | ١٢ | ١٢ | ÷ ٣ | ٤ |
| یەك كچ | نیوە | ٣ | ٦ ← + ٣ | ٩ | | ٣ |
| دایك | شەش یەك | ١ | ٢ ← + ١ | ٣ | | ١ |
| پاشماوە | | ٢ | ٤ | ٠ | | |

(تێبینی ) ئەم شێوەیە بۆ کاتێکە کە نیوە بە هەند وەربگیرێت.

## نمونەی دوەم:

مێردی تێدایە بەلاّم لە گەڕانـەوەی مالّـە زیادەکـەدا بەشـداری ناکـات وەك: ژنێك مردوە: کچێك، و دایك، و مێرد ی لە پاش بەجێ ماوە.

کچەکە (نیوە ) دەبات، و دایکەکە (شەش یەك ) دەبات، و مێردەکە (چـوار یەك ) دەبات. ئەصڵی مەسئەلەکە (١٢) یە، کە لە ئەنجامی (٣ × ٤) یان (٢ × ٦) درووست دەبێت.

ئێستا کچەکە نیوە دەبات کە دەکاتە (٦)، و دایکەکە شەش یەك دەبات کـە دەکاتە (٢)، و مێردەکە چوار یەك دەبات کـە دەکاتـە (٣)، و بـە کۆکردنـەوەی (٦+٢+٣) دەکاتە (١١) و (١) دەمێنێتەوە.

جا لێرەدا لەبەر ئـەوەی کـە کـچەکە (٦) ی بـردوە، و دایکەکـەیش (٢) ی بردوە، دەڵێین: کچەکە سێ بەرامبەری دایکەکەی بردوە، بۆیـە دەبێـت لـەو یـەك (١) بەشەی کە ماوە بە هەمان شێوە سێ بەرامبـەری دایکەکـە ببـات، کەواتـە ئەگەر یەکەکە بکـەین بـە چـوار (٤) بەشـەوە (چـارەکەوە)، ئـەوا کـچەکە (٣) چارەکی دەبات، و دایکەکـەش (١) چـارەك دەبـات، ئـەوجا لەبـەر ئـەوەی کـە ڕزگارمان بێت لە دەست ئەم چارەکانە، دێین یەك بەشەکەی کە ماوەتەوە لێکدانی چواری دەکەین، بەم پێیە دەبێت ئەصڵی مەسئەلەکەش لێکدانی چوار بکـەین، و لە کۆتاییدا مەسئەلەکە بەم شێوەیەی لێ دێت:

ئەصڵی مەسئەلە: (١٢ × ٤) دەکاتە (٤٨)، بەشی کچەکە (٦ × ٤) دەکاتە (٢٤)، بەشی دایکەکە (٢ × ٤) دەکاتە (٨)، مێردەکە (٣ × ٤) دەکاتە (١٢).

ئێـستا بـە کۆکردنـەوەی (٢٤ + ٨ + ١٢) دەکاتـە (٤٤)، بەمـەش (٤) بـەش دەمێنێتەوە، جا وەك وتمان تەنها ڕەدی دەکەینەوە بۆ کچ، و دایکەکە، و مێردەکە لەم زیادەیە بێ بەش دەبێت، جا ئێستا کـچەکە لـەم زیادەیـە کـە(٤) ە، (٣) ی دەکەوێت، و دایکەکەش (١) ی دەکەوێت، بەمەش بەشی کچەکە زیاد دەبێت لـە

(٢٤) بۆ (٢٧)، و بەشـی دایكەكـەش زیـاد دەبێـت لـە (٨) بـۆ (٩)، و بەشـی مێردەكەش وەك خۆی دەمێنێتەوە و زیاد ناكات، و لە كۆتاییدا مەسئەلەكە بـەم شێوەیە دابەش دەكرێت: ئەصـڵی مەسـئەلە: (٤٨)، كـچەكە: (٢٧)، دایكەكـە: (٩)، مێردەكــــە: (١٢)، (٢٧ + ٩ + ١٢) دەكاتــــە (٤٨) كــــە ئەصــــڵی مەسئەلەكەیە.

| ئەصڵی مەسئەلە | | ١٢ ← × ٤ | ٤٨ | ٤٨ |
|---|---|---|---|---|
| یەك كچ | نیوە | ٦ | ٢٤ + ٣ | ٢٧ |
| دایك | شەش یەك | ٢ | ٨ + ١ | ٩ |
| مێرد | چواریەك | ٣ | ١٢ | ١٢ |
| پاشماوە | | ١ | ٤ | ٠ |

جا ئێستا دەكرێت بە شـێوەیەكی كـورت كراوەیـی مەسـئەلەكە دروسـت، و دابەش بكەین، ئەویش بەوەی كە: هـەم ئەصـڵی مەسـئەلەكە، و هـەم بەشـەكان دابەشی (٣) بكەین، ئەو كاتە مەسئەلەكە ، و بەشەكان بەم شـێوەیەی لێ دێـت: ئەصڵی مەسئەلە (٤٨ / ٣) دەكاتـە (١٦)، بەشـی كـچەكە (٢٧ / ٣) دەكاتـە (٩)، بەشی دایكەكە (٩ / ٣) دەكاتە (٣)، بەشی مێردەكـە (١٢ / ٣) دەكاتـە (٤)، و بە كۆكردنەوەی بەشەكان كـە (٩ + ٣ + ٤) دەكاتـە (١٦) كـە ئەصـڵی مەسئەلەكەیە بە كورت كراوەیی.

| ئەصڵی مەسئەلە | | ١٢ ←×٤ | ٤٨ | ٤٨ | ÷٣ | ١٦ |
|---|---|---|---|---|---|---|
| یەك كچ | نیوە | ٦ | ٢٤ + ٣ | ٢٧ | | ٩ |
| دایك | شەش یەك | ٢ | ٨ + ١ | ٩ | | ٣ |
| مێرد | چواریەك | ٣ | ١٢ | ١٢ | | ٤ |
| پاشماوە | | ١ | ٤ | ٠ | | |

نمونەی سێ یەم:

ژنی تێدایە بەڵاّم لە گەڕانەوەی ماڵە زیادەكەدا بەشداری ناكات وەك: پیاوێك مرد: كچێك، و دایك، و ژنێك ی لە پاش بەجێ ما.

كچەكە (نیوە ) دەبات، و دایكەكە (شەش یەك ) دەبات، و ژنەكە (هەشت یەك ) دەبات. ئەصڵی مەسئەلەكە (٢٤) ە، كە لە ئەنجامی (٣ × ٨) یان (٤×٦) درووست دەبێت.

ئێستا كچەكە نیوە دەبات كە دەكاتە (١٢)، و دایكەكە شەش یەك دەبات كە دەكاتە (٤)، و ژنەكە هەشت یەك دەبات كە دەكاتە (٣)، و بە كۆكردنەوەی (١٢ + ٤ + ٣) دەكاتە (١٩)، و (٥) دەمێنێتەوە.

جا لێرەدا لەبەر ئەوەی كە كچەكە (١٢) ی بردوە، و دایكەكەش (٤) ی بردوە، دەڵێین كە كچەكە سێ بەرامبەری دایكەكەی بردوە، بۆیە دەبێت لەو (٥) بەشەی كە ماوەتەوە بە هەمان شێوە سێ بەرامبەری دایكەكە ببات، كەواتە ئەگەر پێنجەكە بكەین بە چوار (٤) بەشەوە، ئەوا كچەكە (٣) بەشی دەبات، و دایكەكەش (١) بەش دەبات، بەڵاّم لەبەر ئەوەی كە پێنج، و چوار (تباین) هەیە لە نێوانیان دا، دێین ئەصڵی مەسئەلەكە لێكدانی چوار دەكەین، و لە كۆتاییدا مەسئەلەكە بەم شێوەیەی لێ دێت:

ئەصڵی مەسئەلە: (٢٤ × ٤) دەكاتە (٩٦)، بەمەش بەشی كچەكە كە نیوەیە دەكاتە (٤٨)، و بەشی دایكەكە كە شەش یەكە دەكاتە (١٦)، و بەشی ژنەكە كە هەشت یەكە دەكاتە (١٢). ئێستا بە كۆكردنەوەی (٤٨ + ١٦ + ١٢) دەكاتە (٧٦)، بەمەش (٢٠) بەش دەمێنێتەوە، جا وەك وتمان تەنها ڕەدی دەكەینەوە بۆ كچ، و دایكەكە، و ژنەكە لەم زیادەیە بێ بەش دەبێت، جا ئێستا كچەكە لەم زیادەیە كە(٢٠) بەشە، (١٥) ی دەكەوێت، و دایكەكەش (٥) ی دەكەوێت، بەمەش بەشی كچەكە زیاد دەبێت لە (٤٨) ەوە بۆ (٦٣)، و بەشی

دایكەكەش زیاد دەبێت لە (١٦) ەوە بۆ (٢١)، و بەشی ژنەكەش وەك خۆی دەمێنێتەوە و زیاد ناكات، و لە كۆتاییدا مەسئەلەكە بەم شێوەیە دابەش دەكرێت: ئەصڵی مەسئەلە: (٩٦)، كچەكە: (٦٣)، دایكەكە: (٢١)، ژنەكە: (١٢)، و (٦٣ + ٢١ + ١٢) دەكاتە (٩٦) كە ئەصڵی مەسئەلەكەیە.

| ئەصڵی مەسئەلە | | ٢٤ ←×٤ | ٩٦ | ٩٦ |
|---|---|---|---|---|
| یەك كچ | نیوە | ١٢ | ٤٨ + ١٥ | ٦٣ |
| دایك | شەش یەك | ٤ | ١٦ + ٥ | ٢١ |
| ژن | هەشت یەك | ٣ | ١٢ | ١٢ |
| پاشماوە | | ٥ | ٢٠ | ٠ |

جا ئێستا دەكرێت بە شێوەیەكی كورت كراوەیی مەسئەلەكە دروست، و دابەش بكەین، ئەویش بەوەی كە: هەم ئەصڵی مەسئەلەكە، و هەم بەشەكان دابەشی (٣) بكەین، ئەو كاتە مەسئەلەكە ، و بەشەكان بەم شێوەیەی لیَ دێت: ئەصڵی مەسئەلە (٩٦ / ٣) دەكاتە (٣٢)، و بەشی كچەكە (٦٣ / ٣) دەكاتە (٢١)، و بەشی دایكەكە (٢١ / ٣) دەكاتە (٧)، و بەشی ژنەكە (١٢ / ٣) دەكاتە (٤)، و بە كۆكردنەوەی بەشەكان كە (٢١ + ٧ + ٤) دەكاتە (٣٢) كە ئەصڵی مەسئەلەكەیە بە كورت كراوەیی.

| ئەصڵی مەسئەلە | | ٢٤ ←×٤ | ٩٦ | ٩٦ | ٣÷ | ٣٢ |
|---|---|---|---|---|---|---|
| یەك كچ | نیوە | ١٢ | ٤٨ + ١٥ | ٦٣ | | ٢١ |
| دایك | شەش یەك | ٤ | ١٦ + ٥ | ٢١ | | ٧ |
| ژن | هەشت یەك | ٣ | ١٢ | ١٢ | | ٤ |
| پاشماوە | | ٥ | ٢٠ | ٠ | | |

## ئاگاداری:

ئەم ڕێگەیە نارەحەتی زۆری تێدایە، بە هۆی ئەوەی كە مەسئەلەكان زۆر درێژ دەبنەوە. بۆیە زانایان ڕێگەیان داوە كە ڕێگەی دوەم بەكار بهێنرێت، لەبەر كورتی، و ئاسانی، و مەبەستیش لە هەر یەك لەم دوو ڕێگەیە دابەش كردنی پاشماوەی میراتەكەیە بە سەر خاوەن بەشەكان دا، جا كەوابوو، كام ڕێگەیان ئاسان تر، و كورت تر بێت، ئەوەیان بەكار بهێنرێت باشترە.

## ڕێگەی دوەم: بە كورتی (مُجمل)

مەسئەلەی چۆنێتی گەڕاندنەوەی پاشماوەی بەشی خاوەن بەشەكان لە میراتەكە بە سەریان دا، بە كورتی چوار شێوەی هەیە، چونكە ئەو خاوەن بەشانەی كە لە مەسئەلەیەك دا هەن، و دروستە پاشماوەكەیان بۆ بگەڕێنرێتەوە، یان یەك جۆرن، واتە: بە یەك شێوە میرات دەبەن، یان لە یەك جۆر زیاترن، واتە: بە چەند شێوەیەك میرات دەبەن، ئەوجا بە گوێرەی هەر یەك لەم دوو شێوەیە، مەسئەلەكە یان هیچ كام لە ژن و مێردی تێدا نیە، یان یەكێكیانی تێدایە، بەمەش شێوەكان بوون بە چوار [1]:

(١) خاوەن بەشەكان: یەك جۆر بن، و مەسئەلەكەش ژن و مێردی تێدا نەبێت.

(٢) خاوەن بەشەكان: یەك جۆر زیاتر بن، ومەسئەلەكەش ژن و مێردی تێدا نەبێت.

(٣) خاوەن بەشەكان: یەك جۆر بن، و مەسئەلەكەش ژن یان مێردی تێدا بێت.

---

١) الأنوار ٩، الفقه الإسلامي ٧٨٢٨ – ٧٨٣٢، المفصل ١١ / ٣٣٤ – ٣٣٥، الفقه المنهجي ٢ / ٣٦٩ – ٣٧٦، ڕوونكردنەوەی (قطر العارض)١٠٥ – ١١٢، شەریعەتی ئیسلام ٩٤–٩٧.

(٤) خاوەن بەشەکان: یەك جۆر زیاتر بن، و مەسئەلەکەش ژن یان مێردی تێدا بێت.

## شێوەی یەکەم

## خاوەن بەشەکان یەك جۆر بن، و مەسئەلەکەش ژن و مێردی تێدا نەبێت

لەم شێوەدا ئەصڵی مەسئەلەکە بریتیە لە: ژمارەی میرات بەرەکان. بۆ نمونە: ئەگەر کەسێك بمرێت: یەك کچ، یان یەك خوشك، یان یەك داپیرە، یان یەك برای دایکی هەبێت، ئەوا ئەصلی مەسئەلەکە لە هەر چوارحاڵەتەکە دا بریتیە لە: یەك (١). هەروەها ئەگەر کەسێك بمرێت: دوو کچ، یان دوو خوشك، یان دوو برای دایکی، یان دوو خوشکی دایکی، یان دوو نەنکی هەبێت، ئەوا ئەصلی مەسئەلەکە لە هەر پێنج حاڵەتەکە دا بریتیە لە: دوو (٢).

## شێوەی دوەم

## خاوەن بەشەکان یەك جۆر زیاتر بن و مەسئەلەکەش ژن و مێردی تێدا نەبێت

لەم شێوەیە دا ئەصڵی مەسئەلەکە بریتیە لە: کۆی ژمارەی بەشە میراتەکەیان، کە لە لێ دەرچووی (مخرج) بەشەکان وەردەگیرێت، ئەگەر لە مەسئەلەکە دا گەڕاندنەوە نەبووایە. واتە: لەو ئەصڵی مەسئەلەیەی کە سەرەتا درووست دەکرێت بۆ مەسئەلەکە، هەموو میرات بەرەکان چەند بەشیان برد، ئەوە بە کورتی دەبێت بە ئەصڵی مەسئەلەکە.

نمونەی یەکەم:

ئەگەر کەسێك بمرێت: نەنك، و خوشکێکی باوکی هەبێت، ئەوا: نەنکەکە شەش یەك دەبات، و خوشکەکەش نیوە دەبات، کەواتە ئەصڵی مەسئەلەکەیان بریتیە لە شەش (٦)، ئێستا نەنکەکە یەك (١) بەش دەبات، و خوشکەکەش سێ (٣) بەش دەبات. بەڵام لە برێتی ئەوەی کە بڵێین: میراتەکە دوو (٢) بەشی ماوەتەوە، و دەیگەڕێنینەوە بۆ نەنك، و خوشکەکە، هەر کەسەو بەگوێرەی بەشەکەی خۆی، و مەسئەلەکە درێژ ببێتەوە، دێین دەڵێین: نەنکەکە لە شەش بەش یەك (١) بەشی بردوە، و خوشکەکەش سێ (٣) بەشی بردوە، کەواتە ئەصڵی مەسئەلەکە بە کورتی دەکەین بە چوار (٤)، کە بریتیە لە: کۆی بەشی نەنکەکە، و بەشی خوشکەکە، کە لە ئەصڵی مەسئەلەی یەکەم دەیان برد.

| ئەصڵی مەسئەلە | | ٦ | ٤ ← |
|---|---|---|---|
| نەنك | شەش یەك | ١ | ١ |
| یەك خوشکی باوکی | نیوە | ٣ | ٣ |
| پاشماوە | | ٢ | ٠ |

نمونەی دوەم:

کەسێك مردوە: نەنکێك، و برایەکی دایکی لە پاش بەجێ ماوە. ئێستا هەر یەکە لە نەنکەکە، و برا دایکیەکە شەش یەك دەبەن، کەواتە ئەصڵی مەسئەلەکە بریتیەلە: شەش (٦)، نەنکەکە یەك (١) بەش دەبات، و براکەش یەك (١) بەش دەبات، بەمەش ئەصڵی مەسئەلەکە بە کورتی دەبێتە دوو (٢) کە بریتیە لە کۆی بەشی نەنکەکە، و بەشی براکە.

| ئەصڵی مەسئەلە | | ٦ | ٢ ← |
|---|---|---|---|
| نەنك | شەش یەك | ١ | ١ |
| یەك برای دایكی | شەش یەك | ١ | ١ |
| پاشماوە | | ٤ | ٠ |

## نمونەی سێیەم:

کەسێك مردوە: دایك، و خوشكێكی دایكی لە پاش بەجێ ماوە. دایكەكە سێ یەك دەبات، و خوشكەكەش شەش یەك دەبات، و ئەصڵی مەسئەلەكەش بریتیە لە شەش (٦)، دایكەكە دوو (٢) بەش دەبات، و خوشكەكەش یەك (١) بەش دەبات، بەمەش ئەصڵی مەسئەلەكە بە کورتی دەبێتە سێ (٣) كە بریتیە لە كۆی بەشی دایكەكە، و بەشی خوشكەكە.

| ئەصڵی مەسئەلە | | ٦ | ٣ ← |
|---|---|---|---|
| دایك | سێیەك | ٢ | ٢ |
| یەك خوشكی دایكی | شەش یەك | ١ | ١ |
| پاشماوە | | ٣ | ٠ |

## نمونەی چوارەم:

کەسێك مردوە: دایك، و كچێك، و كچی كوڕێكی لە پاش بەجێ ماوە. دایكەكە، و كچی كوڕەكە هەردووكیان یەكی شەش یەك دەبەن، و كچەكەش نیوە دەبات، و ئەصڵی مەسئەلەكەش بریتیە لە شەش (٦). دایكەكە یەك (١) بەش دەبات، و كچی كوڕەكەش یەك (١) بەش دەبات، و كچەكەش سێ (٣) بەش دەبات، بەمەش ئەصڵی مەسئەلەكە بە کورتی دەبێتە پێنج (٥)، كە بریتیە لە كۆی هەر سێ بەشی دایكەكە، و كچی كوڕەكە، و كچەكە.

| | | | |
|---|---|---|---|
| ئەصڵی مەسئەلە | | ٦ | ٥ ← |
| دایك | شەش یەك | ١ | ١ |
| یەك کچ | نیوە | ٣ | ٣ |
| یەك کچی کوڕ | شەش یەك | ١ | ١ |
| پاشماوە | | ١ | ٠ |

## شێوەی سێ یەم
## خاوەن بەشەکان یەك جۆر بن و
## مەسئەلەکەش ژن، یان مێردی تێدا بێت

لەم شێوەیە دا سەرەتا بەشی ژنەکە، یان بەشی مێردەکە، لە لێ دەرچووی (مخرج) بەشەکەی خۆیان دەیاندرێتێ، کە ژنەکە یان چوار یەك دەبات، یان هەشت یەك، و مێردەکەش یان نیوە دەبات، یان چوار یەك، ئەوجا پاشماوەکەش دەدرێت بە ئەو کەسانەی کە مافی گەڕاندنەوەی میراتە زیادەکەیان هەیە. پاشان تەماشا دەکەین:

(١) ئەگەر پاشماوەکە بە ساغی دابەش دەبوو بە سەر ژمارەی خاوەن بەشەکاندا، ئەوا ئەصڵی مەسئەلەکە هەر بریتیە لە لێ دەرچووی (مخرج) بەشی ژنەکە، یان مێردەکە.

نمونەی یەکەم:

ئەگەر پیاوێك بمرێت: ژنێك، و حەوت کچی لە پاش بەجێ بمێنێت، ئەوا ژنەکە هەشت یەك دەبات، و ئەصڵی مەسئەلەکەش بریتیە لە هەشت (٨)، یەك (١) بەشی ژنەکە دەیبات، و حەوت (٧) بەشەکەشی کە دەمێنێتەوە بە ساغی دابەش دەکرێت بە سەر حەوت کچەکە دا.

| | | |
|---|---|---|
| ئەصڵی مەسئەلە | | ٨ |
| یەك ژن | هەشت یەك | ١ |
| حەوت کچ | | ٧ |

نمونەی دوەم:

ئەگەر ژنێك بمرێت: مێرد، و سێ کچی لە پاش بەجێ بمێنێت، ئەوا مێردەکە چوار یەك دەبات، و ئەصڵی مەسئەلەکەش بریتیە لە چوار (٤)، یەك (١) بەشی مێردەکە دەیبات، و سێ (٣) بەشەکەشی کە دەمێنێتەوە بە ساغی دابەش دەکرێت بەسەر سێ کچەکە دا.

(٢) ئەگەر پاشماوەکە بە ساغی دابەش نەدەبوو بە سەر ژمارەی خاوەن بەشەکان دا، ئەو کاتە دوو حاڵەتمان هەیە:

أ. لە نێوان پاشماوەکە، و ژمارەی سەری خاوەن بەشەکان دا (توافق) هەیە، لەم کاتە دا (وفق) ی ژمارەی سەری خاوەن بەشەکان لێك دەدرێت لەگەڵ (مخرج) ی بەشی ژنەکە، یان مێردەکە.

ب.لە نێوان پاشماوەکە، و ژمارەی سەری خاوەن بەشەکان دا (تباین) هەیە، لەم کاتە دا، تەواوی ژمارەی سەری خاوەن بەشەکان لێك دەدرێت لەگەڵ (مخرج) ی بەشی ژنەکە، یان مێردەکە.

نمونەی حاڵەتی یەکەم:

ئەگەر ژنێك بمرێت: مێرد، و شەش کچی لەپاش بەجێ بمێنێت، ئەوا مێردەکە چوار یەك دەبات، و ئەصڵی مەسئەلەکەش بریتیە لە: چوار (٤)، یەك (١) بەشی مێردەکە دەیبات، و سێ (٣) بەشەکەشی دەمێنێتەوە بۆ شەش (٦) کچەکە. جا

ئێستا لەبەر ئەوەی کە سێ بە ساغی بەسەر شەش دا دابەش نابێت، و لە هەمان کاتیش دا (توافق) هەیە لە نێوانیان دا، بۆیە (وفق)ی نێوان شەش (٦)، و سێ (٣) کە دووە (٢)، لێکدانی (مخرج)ی بەشی مێردەکەی دەکەین کە چوارە (٤)، و بەمەش ئەصڵی مەسئەلەکە دەبێت بە هەشت (٨)، ئێستا لەم هەشتە، دوو (٢) بەشی بۆ مێردەکە، و شەش (٦) بەشەکەشی کە دەمێنێتەوە بۆ شەش کچەکە.

| | | | |
|---|---|---|---|
| ئەصڵی مەسئەلە | | ٤ ⟵ × ٢ | ٨ |
| مێرد | چواریەك | ١ | ٢ |
| شەش کچ | | ٣ | ٦ |

نمونەی حاڵەتی دووەم:

ئەگەر ژنێك بمرێت: مێرد، و پێنج کچی لە پاش بەجێ بمێنێت، ئەوا مێردەکە چوار یەك دەبات، و ئەصڵی مەسئەلەکەش بریتیە لە: چوار (٤)، یەك (١) بەشی مێردەکە دەیبات، و سێ (٣) بەشەکەشی دەمێنێتەوە بۆ پێنج (٥) کچەکە. جا ئێستا لەبەر ئەوەی کە سێ بە ساغی بە سەر پێنج دا دابەش نابێت، و لە هەمان کاتیش دا (تباین) هەیە لە نێوانیان دا، بۆیە ژمارەی پێنج کچەکە لێك دەدرێت لەگەڵ (مخرج) ی بەشی مێردەکە کە چوارە (٤)، بەمەش ئەصڵی مەسئەلەکە دەبێت بە: بیست (٢٠)، ئێستا لەم بیستە، پێنج (٥) بەشی بۆ مێردەکە، و پازدە (١٥) بەشەکەشی کە دەمێنێتەوە بۆ پێنج کچەکە، هەر یەکەو سێ (٣) بەش دەبات.

# شێوەی چوارەم
# خاوەن بەشەکان یەك جۆر زیاتر بن و مەسئەلەکەش ژن، یان مێردی تێدا بێت

لەم شێوەیەشدا وەك شێوەی پێشوو، سەرەتا بەشی ژنەکە، یان بەشی مێردەکە، لە لێ دەرچووی (مخرج) بەشەکەی خۆیان دەیاندرێتێ، کە ژنەکە یان چوار یەك دەبات، یان هەشت یەك، و مێردەکەش یان نیوە دەبات، یان چوار یەك، ئەوجا پاشماوەکەش دەدرێت بە ئەو کەسانەی کە مافی گەڕاندنەوەی میراتە زیادەکەیان هەیە. پاشان تەماشا دەکەین:

(١) ئەگەر پاشماوەکە بە ساغی دابەش دەکرا بە سەر کۆی بەشە میراتی خاوەن بەشەکاندا، واتە: ئەو بەشە میراتانەی کە لە شێوەی دوەم دا دەکران بە ئەصڵی مەسئەلەکە، ئەوا ئەصڵی مەسئەلەکە هەر بریتیە لە لێ دەرچووی (مخرج) بەشی ژنەکە، یان مێردەکە.

بۆ نموونە:

ئەگەر پیاوێك بمرێت: ژنێك، و چوار نەنك، و شەش خوشکی دایکی لە پاش بەجێ بهێنێت. ئەوا ژنەکە چوار یەك دەبات، و ئەصڵی مەسئەلەکەش بریتیە لە چوار (٤)، یەك (١) بەشی مێردەکە دەیبات، سێ (٣) بەشەکەشی کە دەمێنێتەوە، بە ساغی دابەش دەبێت بەسەر کۆی بەشی نەنکەکان، و خوشکەکان دا، چونکە، وەك لە شێوەی دوەم دا باسمان کرد: نەنکەکان شەش یەك دەبەن، و خوشکەکانیش سێ یەك دەبەن، کەواتە: نەنکەکان یەك (١) بەش دەبەن، و خوشکەکانیش دوو (٢) بەش دەبەن، بەمەش بەشی هەردوو لایان بوو بە سێ (٣) بەش، کەواتە: ئەو سێ بەشەی کە لە ئەصڵی مەسئەلەی یەکەم مایەوە بە ساغی دابەش دەبێت بە سەر کۆی بەشی نەنکەکان، و خوشکەکان دا.

بەلاّم ئێستا دەبینین کە نە بەشی نەنکەکان کە یەك (١) بەشە بەساغی دابەش دەبێت بەسەر ژمارەی نەنکەکان دا کە چوارە (٤)، و نە بەشی خوشکەکان کە دوو (٢) بەشە بەساغی داباش دەبێت بەسەر ژمارەی خوشکەکان دا کە شەشە (٦)، بۆیە دەبێت دوبارە مەسئەلەکە ساغ بکرێتەوە، کە لە چل و هەشت (٤٨) ساغ دەبێتەوە، چونکە: وەك وتمان: ئەصڵی مەسئەلەکە چوار (٤)ە، و لەنێوان بەشی نەنکەکان، و ژمارەی نەنکەکان دا (تباین) هەیە، بۆیە ژمارەی نەنکەکان وەردەگرین، کە چوارە (٤)، و لە نێوان بەشی خوشکەکان، و ژمارەی خوشکەکان دا (توافقی نیوەیی) هەیە، بۆیە ژمارەکەی ئەوان دەبێت بە: سێ (٣)، ئەوجا ئێستا: (٤ × ٤ × ٣) یەکسانە بە چل و هەشت (٤٨)، ئەوجا ئێستا لەم چل و هەشتە (٤٨)، ژنەکە چوار یەك دەبات، کە دەکاتە دوازدە (١٢)، و سی و شەش (٣٦) بەشیش دەمێنێتەوە، و نەنکەکان سێ یەکی — ئەم سی و شەشە -- دەبەن، کە دەکاتە دوازدە (١٢)، و خوشکەکانیش دوو سێ یەکی دەبەن کە دەکاتە بیست و چوار (٢٤)، ئێستا بەشی نەنکەکان کە دوازدە (١٢) یە، دابەش دەبێت بەسەر ژمارەکەیان دا کە چوار (٤)ە، و بەمەش هەر نەنکێك سێ (٣) بەش دەبات، وە هەروەها بەشی خوشکەکانیش کە بیست و چوار (٢٤)ە، دابەش دەبێت بە سەر ژمارەکەیان دا کە شەش (٦)ە، و بەمەش هەر خوشکێك چوار (٤) بەش دەبات.

| | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|
| ئەصڵی مەسئەلە | | ٤ | | ٤ ← × ١٢ | ٤٨ |
| یەك ژن | چواریەك | ١ | | ١ | ١٢ |
| چوار نەنك | | ٣ | ئەصڵی مەسئەلە | ٦ | |
| | | | شەش یەك | ١ | ١٢ |
| شەش خوشکی دایکی | | | سێیەك | ٢ | ٢٤ |

(٢) ئەگەر پاشماوەکە بە ساغی دابەش نەدەکرا بە سەر کۆی بەشە میراتی خاوەن بەشەکاندا، ئەو کاتە: کۆی بەشە میراتەکانی ئەو خاوەن بەشانەی کە مافی گەڕاندنەوەی میراتەکەیان هەیە، لێك دەدرێت لەگەڵ (مخرج) ی بەشی ژنەکە، یان مێردەکە، ئەوجا کردیە چەند، ئەو ژمارەیە دەبێتە ئەصڵی مەسئەلەکە.

بۆ نموونە:

ئەگەر پیاوێك بمرێت: چوار ژن، و نۆ کچ، و شەش نەنکی لە پاش بەجێ بمێنێت. ئەوا: ژنەکان هەشت یەك دەبەن، و ئەصڵی مەسئەلەکەش بریتیە لە هەشت (٨)، کەواتە: ژنەکان یەك (١) بەش دەبەن، و حەوت (٧) بەشەکەشی کە دەمێنێتەوە دابەش نابێت بە سەر کۆی بەشە میراتی نەنکەکان، و کچەکان دا، چونکە، نەنکەکان شەش یەك دەبەن، و کچەکانیش دوو سێ یەك دەبەن، بەمەش بەشی نەنکەکان دەکاتە یەك (١) بەش، و بەشی کچەکانیش دەکاتە چوار (٤) بەش، و کۆی هەردوو بەشەکە دەکاتە پێنج (٥) بەش. جا وەك دەبینین: حەوت (٧) بەشەکەی کە ماوەتەوە بە ساغی دابەش ناکرێت بە سەر کۆی بەشی نەنکەکان، و کچەکان دا، و لە هەمان کاتیش دا (تباین) هەیە لە نێوانیان دا، کەواتە: ئەو پێنجەی کە بریتیە لە کۆی بەشی نەنکەکان، و کچەکان، لێکی دەدەین لەگەڵ (مخرج)ی بەشی ژنەکە، کە هەشتە (٨)، بەمەش ئەصڵی مەسئەلەکە دەبێت بە: چل (٤٠)، جا ئێستا دووبارە دەڵێین: چوار ژنەکە هەشت یەك دەبەن، کە دەکاتە پێنج (٥) بەش، و سی و پێنج (٣٥) بەشیش دەمێنێتەوە، دەیکەین بە پێنج (٥) بەشەوە، نەنکەکان یەك (١) بەش دەبەن، کە دەکاتە حەوت (٧)، و کچەکانیش چوار (٤) بەش دەبەن، کە دەکاتە بیست و هەشت (٢٨).

تا ئێستا وەك دیاری کردن، بەشی هەموو ژنەکان، و بەشی هەموو کچەکان، و بەشی هەموو نەنکەکانمان دیاری کردوە، بەلاّم وەك دەبینین: بەشی هیچ کۆمەلێکیان دابەش ناکرێت بە سەر ژمارەی ئەندامانی کۆمەلەکە خۆیدا، چونکە چوار ژنەکە پێنج (٥) بەش دەبەن، و نۆ کچەکەش بیست و هەشت (٢٨) بەش دەبەن، و شەش نەنکەکەش حەوت (٧) بەش دەبەن، بۆیە جارێکی تر مەسئەلەکە پێویستی بە ساغ کردنەوە هەیە.

جا وەك دەبینین: لە نێوان هەر کۆمەلێك، و ئەو بەشەی کە دەیکەوێت (تباین) هەیە "(٤ و ٥)، (٩ و ٢٨)، (٦ و ٧)". بۆیە دێین: سەیری ژمارەی سەری هەر سێ کۆمەلەکە دەکەین، کە (٤ و ٦ و ٩) یە، وەك دەبینین: (توافقی نیوەیی) هەیە لە نێوان (٤ و ٦) دا، بۆیە: یان نیوەی چوارەکە (٤) کە دووە (٢) لێکی دەدەین لەگەلّ شەشە (٦) کە دا، کە دەکاتە دوازدە (١٢)، و یان نیوەی شەشەکە (٦) کە سێ (٣) یە لێکی دەدەین لەگەلّ چوارە (٤) کە دا، کە دووبارە دەکاتەوە دوازدە (١٢).

ئەوجا بە هەمان شێوە (توافقی سێیەکی) هەیە لە نێوان دوازدە (١٢)، و نۆ (٩) کە دا، بۆیە: یان سێ یەکی دوازدە (١٢)، کە چوارە (٤)، لێکی دەدەین لەگەلّ نۆ (٩) کە دا، کە دەکاتە سی و شەش(٣٦)، و یان سێ یەکی نۆ (٩) کە، کە سێ (٣) یە، لێکی دەدەین لەگەلّ دوازدە (١٢) کە دا، کە دووبارە دەکاتەوە سی و شەش (٣٦).

ئەوجا ئەم سی و شەشە (٣٦) لێك دەدەین لەگەلّ ئەصلّی مەسئەلەکەدا، کە چل (٤٠) بوو، بەمەش: ئەصلّی مەسئەلەکە دەبێت بە (١٤٤٠ )، جا وەك باسمان کرد: ژنەکان پێنج (٥) بەش دەبەن. ئێشتا ئەم پێنجە لێکدان دەکەین لەگەلّ سی و شەش (٣٦) دا، کە دەکاتە: (١٨٠)، و کچەکانیش بیست و هەشت (٢٨) بەش دەبەن، و لێکدانی سی و شەش (٣٦) ی دەکەین، کە دەکاتە: (١٠٠٨)، و

نەنکەکانیش حەوت (٧) بەش دەبەن، و لێکدانی سی وشەش (٣٦) ی دەکەین، کە دەکاتە: (٢٥٢).

جائێستا ئەگەر بمانەوێت، بەشی هەر کۆمەڵێك دابەش بکەین بەسەر ژمارەی ئەندامی کۆمەڵەکە دا، ئەو کاتە بەم شێوەیەی لیٚ دێت:

چوار ژنەکە (١٨٠ ÷ ٤) کە بەشی هەر یەکەیان دەکاتە: (٤٥).

نۆ کچەکە (١٠٠٨ ÷ ٩) کە بەشی هەر یەکەیان دەکاتە: (١١٢).

شەش نەنکەکە (٢٥٢ ÷ ٦) کە بەشی هەر یەکەیان دەکاتە: (٤٢).

| | | | | | | | | |
|---|---|---|---|---|---|---|---|---|
| ئەصڵی مەسئەلە | | ٨ | | | ٨ ← <br> ٥ × | ٤٠ ← × <br> ٣٦ | | ١٤٤٠ |
| چوار ژن | هەشت یەک | ١ | | | ١ | ٥ | | ١٨٠ |
| نۆ کچ | | ٧ | ئەصڵی مەسئەلە | | ٦ | ٣٥ | ٢٨ | ١٠٠٨ |
| | | | نۆ کچ | دووسێیەک | ٤ | | | |
| شەش نەنک | | | شەش یەک | شەش یەک | ١ | | ٧ | ٢٥٢ |

# بەشی پێنجەم

## ( ذوي الأرحام )

بریتین لەو خزمانەی کە نە خاوەن بەشی دیاری کراون، و نە عەصەبەن.

ئیمامی رەحەبی دەفەرموێت:

إن لم يكن ذو فرض أو تعصبُ فاخصص ذوي الأرحام حكما أوجبوا

زانایان بە شێوەیەکی گشتی (ذوي الأرحام ) یان کردوە بە چوار پۆلەوە [1]:

(١) ئەوانەی کە لقی مردوەکەن (واتە نیسبەت دەدرێنە پاڵ مردوەکە)، و تەنها لە ڕێگەی مێیینەوە دەگەنەوە بە مردوەکە. ئەوانیش بریتین لە:

أ. منداڵی کچ (واتە: کچە زا).

ب. منداڵی کچی کوڕ.

(٢) ئەوانەی کە ئەصڵی مردوەکەن (واتە مردوەکە نیسبەت دەدرێتە پاڵ ئەوان)، و تەنها لە ڕێگەی مێیینەوە دەگەنەوە بە مردوەکە. ئەوانیش بریتین لە:

أ. باوکی دایك، و باوکی باوکی دایك... هتد.

ب. دایکی باوکی دایك، و دایکی دایکی باوکی دایك... هتد.

(٣) ئەوانەی کە لقی منداڵی ئەصڵی مردوەکەن (واتە نیسبەت دەدرێنە پاڵ دایك و باوکی مردوەکە، هەردووکیان یان یەکێکیان ). ئەوانیش بریتین لە:

---

١) الفقه الإسلامي ٧٨٥٤، المفصل ١١ / ٣٤١ – ٣٤٣، اللمع ١٧١ – ١٧٢، الدرة ١٧٧– ١٧٨، الفقه المنهجي ٢ / ٣٩١ – ٣٩٢، الموسوعة / ميراث ذوي الأرحام ٣ / ٥٥.

أ. (خوشکه زا ) واته: منداڵی خوشکی مردوەکه. جا ئەو خوشکه خوشکی دایك و باوکی بێت، یان تەنها باوکی، یان تەنها دایکی. وەك کوڕی خوشك، یان کچی خوشك، یان کوڕی کوڕی خوشك، یان کچی کوڕی خوشك، یان کچی کچی خوشك.

ب. کچی برای مردوەکه. جا ئەو برایه برای دایك و باوکی بێت، یان تەنها باوکی، یان تەنها دایکی. بەڵام کوڕی برا عەصەبەیه، وەك له باسی عەصەبەدا به درێژی ڕوونی دەکەینەوه.

ت. منداڵی برای دایکی مردوەکه. وەك کوڕی برای دایکی، و کچی برای دایکی، و کوڕی کوڕی برای دایکی، و کچی کوڕی برای دایکی، و کچی کچی برای دایکی.

(٤) ئەوانەی که لقی یەك لەو باپیره و داپیرانەن که نه وەك خاوەن بەش، و نەوەك عەصەبەش میرات نابەن. ئەوانیش دەکرێن به شەش کۆمەڵەوه:

أ. مامی تەنها دایکی، و پوور. جا ئەو پووره پووری دایك و باوکی بێت، یان تەنها باوکی، یان تەنها دایکی، خاڵ، جا ئەو خاڵه خاڵی دایك و باوکی بێت، یان تەنها باوکی، یان تەنها دایکی. بەڵام مامی دایك و باوکی، یان مامی باوکی، ئەمانه عەصەبەن، وەك له باسی عەصەبەدا به درێژی ڕوونی دەکەینەوه.

ب. منداڵ، یان کچی کوڕی ئەوانەی پێشەوه که باسمان کردن، و کچی مامی دایك و باوکی، و کچی مامی باوکی، و کوڕی کچی مام.

ت. (مامی تەنها دایکی) باوکی مردوەکه، و خاڵ و پوری باوکی مردوەکه، که خزمایەتیەکەیان له ڕێگەی باوکی مردوەکەوه بێت، و مامی دایکی مردوەکه، و خاڵ و پوری دایکی مردوەکه که خزمایەتیەکەیان له ڕێگەی دایکی مردوەکەوه بێت.

پ- منداڵی ئەوانەی خاڵی پێشەوە کە باسمان کـردن، و کـچی مامـەی بـاوکی مردوەکە، و کچی کوڕی مامەی باوکی مردوەکە.

ج- (مامی تەنها دایکی) باوکی باوکی مردوەکە، و خاڵ و پوری باوکی باوکی مردوەکە، و مام، و خاڵ، و پوری دایکی باوکی مردوەکە، و مام و خـاڵ و پـوری دایکی باوکی مردوەکە، و مام و خاڵ و پوری باوکی دایکی مردوەکـە، و مـام و خاڵ و پوری دایکی دایکی مردوەکە.

چ- منداڵی ئەوانەی خاڵی پێشەوە کە باسمان کردن، و کـچی (مـامی دایـك و باوکی یان تەنها باوکی) باوکی باوکی مردوەکە، و کـچی کـوڕی مـامی بـاوکی باوکی مردوەکە، و منداڵی ئەمانیش هەر بەم شێوە.

جا ئێستا دەکرێت کە بە شێوەیەکی تر بڵێین: (ذوي الأرحام) دەکرێن بە یانزە پۆلەوە:

١) منداڵی کچ یان منداڵی کچی کوڕ.
٢) منداڵی خوشکی دایك و باوکی، یان تەنها باوکی.
٣) کچی برای دایك و باوکی یان تەنها باوکی.
٤) کچی مام.
٥) منداڵی برا و خوشکی دایکی.
٦) مامی باوکی، جا مامی مردوەکە بێت، یان مـامی بـاوکی، یـان مـامی باپیری.
٧) خوشکی باوکی مردوەکە، یان خوشکی باپیری.
٨) خاڵ و پوری مردوەکە، یان خاڵو پوری باوکی، یان باپیری.
٩) باوکی دایکی مردوەکە، یان باوکی دایکی دایکی.
١٠) هەموو داپیرەیەك کە نزیك بێتەوە لە مردوەکە بە نێرینەیەك لـە نێـوان دوو مێیینەدا. وەك: دایکی باوکی دایك، یان نزیـك بێتـەوە لـە مردوەکـەوە بـە پلەیەك لە پاش باپیرەی، وەك: دایکی باوکی باوك.

(١١) هەرکەسێك کە بەهۆی یەکێك لەو دە بەشەی سەرەوە بگات بە مردوەکە.

یەکێك لە شاعیران دەفەرموێت:

وورث ذوي الأرحام كلّ قرابة ... لفقد فروض، و العصيب بأوصد
كنسل ابنة، أو نسل أخت، وكابنة ال ... أخ، والأعمام، والخال فاشهد
وعم لأم، مع أبيها، ومع بني ... أخيه لأم، ثم عمته اعدد
وخالته، مع جدة الجد يا فتى ... وأم أبي أمٍ وشبهها زد
كذلك من أدلى بهم واقسمن كمن ... به مت كلاً في العطا، والتعدد

کەواتە ئەگەر ئێمە بمانەوێت میرات بەرەکان پۆلین بکەین بە جۆرێك کە ریز بەندیەکی تێدا بێت، و بزانین کە ئایا: کامیان لە پێش کامیانەوە میرات دەبەن، ئەوا بەم شێوەیە ڕیزبەندیان دەکەین:

أ. خاوەن بەشە دیاری کراوەکان.

ب. عەصەبەکان.

ت. ئەو خاوەن بەشانەی کە زیادەی میراتەکەیان بۆ ڕەد دەکرێتەوە.

ث. ذوی الأرحام.

ج. بيت المال.

## ڕای زانایان لەسەر میرات بردنی (ذوي الأرحام )

زانایان لە میرات بردنی (ذوي الأرحام ) دا دوو بۆچوونیان هەیە [١]:

(١) میرات نابەن. بەڵکو ئەگەر کەسێك بمرێت، نە میرات بەری خاوەن بەش، و نە عەصەبەی نەبوو، ئەوا میراتەکەی ڕەوانە دەکرێت بۆ (بیت المال). ئەمەشیان بۆچوونی ئەم ئیمامانەیە: عوثمان و زەیدی کوڕی ثابت و سەعیدی کوڕی موسەیەب و سەعیدی کوڕی جوبەیر و ئەوزاعی و ئەبو ثەور و داود و ئیبنو جەریری طەبەری. بەبەڵگەی ئەوەی کە خوای گەورە لە و ئایەتانەی کە باسی میراتی کردوە، باسی هەم خاوەن بەشەکان، و هەم عەصەبەکانیشی کردوە، بەڵام بە هیچ جۆرێك باسی (ذوي الأرحام) ی نەکردوە، خۆ ئەوەش مەعلومە کە خوای گەورە کەسی لەبیر نەچوە و کەسیشی لەبیر ناچێت.

(٢) میرات دەبەن. ئەمە بۆچوونی ئەم ئیمامانەیە: عومەر و عەلی و ئیبنو مەسعود و ئیبنو عەباس و ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕاح و موعاذی کوڕی جەبەل و ئەبو دەرداء و قاضي شورەیح و حەسەن و ئیبنو سیرین و عەطاء و موجاهید و عومەری کوڕی عەبدولعەزیز و طاووس و عەلقەمە و مەسروق و ئەبو حەنیفە و مالیك. بە بەڵگەی ئەو ئایەتەی کە خوای گەورە دەفەرموێت: وَأُوْلُواْ ٱلۡأَرۡحَامِ بَعۡضُهُمۡ أَوۡلَىٰ بِبَعۡضٖ فِي كِتَٰبِ ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمُۢ ﴿٧٥﴾ . الأنفال ، وە بە بەڵگەی ئەو فەرموودەی حەزرەتە کە دەفەرموێت: (الخال وارث من لا وارث له ).

بەڵام لەبەر ئەوەی کە بەڵگەکانی کۆمەڵی دوەم بەهێزترە [١]، بۆیە لە کۆتاییدا زانایانی پاشینەی هەردوو مەزهەببی ئیمامی مالیك و ئیمامی شافیعی

---

١) الفقه الإسلامي ٧٨٥١ – ٧٨٥٤، المفصل ١١ / ٣٣٧ – ٣٣٨، اللمع ١٦٧ – ١٧٠، الكنوز ٢٨٢، الموسوعة / ميراث ذوي الأرحام ٣ / ٥٣، عون المعبود ٨ / ٧٥ – ٧٦.

– کاتێك کە (بیت المال) مونتەظەم نەبوو -- گەڕانەوە سەر ئەم بۆچوونە. کەواتە دەکرێت بوترێت: زانایانی هەرچوار مەزهەب لەسەر ئەوەن کە (ذوي الأرحام) میرات دەبەن.

## چۆنێتی دابەش کردنی میرات بەسەر (ذوي الأرحام ) دا

زانایان یەك دەنگن لەوەدا کە: هەر کاتێك مردوویەك میرات بەری نەبوو — چی خاوەن بەشی دیاری کراو، چی عەصەبە — ، یان خاوەن بەشی دیاری کراوی هەبوو، بەڵاّم لەوانە نەبوون کە میرات بەسەریاندا ڕەد بکرێتەوە، وەك: ژن، و مێرد، وە (بیت المال ) یش بە پێی شەرع نەدەبرا بە ڕێوە، ئەوا ئەم (ذوي الأرحام)انە میراتەکە هەمووی —لە شێوەی یەکەمدا- یان ئەوەی کە پاش بەشی دیاری کراوی ژن، یان مێردەکە دەمێنێتەوە —لە شێوەی دوەمدا— دەبەن.(٢)

ئەوجا ئەگەر تەنها یەك کەس بوو ئەوا میراتەکە هەمووی دەبات، یان ئەوەی کە دەمێنێتەوە لە پاش بەشی ژنەکە، یان مێردەکە، بە بێ جیاوازی لە نێوان نێر، و مێ دا. کەواتە ئەگەر:

(١) کەسێك بمرێت: تەنها کوڕی کچێکی لەپاش بەجێ بمێنێت، ئەوا هەموو میراتەکە دەبات.

(٢) پیاوێك بمرێت: ژنێك، و کوڕی خوشکێکی لەپاش بەجێ بمێنێت، ئەوا ژنەکە چوار یەك دەبات، و ئەوەی کە دەمێنێتەوە کوڕی خوشکەکە دەیبات کە لە چوار بەش سێ بەشە.

---

٢) المفصل ١١ / ٣٤١.

١) المبسوط٧ / ٥٧٦

(٣) ژنێك بمرێت: پیاوێك، و کچی مامێکی لە پاش بەجێ بمێنێت، ئەوا پیاوەکە نیوە دەبات، و نیوەکەی تری کچی مامەکە دەیبات.

وە ئەگەر لە یەك کەس زیاتر بوون، بەڵام لە یەك ریزدا بوون — لە یەك پلەدا بوون لە نزیکیان لە مردوەکەوە --، وەك کچی کچ لەگەڵ کوڕی کچ، ئەوا دیسان هەموو میراتەکە دەبەن، یان ئەوەی کە لە بەشی ژن، یان مێردەکە دەمێنێتەوە، بەڵام ئەم جارەیان جیاوازی لە نێوان نێر، و مێ دا هەیە، و بە پێی یاسای بەشی هەرنێرینەیەك بەرامبەر بەشی دوو مێیینە، کەواتە ئەگەر:

(١) پاوێك بمرێت: کوڕی کچێك لەگەڵ کچی کچێکی لە پاش بەجێ بمێنێت، ئەوا میراتەکەی دەکرێت بە سێ بەشەوە، دوو بەشی بۆ کوڕی کچەکە، و بەشێکیشی بۆ کچی کچەکە.

(٢) پیاوێك بمرێت: ژنێك، کوڕی کچێك، کچی کچێکی لە پاش بەجێ بمێنێت، ئەوا ژنەکە چوار یەك دەبات، و سێ بەشەکەی تر کە دەمێنێتەوە دوو بەشی کوڕی کچەکە دەیبات، و بەشێکیشی کچی کچەکە دەیبات.

بەڵام ئەگەر ژمارەیان لە یەك زیاتر بوو، و لە یەك ریز، و پلەشدا نەبوون، ئەوا زانایان جیاوازی بۆچوونیان هەیە سەبارەت بە چۆنێتی دابەش کردنی میرات بەسەریاندا، و هەر کۆمەڵێك لە زانایان لەسەر یەکێك لەم دوو مەزهەبە ڕۆیشتوون [١]:

## مەزهەبی ئەهلی تەنزیل:

ئیمامی رەحەبی دەفەرموێت:

نزّلهم مكان من أدلوا به إرثاً و حجباً، هكذا قالوا به

١) الشنشوري ٢١٠، الكنوز ٢٨٣، المبسوط ٧ / ٥٧٦، مغني ابن قدامة٧ / ٨٦، التحفة ٣٩٣، النهاية ٢٢٦، المغني ٧، شرح المنهج ٦ / ٦٥، الأنوار ٢/١١، القليوبي ١٣٨.

کە ئەم مەزهەبەیان ڕاست ترینیانە، کە بریتیە لە: دانانی هەر یەك لە (ذوي الأرحام )ەکان لە جێگەی ئەو کەسەی —ئەصڵ، یان فەرع، یان حاشیە- کە بەهۆیەوە دەگات بە مردوەکە لە چۆنێتی میرات بردن —وەك خاوەن بەش، یان عەصەبە—.

بۆ نمونە: ئەگەر کەسێك بمرێت: کچی کچێك، و کوڕ و کچی کچێکی تری لە پاش بە جێ ما، ئەوا نیوەی میراتەکە بۆ کچی کچەکەیە، و نیوەکەی تر بۆ کوڕ و کچی کچەکەی ترە بە عەصەبەگەرایەتی، بە یاسای: (للذكر مثل حظ الأنثيين).

هەروەها خزمەکانی (ذوي الأرحام ) لە جێگەی ئەو کەسە دادەنرێن کە بە هۆی ئەوەوە دەگەن بە مردوەکە لە بێ بەش کردن، و بێ بەش بوون دا.

بۆ نمونە: ئەگەر کەسێك بمرێت: کچی برایەکی دایك و باوکی، و کچی برایەکی تەنها باوکی، و کچی برایەکی تەنها دایکی لە پاش بە جێ ما، ئەوا کچی برای تەنها دایکیەکە شەش یەکی میراتەکە دەبات، و ئەوەی کە دەمێنێتەوە کچی برا دایك و باوکیەکە دەیبات بە عەصەبەگەرایەتی، و کچی برا تەنها باوکیەکەش بەم کچە بێ بەش دەبێت، چونکە برای تەنها باوکی بە برای باوك و دایکی بێ بەش دەبێت، وەك لەمەولا باسی دەکەین.

هەروەها ئەگەر کەسێك بمرێت: پوورێك کە تەنها لە دایکەوە خوشکی باوکی بوو، و کچی برایەکی دایك و باوکی لە پاش بە جێ ما، ئەوا پوورەکە هەموو میراتەکە دەبات، کچی براکەش بێ بەش دەبێت، چونکە بە بوونی باوك برای دایك و باوکی بێ بەش دەبێت، وەك لەمەولا باسی دەکەین.

بەڵام لە مەسئەلەی بێ بەش کردندا، خزمەکانی (ذوي الأرحام ) ناتوانن بەشی ئەو میرات بەرانەی کە خاوەن بەشی دیاری کراون وەك: ژن، و مێرد کەم بکەنەوە.

بۆ نمونە: ئەگەر پیاوێك بمرێت: ژنێـك، و كـچی كـچێكی لـە پـاش بـە جـێ بمێنێت. ئەوا ژنەكە چوار یەكی میراتەكە دەبات، و سێ چـوار یەكەكـەی تـر بـۆ كچی كچەكەیە، واتە بە بوونی ئەم كچی كچە بەشی ژنەكە لە چوار یەكەوە كـەم ناكات بۆ هەشت یەك.

جا بزانە كە بە یەك دەنگی زانایـان منـداڵی بـرا و خوشـكی تـەنها دایكـی جیاوازی ناكرێت لە نێوان نێرینــە، و مێیینەیانـدا، بـەڵكو هەرچـیەكیان دەسـت بكەوێت لە نێوان خۆیاندا بە یەكسانی دابەشی دەكەن. (١)

ئیمامی رەحەبی دەفەرموێت:

لكنما الذكور في الميراث عند استواء الجنس كالإناث

بەڵام ئەگەر خاڵێك كە تەنها لـە دایكـەوە بـرای دایكـی مردوەكـە بێـت، و پوورێك كە تەنها لە دایكەوە خوشكی دایكی مردوەكە بێـت، یـان منـداڵی ئـەو خاڵە لەگەڵ منداڵی ئەو پوورەدا كۆ بوونەوە، ئەوا دوو بەشی میراتەكـە دەدرێـت بە منداڵی خاڵەكە، و بەشێكی بۆ منداڵی پوورەكە، وە هەروەها لە نێوان منداڵی خاڵەكەشدا بە تەنها هەر بەم شێوەیە — دوو بەش بۆ نێرینە، و بەشێك بۆ مێیینە — میراتەكە دابەش دەكرێت لە نێوانیاندا، و بە هەمان شێوە لـە نێـوان منـداڵی پوورەكەش كە بە تەنها بن هەر دوو بەش بۆ نێرینە، و بەشـێك بـۆ مێیینەیـە، و ئەم بۆچوونە (٢) تەحقیقێكە كـە زانایـان كردوویانـە، هەرچـەندە بـە پێـچەوانەی بۆچوونی (تحفة، و نهاية، و مغـني) یەوەیە — كە ئەوان پێیان وایە كـە میراتەكـە بە یەكسانی لە نێوان نێرینە و مێیینەدا دابەش دەكرێت. (٣)

---

١) النهاية ١٣، المغني ٨، البجيرمي ٢٤٩، الجمل ٦ / ٦٥.
٢) الشرواني ٣٩٤.
٣) التحفة ٣٩٤، النهاية ١٣، المغني ٨.

## مەزهەبی ئەهلی قەرابە:

کە بریتیە لە: پێش خستنی ئەوەی کە نزیکە لە مردوەکەوە بەسەر ئەوانی تردا.

بۆ نمونە: کابرایەك دەمرێت: کچی کچێکی هەیە لەگەڵ کچی کچی کوڕێك.

جا بە گوێرەی مەزهەبی یەکەم: ماڵەکە لە نێوانیاندا دابەش دەکرێت بۆ چوار (٤) بەش، سێ (٣) بەشی دەدرێت بە کچی کچەکە، و بەشەکەی تری دەدرێت بە کچی کچی کوڕەکە، چونکە کچی کچەکە لە جێگەی دایکیەتی، ئەوکاتە وەك کچی کابرای مردوو وایە، پاشان کچی کچی کوڕەکە لە جێگەی دایکیایەتی، و وەك کچی کوڕی مردوەکە وایە، ئێستا وەك ئەوەی لێ دێت کە بڵێین: ئەم پیاوە مردوە: کچێك، و کچی کوڕێکی لە پاش بەجێ ماوە، خۆ دیارە کە کچەکە (نیوە) دەبات، و کچی کوڕەکەش (شەش یەك) دەبات، و ئەصڵی مەسئەلەکە لە شەشە (٦)، کچەکە سێ (٣) دەبات، و کچی کوڕەکە یەك (١) دەبات، و دووی (٢) دەمێنێتەوە، لەم دوەش چوار یەکی دەدرێت بە کچی کچی کوڕەکە، و ئەوی تری ڕەد دەکرێتەوە بۆ کچی کچەکە.

ئەنجامەکەی لە پاش ڕەد کردنەوە، (وەك لە پێشەوە لە نمونەی یەکەمدا باسمان کرد ) لە چوارە(٤)، سێ (٣) بەشی بۆ کچی کچەکەیە، و یەك (١) بەشی بۆ کچی کچی کوڕەکە.

بەڵام بە گوێرەی مەزهەبی دوەم: ماڵەکە هەمووی کچی کچەکە دەیبات، و کچی کچی کوڕەکە حەجب دەبێت، و هیچ نابات، چونکە کچی کچەکە نزیك ترە لە مردوەکەوە.

تێبینی:

(١) لە هەندێك لە سەرچاوە شەرعیەکاندا باسی مەزهەبێکی تر کراوە کە پێی دەوترێت: مەزهەبی ئەهلی ڕەحم، ئەویش ئەوەیە کە میراتەکە دابەش بکرێت بە سەریاندا بە یەکسانی، و بە بێ جیاوازی لە نێوان نێر و مێ، و نزیك و دوور، لەبەر ئەوەی کە هەموویان بە یەك هۆکار نزیك دەبنەوە لە مردوەکە، کە ئەویش خزمایەتیە لە ڕێگەی (ذوي الأرحام ) یەوە [١]، بەلاّم ئەم مەزهەبە لە زۆربەی سەرچاوەکاندا باسی لێوە نەکراوە، و زانایانیش پەیڕەوی لێوە ناکەن، چونکە دوورە لە عەقلەوە، و پێچەوانەی بنەماکانی شەریعەتە لە مەسئەلەی میراتدا.[٢]

(٢) ئەگەر کەسێك مرد، و (بيت المال ) یش ڕێك و پێك نەبوو، و هیچ کەسیشی نەبوو لەسەر زەویدا (نە خاوەن بەش، و نە عەصەبە، و نە ذوي الأرحام)، ئەوا میراتەکەی دەدرێتە دەست کەسێکی دادپەروەر (عادل) و دڵسۆز کە لە بەرژەوەندی کاروباری موسوڵماناندا سەرفی بکات، بەڵکو هەندێك لە زانایان فەرموویانە: پێویستە لەسەر ئەو کەسە، شارەزا، دڵسۆزە، دادپەروەرە کە بەو کارە هەڵبسێت. [٣]

---

١) الجمل ٦ / ٦٥، المبسوط ٧ / ٥٧٦.

٢) الشنشوري مع الباجوري عليه ٢١٠، الفقه الإسلامي٧٨٥٧-٧٨٥٩، اللمع ١٧٢.

٣) شرح المنهج ٦ / ٦٦، التحفة ٦ / ٣٩٢، القليوبي ١٣٨/٣، الإعانة ٢٢٥/٣.

# بەشی شەشەم

# باسی میراتی چەند کەسێکی تایبەت

## میراتی ون بوو (المفقود)

ون بوو: بریتیە لەو کەسەی کە دیار نەماوە، ئیتر بێ سەر و شوێنە، یان بە دیل گیراوە، و هیچ هەواڵ و دەنگ و باسێکی نیە، و نازانرێت ئایا زیندوە، یان مردوە؟ [١]

ئیمامی سەرخەسی دەفەرموێت: ون بوو: بە کەسێك دەوترێت کە بە پێی ئەوەی کە ژیاوە، ئێستاش وەها دادەنرێت کە زیندوە، بەڵام بە پێی ئەوەی کە هیچ شوێنەوارێکی نیە، ئەوا بە مردوو دادەنرێت، وە خزم و کەسوکاریشی مەبەستیانە کە بیبیننەوە، بەڵام لەبەرئەوەی کە نازانن لەکوێ نیشتەجێیە، بۆیە هیچ زانیاریەکیان لەبارەیەوە نیە، و شوێنەواریشی بەدی ناکەن، وە دەشکرێت بە هەوڵ و کۆشش بگەنە ئاواتی خۆیان، و بیدۆزنەوە، وە دەشکرێت بۆ هەتا هەتایی نەیبیننەوە. [٢]

جا لێرەدا باسی ئەوە ناکرێت، کە بزانرێت ئایا لە کوێ یە، یان لە کوێ نیە، بەڵکو ئەوەی کە باسی لێوە دەکرێت، ئەوەیە کە نازانرێت، ئایا زیندوە، یان مردوە، بۆیە ئەگەر بزانرێت لە کوێ یە، بەڵام نەزانرێت ئایا زیندوە، یان مردوە، ئەوکاتەش هەر بە ون بوو دادەنرێت.

---

١) الفقه الإسلامي٧٨٩٢.

٢) المبسوط ٦ / ١٥٣.

## ون بوو چۆن میراتی لیٚ دەبرێت؟

بە یەك دەنگی زانایان کەسی ون بوو حسابی زیندووی بۆ دەکرێت، بۆیە میراتەکەشی بە هیچ شێوەیەك نادرێت بە میرات بەرەکانی، مەگەر لە دوو حاڵەت دا نەبێت [1]:

(١) دوو کەس شایەتی بدەن لەسەر ئەوەی کە مردوە.

(٢) ماوەیەکی وەها بەسەر بچێت لە پاش ون بوونەکە، کە بە زۆری گومان بچێتە سەر ئەوەی کە ئەو ون بووە لەو ماوە زیاتر ناژی، ئەوجا قاضی بە ئیجتیهادی خۆی بڕیاری مردنی بۆ دەر دەکات .

جا ئەگەر نە شاهیدەکان، و نە قاضی، باسی کاتی مردنی کابرای ون بوویان نەکرد، ئەوا: هەر میرات بەرێك کە لە پێش شایەتیەکە، یان لە پێش بڕیارەکە دا مردبێت، میرات لەم کەسە ون بووە نابات.

بەڵاّم ئەگەر هەم شاهیدەکان، و هەم لە بڕیارەکەش دا کاتێکیان دیاری کردبوو بۆ مردنەکە، ئەوا: هەر میرات بەرێك کە لە پێش ئەو کاتە دیاری کراوەدا مردبێت، میرات لەم کەسە ون بووە نابات [2].

## ون بوو چۆن میرات دەبات؟

زانایانی مەزهەبی هەر سیٚ ئیمام (شافعی و مالك و أحمد) پێیان وایە کە: کەسی ون بوو میرات دەبات، باوەکو میراتیشی لیٚ نەبرێت، چونکە، ئەگەر بە یەکێك لەو دوو حاڵەتەی سەرەوە ئیسبات نەکرێت کە مردوە، دەبێت هەر وا

---

١) منهاج بشرح المغني٢٦-٢٧.

٢) التحفة ٦ / ٤٢٢، النهاية ٣٢، المغني٢٧، شرح المنهج ٦ / ١٠٠، القليوبي ١٤٩.

دابنرێت کە زیندوە. [١]

جا فەرموویانە:

(١) ئەگەر مردوەکە تەنها کەسە ون بووەکـە مـیرات بـەری بـوو، و بـەس، ئەوا: هەموو میراتەکە دادەنرێت بۆی، تاوەکو دەر دەکەوێت کە ئایا زیندوە، یـان مردوە؟.

(٢) ئەگەر مردوەکە بێجگە لە ون بوەکە میرات بەری تریشی هەبوو، ئـەوا: بە خراپ ترین شێوە بەشی میرات بەرەکانی تر دەدرێت.

ئەوجا بۆ ئەوەی بزانین کە ئایا بەچی شێوەیەك بەشـی مـیرات بـەرەکانی تـر بدەین، سێ حاڵەتمان دێتە رِێگە [٢]:

(١) هیچ دانانرێت بۆ کەسێك کە ئەگەر ون بووەکە بە زیندوو دابنرێت، ئەو بێ بەش ببێت. وەك شێخی نۆدی دەفەرموێت:

فمَنْ بهِ يصيرُ ذا حِرمانِ لم نُعطِهِ شيئاً إلى البيانِ

(٢) هەر کەسێك بەشەکەی نە بە زیندوویی ون بووەکە، و نە بـە مردوویـی ون بووەکە نـەدەگۆڕا، ئـەوا بەشـەکەی خـۆی پـێ دەدرێـت. وەك شـێخی نـۆدی دەفەرموێت:

ومن بموتٍ، أو حياةٍ حقّه لم يختلف، وفّي مستحقه

(٣) هەر کەسێك بە زیندوو دانانی ون بووەکە بەشەکەی کەم بکـات، ئـەوا: بەشە کەمەکەی پێ دەدرێت، و هەر کەسـێکیش بـە مـردوو دانـانی ون بووەکـە بەشەکەی کەم بکات، ئەوا: بەشـە کەمەکـەی پـێ دەدرێـت. وەك شـێخی نـۆدی دەفەرموێت:

---

٣) الفقه الإسلامي ٧٨٩٥.

١) التحفـة ٤٢٣، النهايـة٣٠، المغـني ٢٧، المحلـي ١٤٩، شـرح المـنهج ٦ / ١٠٠، تحفـة الطلاب ٤٨٢/٢.

........................ ومن نصيبه بعـيش، أو رَدى
مـنقّـصٌ تُـقدّر الحياةُ في حـقّه، أو قـدِّر الـوفــــاةُ

## نموونەی حاڵەتی یەکەم:

ئەگەر ژنێك بمرێت: مێرد، و برایەکی ون بووی باوکی، و مامێکی لە پاش بەجێ بمێنێت، ئەوا: ئەصڵی مەسئەلەکە لە دوو (٢)ە، چونکە ئەگەر ون بووەکە زیندوو بێت، یان مردوو، بەشی مێردەکە هیچ ناگۆڕێت، و نیوەی میراتەکە دەبات، و نیوەکەی تر ڕادەگیرێت، جا ئەگەر دەر کەوت کە لە کاتی مردنی ژنەکە دا، برا ون بووەکە زیندوو بوە، ئەوا: نیوەکە دەبات بۆ خۆی، و مامەکەش بێ بەش دەبێت، بەڵام ئەگەر لە کاتی مردنی ژنەکە دا برا ون بوەکە مردبێت، ئەوا نیوەکەی کە ماوەتەوە دەدرێت بە مامەکە بە عەصەبەگەرایەتی.

## نموونەی حاڵەتی دوەم:

ئەگەر ژنێك بمرێت: مێرد، و کچێك، و کوڕێکی ون بووی لە پاش بەجێ بمێنێت، ئەوا: ئەصڵی مەسئەلەکە لە چوار (٤)ە، چونکە ون بووەکە زیندوو بێت، یان مردوو، مێردەکە هەر چوار یەك دەبات، کە دەکاتە یەك (١) بەش، و سێ (٣) بەشیش دەمێنێتەوە، ئەوجا بۆ کچەکەش، وەها دادەنرێت کە ون بووەکە زیندوە، جا ئەگەر زیندوو بێت، ئەوا کچەکە دەکات بە عەصەبە، و لە سێ بەشەکەی کە ماوەتەوە، کچەکە یەك بەش دەبات، بە گوێرەی یاسای: (للذکر مثل حظ الأنثیین)، دوو بەشیشی ڕادەگیرێت بۆ کوڕە ون بووەکە، جا ئەگەر دەرکەوت کە لەکاتی مردنی ژنەکەدا کوڕەکە زیندوو بوو، ئەوا ئەو دوو بەشە دەبات کە بە گوێرەی یاساکە بۆی دانرابوو، بەڵام ئەگەر لە کاتی مردنی ژنەکە دا دەرکەوت کە ئەویش مردبوو، ئەوا یەك لەو دوو بەشەی کە دانرابوو بۆ کوڕە ون بووەکە دەدرێت بە کچەکە بۆ تەواو کردنی بەشەکەی کە نیوەیە، و پاشان ئەگەر

(بيت المال)یش بە گوێرەی شەرع نەدەبرا بە ڕێوە ئەوا: بەشەکەی تریشی بۆ دەگەڕێنرێتەوە، بەمەش، بەشی مێردەکە یەك (١) بەشە، و بەشی کچەکەش دەبێت بە سێ (٣) بەش.

## نموونەی حاڵەتی سێ یەم:

ئەگەر کەسێك بمرێت: باپیرە، و برایەکی دایك و باوکی، و برایەکی ون بووی باوکی لە پاش بەجێ بهێنێت، ئەوا: پێویستە لەم کاتە دا دوو مەسئەلە دروست بکرێت، چونکە:

(١) ئەگەر برا ون بووەکە زیندوو بێت باپیرەکە زیان دەکات، چونکە برا دایك و باوکیەکە برا ون بووە باوکیەکە لە دژی باپیرەکە دەژمێرێت. جا لەبەر ئەوەی کە لەم کاتەدا سێ یەك، و برا بەشی بۆ باپیرەکە یەکسانن، بۆیە: ئەصڵی مەسئەلەی زیندوویی برا ون بووەکە لە سێ (٣) یە، کە بەشی باپیرەکەی لێ دەردەچێت.

(٢) ئەگەر برا ون بووەکە مردبێت، برا دایك و باوکیەکە زیان دەکات، چونکە: باپیرەکە دەبێتە هاوبەشی و میراتەکە دەکەن بە دوو بەشەوە، بەشێکی باپیرەکە دەیبات، و بەشێکیشی برا دایك و باوکیەکە، بۆیە ئەصڵی مەسئەلەی مردوویی برا ون بووەکە لە دوو (٢)ە.

کەواتە لێرە دا دوو مەسئەلەمان هەیە: مەسئەلەیەکی زیندوویی، و مەسئەلەیەکی مردوویی.

جا لەبەر ئەوەی کە لە نێوان ئەصڵی هەردوو مەسئەلەکە دا (تباين) هەیە، و بەسەر یەکدا دابەش نابن، بۆیە: ئەصڵی هەردوو مەسئەلەکە لێکدانی یەکتر دەکەین، و ئەصڵێکی تازەمان بۆ درووست دەبێت، کە شەش (٦)ە، جا ئەم مەسئەلەی سێ یەمە پێی دەوترێت (المسألة الجامعة)، واتە: کۆکەرەوەی هەردوو مەسئەلەکە. ئەوجا دەڵێین:

باپیرەکە لە مەسئەلەی یەکەم دا سێ یەکی دەبرد، کەوابوو: لەم مەسئەلەیەش دا سێ یەکی دەدرێتێ، کە دەکاتە: دوو (٢)، برا دایك و باوکیەکەش لە مەسئەلەی مردووەکە دا نیوەی دەبرد، کەوابوو: لێرەش نیوەی دەدرێتی، کە دەکاتە سێ (٣)، و ئێستا یەك (١) بەش دەمێنێتەوە کە دەکاتە شەش یەك.

جا ئەگەر دەرکەوت کە لە کاتی مردنی کەسەکەدا، برا ون بووەکەش مردبوو، ئەوا: یەك بەشەکەی کە ماوەتەوە دەدرێت بە باپیرەکە، تاوەکو ئەویش وەك برا دایك و باوکیەکە نیوە ببات، بەلاّم ئەگەر دەرکەوت کە لە کاتی مردنی کەسەکە دا برا ون بووەکە زیندوو بوە، ئەوا: یەك بەشەکەی کە ماوەتەوە دەدرێت بە برا دایك و باوکیەکە، و برا ون بووەکەش بێ بەش دەبێت، چونکە ون بووەکە تەنها برای باوکیە، و برا دایك و باوکیەکە لە دژی باپیرەکە لەگەڵ خۆی ژماردبووی، ئەگینا: بە بوونی برای دایك و باوکی برای تەنها باوکی بێ بەش دەبێت.

## ئاگاداری:

(١) ئەو نموونەی سەرەوە کاتێك بوو کە لە نێوان ئەصلی مەسئەلەی زیندوو بیەکە، و ئەصلی مەسئەلەی مردوو بیەکە دا (تباین) هەبێت، ئەگینا ئەگەر لە نێوانیان دا (توافق) هەبوو، ئەوا: (وفق) ی یەکێکیان لێکدەدرێت لەگەڵ تەواوی ئەوی تریان دا، و بەم شێوە (المسألة الجامعة) درووست دەبێت. وە ئەگەر لە نێوانیان دا (تداخل) هەبوو، ئەوا کام ئەصڵەیان زۆرتر بوو، ئەوەیان دەبێت بە (المسألة الجامعة).

(٢) هەر بەشە میراتیەك کە دانرا بێت بۆ ون بووەکە، ئەگەر بفەوتێت، ئەوا لەسەر هەموو میرات بەرەکان حیساب دەکرێت، کەواتە هەر کاتێك ون بووەکە هاتەوە، واتە لە کاتی مردنی میرات دەرەکەی دا زیندوو بووە، ئەوا پێویستە سەر

لە نوێ لە بەشی هەموو میرات بەرەکان، هەر کەسەو بە گوێرەی بەشەکەی خۆی میراتەکە بۆ ون بووەکە بگەڕێنێتەوە. [١] بەمەش: هەر زیادەیەك کە لە میراتەکەدا پەیدا بوو بێت، دەبێت بەشی ون بووەکەشی لێ بدرێت. [٢] بەڵام ئەگەر ون بووەکە نەگەڕایەوە، واتە: لە کاتی مردنی میرات دەرەکەی دا مردبوو، ئەوا: ئەو بەشەی کە ڕاگیرابوو بۆی دەدرێتەوە بە میرات بەرەکانی مردووی یەکەم، نەك میرات بەرانی ون بووەکە، چونکە دەگونجێت کە ون بووەکە لە پێش میرات دەرەکەی مردبێت.

## میراتی کۆرپەی ناو سك ( حمل )

لێرە دا پێویستە چەند باسێك بکەین:

### یەکەم: مەرجەکانی میرات بردنی کۆرپەی ناو سك

کۆرپەی ناو سك بە دوو مەرج میرات دەبات:

(١) بە زیندوویی بە تەواوی لە دایکی جیا ببێتەوە. بەوەی کە گیانی جێگیربووی تێدا بێت، یان بگری، یان باویشك بدات، یان بپژمێت، یان دەستەکانی دابخات، و بیان کاتەوە، وە هەر شتێکی تر کە مانای زیندوویەتی بگەیەنێت.

(٢) لە کاتی مردنی میرات دەرەکەی دا بوونی هەبێت. کە ئەمیش بە سێ ڕێگە دەر دەکەوێت [٣]:

---

١) التحفة ٤٢٣، النهاية ٣٠، المغني ٢٧، الجمل ٦ / ١٠٠.

٢) الشرواني ٤٢٣، الشبراملسی٣٠.

١) التحفة ٦ / ٤٢٣، النهاية٣٠، شرح المنهج ٦ / ١٠٣ - ١٠٤، القليوبي ١٥٠، فتح الجواد ٤٢٥، اللمع ١٨٣ — ١٨٦.

أ. پێش تێپەڕ بوونی شەش مانگ بە سەر مردنی میرات دەرەکە دا، کۆرپەکە لە دایکی جیا ببێتەوە، هەرچەندە دایکەکەی لەم ماوەیە دا مێردێکی تری سەر جێگەیی کردبێت.

ب.چوار ساڵ زیاتر بە سەر مردنی میرات دەرەکە دا تێپەڕ نەبوو بێت، و لەم ماوەیەش دا دایکەکەی مێردێکی تری سەر جێگەی نەکردبێت.

ت.دان پێدا نانی میرات بەرەکانی تر بە بوونی کۆرپەکە دا لە کاتی مردنی میرات دەرەکە، هەرچەندە چوار ساڵ زیاتر بە سەر مردنی میرات دەرەکە دا تێپەڕ نەبوو بێت، و لەم ماوەیەش دا دایکەکەی مێردێکی تری سەر جێگەی کردبێت.

جا کەوابوو: ئەگەر کۆرپەکە بە مردوویی لە دایکی جیا بوەوە، جا ئیتر بەخۆی مردبێت، یان کوژرابێت، یان بەشێك لە لاشەی نەهاتبوە دەرەوە، و مرد، یان گومان هەبێت لەوە دا کە زیندوە، یان گومان هەبێت لەوە دا کە ژیانێکی جێگیری هەیە، یان بە زیندوویی لە دایکی جیا ببێتەوە، بەڵام نەزانرێت کە لە کاتی مردنی میرات دەرەکە دا هەبوە یان نا، ئەوا لە هەموو ئەم حاڵەتانە دا میرات نابات، چونکە: لە حاڵەتی کۆتایی دا کۆرپەکە لە نەژادی مردوەکە نیە، و لە هەموو حاڵەتەکانی پێشووش دا بە نەبوو دادەنرێت.[1]

شێخی نۆدی لەم بارەیەوە دەفەرموێت:

وإنّما يــرثُ ذا إذا انفـصلْ حياً لوقتٍ ظُنّ أنه حصلْ
في حال موتِ مورثٍ، و إلاّ فليس للإرث يكونُ أهلا

---

١) التحفة ٦ / ٤٢٣-٤٢٤، النهاية ٣١، المغني ٢٨.

ئاگاداری:

لەبەر ئەوەی کە کاتی لێ جیابوونەوەی کۆرپە لە دایکی، لە ژنێکەوە بۆ ژنێکی تر دەگۆڕێت، هەر بۆیە زانایان بۆچوونی جیاوازیان هەیە لە زۆرترین کاتی مانەوەی کۆرپە لە سکی دایکی دا، ئەوەتا بەلای مەزهەبی ئیمامی (مالك) ەوە: پێنج ساڵە، بەلاّم بەلای هەردوو مەزهەبی ئیمامان (شافعی و أحمد) ەوە زۆرترین ماوە: چوار ساڵە، و بەلای حەنەفیەکانەوە: دوو ساڵە، و بەلای ظاهیریەکانەوە: نۆ مانگە.

بەلاّم بەلای زۆربەی زانایانەوە: کەمترین ماوەی مانەوەی کۆرپە لە سکی دایکی دا شەش مانگە، هەرچەندە هەندێك فەرموویانە: نۆ مانگە. [1]

جا ئەم بۆچوونە جیاوازانە وەك وتمان: دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کە جیابوونەوەی کۆرپە لە ژنێکەوە بۆ ژنێکی تر دەگۆڕێت، و هەر یەك لە خاوەنی ئەو بۆچوونانەش بەڵگەی بەردەستی خۆیان هەیە بۆ بۆچوونەکەیان.

## دوەم : ژمارەی کۆرپەی ناو سك

لێرەش دا پێوەرێکی ورد نیە بۆ ئەوەی کە بزانرێت: ئایا ئەوەی کە لە سکی ژنێك دایە چەند کۆرپەیە؟ بۆیە: زانایان لە دیاری کردنی ژمارەی کۆرپەی ناو سکی ژنان دا ناکۆکیان هەیە:

هەندێك فەرموویانە: وا دیاری دەکرێت کە یەك کۆرپەیە، چونکە بە زۆری وەهایە، و ئەگەر لە یەکیش زیاتر بێت، ئەوا بەکەمی وا ڕێك دەکەوێت.

هەندێکی تر فەرموویانە: وا دیاری دەکرێت کە دوو کۆرپەیە.

هەندێکی تر فەرموویانە: وا دیاری دەکرێت کە چوار کۆرپەیە.

---

١) الفقه الإسلامي ٧٨٨٢-٧٨٨٣، المفصل ١١ / ٣٧١.

بەلاّم بەلای درووست ترین فەرموودەی شوێن کەوتوانی ئیمامی (شافعی) یەوە، ژمارەی کۆرپەی ناو سك دیاری ناکرێت، چونکە: ڕێك دەکەوێت کە ژن بە یەك سك چوار، یان پێنج، یان شەش، یان حەوت، یان زیاتریش منداڵی ببێت.[١]

ئیمامی (شافعی) دەگێڕێتەوە: کە تەشریفی بردوە بۆ وڵاتی (الیمن) بۆ خزمەتی مامۆستایەك کە دەرسی فەرموودەکانی حەزرەتی پێغەمبەری (درودی خوای لێ بێت) لا بخوێنێت، و دەفەرموێت: دانیشتبووم، پێنج پیاو هاتنە ژوورەوە، و بە نۆبە سەری مامۆستاکەیان ماچ کرد، و پاشان پێنجی تر هاتن کە تەمەنیان لەوان کەم تر بوو، ئەوانیش بە نۆبە سەریان ماچ کرد، پاشان پێنجی تر، و پاشان پێنجی تر، ئیتر مامۆستاکە فەرمووی: ئەمانە هەموویان منداڵی خۆمن، و هەموو پێنج دانەیەکیان بە یەك سك لە دایك بوون، و پێنجیشمان هەیە لەناو بێشکە (لانك) دان.[٢]

## سێیەم : حاڵەتەکانی ڕاگرتنی دابەش کردنی میرات

لە چوار حاڵەت دا میرات دابەش کردن ڕادەگیرێت:

(١) مردوەکە تەنها کۆرپەکە میرات بەری بێت، و بەس. وەك: پیاوێك مردوە، و ژنێکی تەلاّق دراوی (بائنة) ی سك پڕی لە پاش بەجێ ماوە.

---

٢) التحفة ٦ / ٤٢٤، النهاية ٣١، المحلي ١٥٠، القليوبي ١٥٠، البجيرمي٢٦١، فتح الجواد ٤٢٥، اللمع ١٨٧.

١) تأريخ دمشق ٨ / ٣٠٧ — ٣٠٨، المحمدون من الشعراء ١ / ٤٢. المهذب١٧٥، المغني ٢٨.

(٢) مردوەکە میرات بەری تریشی هەبێت، بەڵام بە کۆرپەکە بێ بەش دەبێت. وەك: برا و خوشکی تەنها دایکی، کە بە منداڵی مردوەکە بێ بەش دەبن.

(٣) مردوەکە میرات بەری تریشی هەبێت، و لە هەندێك شێوە دا بێ بەش دەبێت. وەك: برای باوکی، کە ئەگەر منداڵەکە کوڕ بێت، بێ بەش دەبێت، بەڵام ئەگەر کچ بێت بێ بەش نابێت.

(٤) مردوەکە میرات بەری تری هەبێت، بەڵام بە کۆرپەکە بێ بەش نەدەبوو، وە لە هەمان کات دا میرات بەرەکە خاوەن بەشی دیاری کراو نەبوو، وەك ئەوەی کە مردوەکە: کوڕ و کچی تری هەبێت.

ئەوجا بۆیە لەم حاڵەتانە دا دابەش کردنی میراتەکە ڕادەگیرێت، چونکە: نازانرێت ئایا زۆرترین ژمارەی کۆرپەکان لە سکی دایکیاندا بە دڵنیاییەوە چەندە.

شێخی نۆدی لەم بارەیەوە دەفەرموێت:

إن كان ذو الإرث هو الحمل فقط　　أو كان ثمّ مَنْ لأجله سقَطْ
أو من على بعض التقادير احتجب　　به: كحملِ ميتٍ، و فَرع أبْ
أو مَنْ به ليس عن الإرث يُصَدّ　　و ما لَهُ مقدّر: مثلُ الولد
ففي جميعِها جميعُ مالِه　　يُجعَلُ مَوقوفاً إلى انفِصالِه
هذا هو القولُ الصحيحُ الأحْوَطُ　　فإنّ أقصى الحمل لا ينضبط

هەرچەندە ئێستا بە هۆی پێشکەوتنی بواری زانستی و پەیدا بوونی ئامێری زۆر پێشکەوتووی پزیشکیەوە، دەتوانرێت بزانرێت: ژمارەی کۆرپەکان چەندە، و بشزانرێت: نێرینەن، یان مێیینە، بەڵام، هەرچۆنێك بێت، نازانرێت: کە ئایا بە زیندوویی لە دایك دەبێت، یان نا، چونکە ئەوە جگە لە خودا کەسی تر نازانێت.

بەلاّم ئەگەر کۆرپەکە خۆی بێ بەش دەبوو لە میرات، ئەوا بە هیچ شێوەیەك دابەش کردنی میراتەکە ڕاناگیرێت، وەك ئەوەی کە: پیاوێك بمرێت: برایەکی دایك و باوکی، و باوك، و دایکێکی سك پڕی لە پیاوێکی تر — جگە لە باوکی مردووەکە — لە پاش بەجێ بهێنێت، ئەوا: دەست بەجێ میراتەکە دابەش دەکرێت بە سەر برا، و باوك، و دایکەکە دا، و کۆرپەکەش بە باوکەکە بێ بەش دەبێت، چونکە مندالّی دایکیە — برای دایکی یان خوشکی دایکی --. [1]

## چوارەم : چۆنێتی میرات بردنی کۆرپە

لەبەر ئەوەی کە نازانرێت ئایا کۆرپەکە کوڕە، یان کچە، بۆیە میراتەکە بە هەر دوو گریمانەکە دابەش دەکەین، و هەم بەشی کۆرپەکە، و هەم بەشی میرات بەرەکانی تریش بە پارێزەوە دادەنێین، بۆیە ئەگەر:

(١) کۆرپەکە بە یەکێك لە دوو گریمانەکە میراتی دەبرد، ئەوا بە میرات بەر دادەنرێت، و ئەو بەشەی کە دەیکەوێت بۆی هەلّ دەگیرێت.

(٢) کۆرپەکە بە هەردوو گریمانەکە میراتی دەبرد، بەلاّم ئەندازەی بەشە میراتەکەی لە گریمانەیەکەوە بۆ گریمانەیەکی تر جیاواز بوو، ئەوا ئەندازە زۆرەکەیانی بۆ هەلّ دەگیرێت.

(٣) کۆرپەکە بە هەردوو گریمانەکە میراتی دەبرد، وە ئەندازەی بەشە میراتەکەشی بە هەردوو گریمانەکە نەدەگۆڕا، ئەوا ئەو ئەندازەیەی بۆ هەلّ دەگیرێت.

---

١) الفقه الإسلامي٧٨٨٥، الدرة ١٢٧.

بەلاّم میرات بەرەکانی تر، سەیریان دەکەین، ئەگەر:

(١) هەر میرات بەرێك، بە یەکێك لە دوو گریمانەکە میراتی دەبرد، و بەوی تریان نەی دەبرد، ئەوا: بە شێوەیەکی کاتی وا دادەنرێت کە میرات نابات.

(٢) هەر میرات بەرێك کە بە هەردوو گریمانەکە میرات ببات، بەلاّم بەشە میراتەکەی لە گریمانەیەکەوە بۆ گریمانەیەکی تر جیاواز بوو، ئەوا: بەشە کەمەکەی پیّ دەدرێت.

(٣) هەر میرات بەرێك کە بە هەردوو گریمانەکە میرات ببات، وە ئەندازەی بەشە میراتەکەشی بە هەردوو گریمانەکە نەدەگۆڕا، ئەوا ئەو ئەندازەیەی پیّ دەدرێت.

پوختەی باس ئەوەیە کە: کۆرپەکە چۆن باش بێت، وەهای لەگەلّ دا دەکرێت، و میرات بەرەکانی تریش چۆن خراپ بێت، وەهایان لەگەلّ دا دەکرێت، وەك شێخی نۆدی دەفەرموێت:

وإن يخلِّف مَنْ حواه الـجَدَثُ حَـمْلاً يحوزُ الإرثَ، أو قدْ يَرِثُ
في حقِّـهِ، و حـقِّ غيره عمـلْ بـما هـو اليقينُ قبـلَ ينـفصِلْ

پاشان هەر جیاوازیەك کـە هـەبێت دوا دەخرێـت بـۆ کـاتی جیـا بوونـەوەی کۆرپەکە لە دایکی، جا ئەگەر کۆرپەکە بە مردوویی لە دایك بوو، ئـەوا: میراتـە ڕاگیراوەکە دەگەڕێنرێتەوە بۆ میرات بەرەکانی تر، یان ئەگـەر بـە زینـدوویی لـە دایك بوو، بەلاّم یەك مـندالّ بوو، ئەوا: لەوەی کە ڕاگیراوە چـەندی بکـەوێت پێـی دەدرێت، و پاشماوەکەشی دەگەڕێنرێتەوە بۆ میرات بـەرەکانی تـر. وەك یـەك لـە شاعیران دەفەرموێت:

وحيث يسـتحق دون مـا وقِف فردٌ زائدا لـذي حق عرِف
وعكسُها بعكسها، فإن مـنَع وارثاً الحملُ فأهـمله و دَعْ

## نموونەی (١):

پیاوێك مردوە: ژن، و باوك، و دایك، و ژنی کوڕێکی سك پڕی لە پاش بەجێ ماوە، ئێستا مەسئەلەکە بە هەردوو گریمانەکە درووست دەکەین:

(١) ئەگەر کۆرپەکە کوڕ بێت: کە دەبێتە کوڕی کوڕی مردوەکە، ئەوا:

ژنەکە هەشت یەك دەبات، و باوك، و دایکەکەش هەریەکەیان شەش یەك دەبەن، بەمەش ئەصڵی مەسئەلەکە دەبێت بە بیست و چوار (٢٤)، ئێستا: ژنەکە سێ (٣) بەش دەبات، و باوکەکەش چوار (٤) بەش دەبات، و دایکەکەش چوار (٤) بەش دەبات، و بەمەش سیازدە (١٣) بەش دەمێنێتەوە، کوڕی کوڕەکە بە عەصەبەگەرایەتی دەیبات.

(٢) ئەگەر کۆرپەکە کچ بێت: کە دەبێتە کچی کوڕی مردوەکە، ئەوا:

بە هەمان شێوەی پێشوو: ژنەکە هەشت یەك دەبات، و باوك، و دایکەکەش هەریەکەیان شەش یەك دەبەن، بەمەش ئەصڵی مەسئەلەکە دەبێتە: بیست و چوار (٢٤)، ئێستا: ژنەکە سێ (٣) بەش دەبات، و باوکەکەش چوار (٤) بەش دەبات، و دایکەکەش چوار (٤) بەش دەبات، و بەمەش سیازدە (١٣) بەش دەمێنێتەوە، و کچی کوڕەکەش نیوە دەبات، کە دەکاتە: دوازدە (١٢) بەش، و لە کۆتایی دا یەك (١) بەش دەمێنێتەوە، ئەویش باوکەکە دەیبات بە عەصەبەگەرایەتی، و بەمەش بەشی باوکەکە دەبێت بە پێنج (٥) بەش.

جا وەك دەبینین: لەم مەسئەلەیە دا، باشتر وایە کە کۆرپەکە بە نێرینە دابنرێت، و سیازدە (١٣) بەشەکەی بۆ هەڵ بگیرێت.

## نموونەی (٢):

ژنێك مردوە: مێرد، و خوشکێکی دایك و باوکی، و باوەژنێکی سك پڕی لە پاش بەجێ ماوە، ئێستا مەسئەلەکە بە هەردوو گریمانەکە درووست دەکەین:

(١) ئەگەر کۆرپەکە کوڕ بێت: کە دەبێتەبرای باوکی ژنەکە، ئەوا:

مێردەکە نیوە دەبات، و خوشکە دایك و باوکیەکەش نیوە دەبات، و بەمەش برا باوکیەکە هیچی بۆ نامێنێتەوە، و بێ بەش دەبێت.

(٢) ئەگەر کۆرپەکە کچ بێت، کە دەبێتە خوشکی باوکی ژنەکە، ئەوا:

بە هەمان شێوەی پێشوو، مێردەکە نیوە دەبات، و خوشکە دایك و باوکیەکەش نیوە دەبات، وە هەروەها خوشکە باوکیەکەش شەش یەك دەبات، جا ئێستا ئەصڵی مەسئەلەکە لە شەشە (٦)، مێردەکە سێ (٣) بەش دەبات، و خوشکە دایك و باوکیەکەش سێ (٣) بەش دەبات، و خوشکە باوکیەکەش یەك (١) بەش دەبات، بەمەش دەبێت مەسئەلەکە (عول) ی تێدا بکرێت، و ببێت بە حەوت (٧).

جا وەك دەبینین: لەم مەسئەلەیە دا، باشتر وایە کە کۆرپەکە بە مێیینە دابنرێت، و لە حەوت بەش، یەك بەشی بۆ هەڵ بگیرێت.

## نموونەی (٣):

ژنێك مردوە: مێرد، و دایکێکی سك پڕ — لە باوکی ژنە مردوەکە --، و دوو خوشکی دایك و باوکی، و دوو برای دایکی لە پاش بەجێ ماوە، ئێستا مەسئەلەکە بە هەردوو گریمانەکە درووست دەکەین:

(١) ئەگەر کۆرپەکە کوڕ بێت: کە دەبێتە: برای دایك و باوکی ژنەکە، ئەوا:

مێردەکە نیوە دەبات، و دایکەکەش شەش یەك دەبات، و هەموو برا و خوشکەکانیش بە هاوبەشی سێ یەك دەبەن —چونکە مەسئەلەی (مشرّكة)یە-، بەمەش ئەصڵی مەسئەلەکە لە شەشە (٦)، مێردەکە سێ (٣) بەش دەبات، و دایکەکەش یەك (١) بەش دەبات، و هەموو برا و خوشکەکانیش سێ یەك دەبەن، کە دەکاتە دوو (٢) بەش.

بەڵام لەبەر ئەوەی کە بەشی برا و خوشکەکان —کە دووە- دابەش ناکرێت بە سەر ژمارەیان دا —کە پێنجە-، و لە نێوانیشیان دا (تباین) هەیە، بۆیە ژمارەی برا و خوشکەکان کە پێنجە لێکدانی دەکەین لەگەڵ ئەصڵی مەسئەلەکە دا کە شەشە (٦)، و بەمەش ئەصڵی مەسئەلەکە دەبێت بە سی (٣٠)، ئەوجا ئێستا، مێردەکە پازدە (١٥) بەش دەبات، و دایکەکەش پێنج (٥) بەش دەبات، و براو خوشکەکانیش دە (١٠) بەش دەبەن، هەر یەکەیان دوو (٢) بەش، بەبێ جیاوازی لە نێوان نێر و مێ دا.

کەواتە: ئەگەر کۆرپەکە نێر بێت، ئەوا: لە سی (٣٠) بەش، دوو (٢) بەش دەبات.

(٢) ئەگەر کۆرپەکە کچ بێت: کە دەبێتە: خوشکی دایك و باوکی ژنەکە، ئەوا:

مێردەکە نیوە دەبات، کە دەکاتە سێ (٣) بەش، و دایکەکەش شەش یەك دەبات، کە دەکاتە یەك (١) بەش، و سێ خوشکە دایك و باوکیەکەش دوو سێ یەك دەبەن، کە دەکاتە چوار (٤) بەش، و دوو برا دایکیەکەش سێ یەك دەبەن، کە دەکاتە دوو (٢) بەش، بەمەش دەبێت مەسئەلەکە (عول) ی تێدا بکرێت، و ببێت بە دە (١٠).

ئەوجا لەبەر ئەوەی کە بەشی سێ خوشکەکە، کە چوارە (٤) بەساغی دابەش ناکرێت بەسەر ژمارەکەیان دا، کە سێ (٣)یە، و (تباین)یش هەیە لەنێوانیان دا،

بۆیە: دەبێت مەسئەلەکە ساغ بکەینەوە، بەوەی کە سێ(٣) -کە (وفق)ی لێدەرچووی هەموو بەشی خاوەن بەشەکانە- لێکدان بکەین لەگەڵ ئەصڵی مەسئەلەکەدا کە دە(١٠)یە، بەمەش، ئەصڵی مەسئەلەکە دەبێت بە سی(٣٠).

ئەوجا ئێستا: مێردەکە نۆ (٩) بەش دەبات، و دایکەکەش سێ (٣) بەش دەبات، و دوو برا دایکیەکەش شەش (٦) بەش دەبەن، و سێ خوشکەکەش دوازدە (١٢) بەش دەبەن، هەر یەکەو چوار (٤) بەش.

کەواتە: ئەگەر کۆرپەکە مێیینە بێت، ئەوا: لە سی (٣٠) بەش، چوار (٤) بەش دەبات.

جا وەك دەبینین: لەم مەسئەلەیە دا، باشتر وایە کە کۆرپەکە بە مێیینە دابنرێت، و لە سی بەش، چوار بەشی بۆ هەڵ بگیرێت.

## ئاگاداری:

لە هەر مەسئەلەیەك دا کە پێویست بکات ئەصڵی مەسئەلەکە زیاد بکرێت (عول) ئەوا بەشی میرات بەرەکانی تر بە زیاد کراوی پێیان دەدرێت، وەك:

ئەگەر پیاوێك بمرێت: دایك، و باوك، و ژنێکی سك پڕی لە پاش بەجێ بمێنێت، ئەوا:

دایك، و باوکەکە یەکی شەش یەك دەبەن، و ژنەکەش هەشت یەك دەبات، و بەشی هیچکام لەم سیانەش بە نێرینەیی و مێیینەیی کۆرپەکە ناگۆڕێت، بەڵام: لەبەر ئەوەی کە نازانرێت: ئایا کۆرپەکە یەك دانەیە، یان زیاتر، و نێرینەیە، یان مێیینە، بۆیە دەبێت هەموو گریمانەکان دابنێین

جا ئەگەر: کۆرپەکە یەك کوڕ بوو، یان زیاتر، یان کوڕ و کچ بوون بە یەکەوە، یان یەك کچ بوو، ئەوا ئەصڵی مەسئەلەکە پێویست بە زیاد کردن ناکات، چونکە وەك دەزانین، لەم حاڵەتانە دا ئەصڵی مەسئەلەکە لە بیست و چوارە (٢٤)،

دایکەکە و باوکەکەش هەر یەکەو چوار (٤) بەش دەبەن، و ژنەکەش سێ (٣) بەش دەبات.

ئەوجا ئەگەر کوڕپەکە یەك نێرینە بوو، ئەوا: پاشماوەی میراتەکە دەبات. وە ئەگەر چەند نێرینەیەك بوون، ئەوا: پاشماوەکەیان بە یەکسانی لە نێوان دا دابەش دەکرێت، وە ئەگەر نێرینە و مێیینە بوون بە یەکەوە، ئەوا: پاشماوەکەیان بە سەردا دابەش دەکرێت بە پێی یاسای: (للذكر مثل حظ الأنثيين )، وە ئەگەر تەنها یەك مێیینە بوو، ئەوا: نیوە دەبات، کە دەکاتە دوازدە (١٢) بەش، و یەك بەشیش دەمێنێتەوە، ڕای دەگرین تاوەکو کوڕپەکە جیا دەبێتەوە، جا ئەگەر نێرینە بوو، ئەوا یەك بەشەکەش دەبات، بەڵام ئەگەر مێیینە بوو، ئەوا: باوکەکە بە عەصەبەگەرایەتی دەیبات، بەڵام ئەگەر دوو مێیینە یان زیاتر بن، ئەوا: دوو سێ یەکی میراتەکە دەبەن، کە دەکاتە شازدە (١٦) بەش، بۆیە پێویست دەکات کە ئەصڵی مەسئەلەکە زیاد بکرێت بۆ بیست و حەوت (٢٧).

جا بزانە کە زانایان بەم مەسئەلەیە دەڵێن: (المنبرية)

هۆی ناونانیشی بەم ناوە، وەك زانایان گێڕاویانەتەوە ئەوەیە کە: ئیمامی عەلی (خوای لێ ڕازی بێت)، لەسەر منبەر لە مزگەوتی شاری (کوفة)، وتاری دەدا، و لە پاش ئەوەی کە فەرمووی: الحمد لله الذي يحكم بالحق قطعا ويجزي كل نفس بما تسعى وإليه المآب والرجعى، کەسێك پرسیاری ئەم مەسئەلەیەی لێ کرد، ئەویش بەبێ ڕاوەستان، بەبێ تێکدانی ئوسلوبی وتار دانەکەی فەرمووی: صار ثمن المرأة تُسعا. [1] واتە: لەم مەسئەلەیەدا لەبەر ئەوەی کە (عول) ی تێدا کراوە، بەشی ژنەکە لە هەشت یەکەوە کەم بوەتەوە بۆ نۆ یەك، چونکە وەك دەبینین، ژنەکە لە

---

١) المغني ٢٨، النهاية ٣١، شرح المنهج ٦ / ١٠٢ – ١٠٣، القليوبي١٥٠، الفقه الإسلامي ٧٨٢٤، الدرة ١٠٦، فتح المعين٢٤٣.

کاتێك دا کە ئەصڵی مەسئەلەکە بیست و چوار (٢٤) بوو، ئەو سێ (٣) بەشی دەبرد، کە دەکاتە: هەشت یەکی بیست و چوار، بەڵام لە پاش ئەوەی کە مەسئەلەکە (عول) ی تێدا کرا، و بوو بە بیست و حەوت (٢٧)، ژنەکە هەر سێ (٣) بەش دەبات، کە دەکاتە: نۆ یەکی بیست و حەوت، کەواتە هەشت یەکەکەی بۆ بوو بە: نۆ یەك.

## میراتی نێرە مووکی سەر لێ دەرنەچوو (الخنثى المشكل)

لێرە دا دوو باس پێویستە بکرێن:

(١) نێرە مووکی سەر لێ دەرنەچوو کێ یە؟، و چەند جۆری هەیە؟

(٢) چۆنێتی میرات بردنی نێرە مووك.

## نێرە مووکی سەر لێ دەرنەچوو کێ یە؟، و چەند جۆری هەیە؟

نێرەمووکی سەر لێ دەرنەچوو: ئەو کەسەیە کە: هەم ئەندامی نێرینە، و هەم ئەندامی مێیینەی هەیە، یان تەنها کونێکی هەیە، وەك باڵندە، کە نە لە ئەندامی نێرینە، و نە لە ئەندامی مێیینە ناچێت.

جا بە گوێرەی ئەو پێناسەیە بۆمان دەردەکەوێت کە دووجۆری هەیە: [١]

(١) هەم ئەندامی نێر، و هەم ئەندامی مێ ی هەبێت.

جا ئەگەر لە ئەندامی نێرینەوە میزی دەکرد، و (مني) لێوە دەهات، ئەوا بە نێرینە دادەنرێت، بەڵام ئەگەر دەکەوتە حەیزەوە، یان لە ئەندامی مێیینەوە میزی دەکرد، و (مني) لێوە دەهات، ئەوا بە مێیینە دادەنرێت، هەروەها ئەگەر لە

---

١) التحفة ٦/٤٢٥، المغني ٢٩، المحلي١٥٠، شرح المنهج ٦/١٠٤، فتح المعين ٤٢٥، الفقه الإسلامي ٧٨٩٩.

هەردوو ئەندامەکەوە میزی دەکرد، ئەوا لە پێش دا لە کام ئەندامیانەوە میزەکە دەهاتە دەرەوە، ئەوا بە ئەوەیان دادەنرێت، بەلاّم ئەگەر لە هەردوو ئامێرەکە بە یەکەوە، و بەبێ پاش و پێش میزی دەکرد، و ئارەزووی بەلای پیاودا هەبوو، ئەوا بە مێیینە دادەنرێت، بەلاّم ئەگەر ئارەزووی بەلای ژن دا هەبوو، ئەوا بە نێرینە دادەنرێت، بەلاّم ئەگەر ئارەزووی بەلای هیچیان دا نەبوو، ئەوا بە نادیاری، و سەر لێ دەرنەچوویی دەمێنێتەوە، بەلاّم دەرهاتنی مووی ڕیش، و مەمك، و جیاوازی ژمارەی پراسوەکان، ناکرێنە بەڵگە لەسەر نێرینەیی، و مێیینەیی هیچ نێرە مووکێك.[1]

(٢) کونێکی هەبێت، وەك باڵندە، نە لە ئەندامی نێر، و نە لە ئەندامی مێ نەچێت، و هەر لەو کونەشەوە میز بکات. جا ئەم جۆرە هەر بە نادیاری، و سەر لێ دەرنەچوویی دەمێنێتەوە تاوەکو باڵغ دەبێت، ئەوجا ئەگەر دەکەوتە حەیزەوە، یان ئارەزوو، و حەزی بە لای پیاو دا هەبوو، ئەوا: بە مێیینە دادەنرێت، بەلاّم ئەگەر ئارەزوو، و حەزی بەلای ژن دا هەبوو، ئەوا: بە نێرینە دادەنرێت. بەلاّم ئەگەر ئارەزوو، و حەزی بەلای ژن، و پیاودا یەکسان بوو، یان بەلای هیچیان دا ئارەزووی نەبوو، ئەوا هەر بە نادیاری، و سەر لێ دەرنەچوویی دەمێنێتەوە .[2]

## تێبینی:

بەهۆی ئەو بەرەو پێش چوونەی کە دونیای زانستی ئەمڕۆ بە خۆیەوە بینیوە، لە بواری پزیشکی دا، ناکرێت هیچ نێرە مووکێك بە نادیاری، و سەر لێ دەرنەچوویی بمێنێتەوە، بەڵکو لە ڕێگەی نەشتەرگەریەوە، چارەسەری دەکەن، و ڕوونی دەکەنەوە، کە نێرینەیە، یان مێیینە.

---

٢) المجموع ١٧٢، المغني ٢٩، الشرواني ٤٢٥.

٣) الشرواني ٤٢٥.

## چۆنێتی میرات بردنی نێرە مووك

نێرەمووك ئەگەر ڕوون نەبێتەوە کە نێرینەیە، یان مێیینەیە، ئەوا بە هیچ شێوەیەك ناگونجێت، نە باوك بێت، و نە باپیرە، و نە دایك بێت، و نە داپیرە، و نە ژن، بێت، و نە مێرد. بەڵکو ئەوەی کە دەگونجێت، ئەوەیە کە: یان منداڵ و کوڕەزای مردوەکەیە، یان خوشك، و برا، و برازا ، یان مامە، و ئامۆزا.[1] بۆیە دەبینین، ناکۆکی هەیە لە چۆنێتی میرات بردنی دا، ئایا بەشی نێرینەی بۆ دابنرێت، یان بەشی مێیینە؟، بەڵام بە شێوەیەکی گشتی زانایان، سێ یاسایان داناوە بۆ چۆنێتی میرات بردنی نێرە مووك:

(١) ئەگەر بەشەکەی نەدەگۆڕا، چی نێرینە بێت، یان مێیینە، ئەوا میراتەکە بەبێ کێشە دابەش دەکرێت. بۆ نموونە: ئەگەر نێرە مووکەکە منداڵی دایکی مردوەکە بێت، ئەوا چی برای دایکی بێت، یان خوشکی دایکی، جیاوازی نیە، و هەر شەش یەك دەبات.[2]

(٢) ئەگەر بە یەك لە دوو گریمانەکە — نێرینەیی، و مێیینەیی --- میراتی دەبرد، و بەوی تریان نەی دەبرد، ئەوا: میرات بەرەکانی تر کەم ترین بەشیان دەدرێتێ، و بەشی نێرە مووکەکەش هەڵ دەگیرێت، تاوەکو ئاشکرا دەبێت، کە ئایا نێرینەیە، یان مێیینە.[3]

(٣) ئەگەر جیاوازی لە نێوان بەشەکانی دا هەبوو بە گوێرەی دوو گریمانەکە، ئەوا: کەمترین بەش دەدرێت، هەم بە نێرە مووکەکە، و هەم بە میرات بەرەکانی

---

١) التحفة ٤٢٥، النهاية ٣١، البجيرمي ٣ / ٢٦١، شرح المنهج ٦ / ١٠٤، الدرة ١٢٠، المغني ٢٩، الفقه الإسلامي٧٩٠٠.

٢) التحفة ٤٢٥.

١) المغني ٢٩، الفقه الإسلامي ٧٩٠٠.

تریش، و ئەو پاشماوەیەش کە دەمێنێتەوە ڕادەگیرێت هەتاوەکو ڕوون دەبێتەوە، یان میرات بەرەکان لەگەڵی ڕێك دەکەون، و پێك دێن.[1]

شێخی نۆدی لەم بارەیەوە دەفەرمویێت:

ومشكل الحال إذا لم يختلف ... ميراثه، كولد الأم صرف
إليه مما ذو الوفاة خلّى ... جميع ما استحقّه، و إلاّ
فاز بأخذ القدر المستيقن ... ووقف الباقي إلى التبين
و حيث كان معه سواه ... نعطيه أيضاً ما تحقّقناه

## ئاگاداری:

ئەگەر نێرەمووکەکە بە نائاشکرایی، و سەر لێ دەرنەچوویی مرد، و ڕوون نەبوەوە ئایا نێرینەیە، یان مێیینەیە؟ ئەوا تەنها ڕێگەچارە بریتیە لە ڕێك کەوتن لە نێوان میرات بەرەکان دا، واتە: هەندێکیان چاو پۆشی بکەن لە بەشی خۆیان بۆ ئەوانی تریان، بەلاّم لەم حاڵەتە دا بۆ سەرپەرشتیاری شێت، و منداڵ درووست نیە: لە ئەندازەی مافی خۆیان کەمتریان بۆ وەربگرێت.[2]

## چەند نموونەیەك

(١)کەسێك مردوە: منداڵێکی نێرە مووك، و برایەکی لە پاش بەجێ ماوە:

ئێستا: نێرە مووکەکە ئەگەر بە نێرینەی دا بنێین، ئەوا هەموو میراتەکە دەبات، و براکەش بێ بەش دەبێت.

بەلاّم: ئەگەر بە مێیینەی دا بنێین، ئەوا نیوەی میراتەکە دەبات، و نیوەکەی تریشی براکە بە عەصەبەگەرایەتی دەیبات.

---

٢) التحفة ٤٢٥، النهاية ٣٢، الفقه الإسلامي٧٩٠١.

٣) التحفة ٤٢٥–٤٢٦، النهاية ٣٢، المغني ٢٩.

جا لێرە دا وەك پارێزێك، دەبێت بەشی مێیینەی بۆ دابنرێت، کە نیوەیە، و نیوەکەی تریش ڕابگیرێت تاوەکو ڕوون دەبێتەوە: جا ئەگەر بە نێرینە دەرچوو، ئەوا: نیوەکەی تریشی دەدرێتیٚ، و براکەش بیٚ بەش دەبێت، بەڵام ئەگەر بە مێیینە دەرچوو، ئەوا: نیوەکەی خۆی دەبات، و نیوەکەی تریش براکە دەیبات.

(٢) کەسێك مردوە: منداڵێکی نێرە مووك، و کچێك، و مامی لە پاش بەجیٚ ماوە:

ئێستا: نێرە مووکەکە ئەگەر بە مێیینەی دا بنێین، ئەوا: لەگەڵ کچەکە دا دوو سیٚ یەکی میراتەکە دەبەن، و پاشماوەکەش کە سیٚ یەکە ڕادەگیرێت بۆ نێرەمووك، و مامەکە.

بەڵام: ئەگەر بە نێرینەی دابنێین، ئەوا نێرە مووکەکە و کچەکە هەموو میراتەکە دەبەن بە پێی یاسای: (للذکر مثل حظ الأنثیین)، و مامەکەش بیٚ بەش دەبێت.

جا لێرەدا وەك پارێزێك، دەبێت بەشی مێیینەی بۆ دابنرێت، کە: لەگەڵ کچەکە دا بە هاوبەشی دوو سیٚ یەك دەبەن، و سیٚ یەکەکەش کە دەمێنێتەوە، ڕادەگیرێت لە نێوان نێرە مووك و مامەکە دا، تاوەکو ڕوون دەبێتەوە، جائەگەر بە مێیینە دەرچوو، ئەوا: سیٚ یەکەکە دەدرێت بە مامەکە بە عەصەبەگەرایەتی.

بەڵام ئەگەر بە نێرینە دەرچوو، ئەوا سیٚ یەکەکەی بۆ دەگەڕێنینەوە، و مامەکەش بیٚ بەش دەبێت.

(٣) ژنێك مردوە: منداڵێکی نێرە مووك، و مێرد، و باوکی لە پاش بەجیٚ ماوە:

ئێستا: نێرە مووکەکە ئەگەر بە مێیینەی دابنێین، ئەوا: نیوە دەبات، و مێردەکەش چوار یەك دەبات، و باوکەکەش شەش یەك دەبات، و ئەصڵی مەسئەلەکەش لە دوازدە (١٢) یە، نێرە مووکەکە شەش (٦) دەبات، و

مێردەکەش سێ (٣) دەبات، و باوکەکەش دوو (٢) دەبات، و یەك (١) بەشەکەش ڕادەگیرێت بۆ نێرە مووك، و باوکەکە.

بەلاّم ئەگەر بە نێرینەی دابنێین، ئەوا مێردەکە سێ (٣) دەبات، و باوکەکەش دوو (٢) دەبات، و حەوت (٧) بەشەکەش کە دەمێنێتەوە نێرە مووکەکە دەیبات بە عەصەبەگەرایەتی.

جا لێرە دا وەك پارێزێك، دەبێت شەش (٦) بەشی بۆ دابنرێت، و ئەو یەك بەشەش کە لەپاش بەشی مێرد و باوکەکە دەمێنێتەوە، ڕا دەگیرێت، تاوەکو ڕوون دەبێتەوە، جا ئەگەر بە مێیینە دەرچوو، ئەوا: دەدرێت بە باوکەکە.

بەلاّم ئەگەر بە نێرینە دەرچوو، ئەوا: نێرە مووکەکە بە عەصەبەگەرایەتی دەیبات.

(٤)پیاوێك مردوە: ژن، و باوك، و دایك، و منداڵێکی نێرە مووکی لە پاش بەجێ ماوە:

ئێستا: نێرە مووکەکە ئەگەر بە مێیینەی دابنێین، ئەوا: نیوە دەبات، و ژنەکەش هەشت یەك دەبات، و دایك و باوکەکەش هەر یەکەو شەش یەك دەبەن، و ئەصڵی مەسئەلەکەش لە بیست و چوارە (٢٤)، نێرە مووکەکە دوازدە (١٢) دەبات، و ژنەکەش سێ (٣) دەبات، و دایك، و باوکەکەش هەریەکەو چوار (٤) دەبەن، بەمەش یەك (١) بەش دەمێنێتەوە، ئەویش ڕادەگیرێت بۆ نێرەمووك، و باوکەکە.

بەلاّم ئەگەر بە نێرینەی دابنێین، ئەوا: ژنەکە هەشت یەك دەبات، کە دەکاتە سێ (٣)، و دایك و باوکەکەش هەریەکەو شەش یەك دەبەن، کە بەشی هەردووکیان دەکاتە هەشت (٨)، و سیازدە (١٣) بەشیش دەێنێتەوە نێرە مووکەکە بە عەصەبەگەرایەتی دەیبات.

جا لێرە دا وەك پارێزێك، دەبێت دوازدە (١٢) بەشی بۆ دابنرێت، و لەپاش بەشی مێرد و دایك و باوکەکەش، ئەو یەك (١) بەشەی کە دەمێنێتەوە، ڕا دەگیرێت، تاوەکو ڕوون دەبێتەوە، جا ئەگەر بە مێیینە دەرچوو، ئەوا: دەدرێت بە باوکەکە.

بەڵام ئەگەر بە نێرینە دەرچوو، ئەوا: لەگەڵ دوازدە (١٢) بەشەکە دا دەدرێت بە نێرە مووکەکە.

جا بزانە: لێرەدا بۆ ساغ کردنەوەی مەسئەلەکان، وەك لە میراتی ون بوو دا باسمان کرد: دوو مەسئەلە درووست دەکەین، یەکیان وەها دادەنێین کە نێرینەیە، و ئەوی تریشیان وەها دادەنێین کە مێیینەیە، ئەوجا دەڕوانینە ئەصڵی هەردوو مەسئەلەکە (یان تماثل، یان توافق، یان تداخل، یان تباین) هەیە لە نێوانیان دا، ئەوجا مەسئەلەی کۆکەرەوە (المسئلة الجامعة) بە گوێرەی پەیوەندیەکە درووست دەکەین، و بەشی هەم نێرە مووك، و هەم خاوەن بەشەکانی بە کەمترین شێوە تیادا دیاری دەکەین.[1]

بۆ نموونە: پیاوێك مردوە: کوڕێك، و منداڵێکی نێرە مووکی لە پاش بەجێ ماوە،

ئێستا: ئەگەر بە نێرینەی دابنێین، ئەوا میراتەکە لەگەڵ کوڕەکەدا بە یەکسانی دەبەن، و هەریەکەیان نیوە دەبەن، و ئەصڵی مەسئەلەکەش لە دووە(٢).

بەڵام ئەگەر بە مێیینەی دابنێین، ئەوا بە پێی یاسای: (للذكر مثل حظ الأنثيين) کوڕەکە دوو بەرامبەری نێرە مووکەکە میرات دەبات، بەمەش ئەصڵی

١) الفقه الإسلامي ٧٩٠٢.

مەسئەلەکە لە سێ(٣)یە، کوڕەکە دوو (٢) دەبات، و نێرە مووکەکەش یەك(١) بەش دەبات.

جائێستا دەبینین: کە لە نێوان ئەصڵی دوو مەسئەلەکە دا (تباین) هەیە، بۆیە هەردوو ئەصڵەکە لە یەك دەدەین، و مەسئەلە کۆکەرەوەکەمان بۆ درووست دەبێت، کە ئەصڵی مەسئەلەکەی شەشە (٦).

ئەوجا ئەگەر لەم مەسئەلە کۆکەرەوەدا بەشی کوڕەکە، و نێرە مووکەکە دەست نیشان بکەین، ئەوا بەم شێوەیە دەبێت:

کاتێك کە نێرە مووکەکەمان بە نێرینە دانا، ئەوا نیوەی دەبرد، کەواتە ئێستاش نیوەی شەش (٦) دەبات، کە سێ (٣) یە، بەڵام کاتێك کە نێرە مووکەکەمان بە مێیینە دانا، ئەوا سێ یەکی دەبرد، کەواتە ئێستاش سێ یەکی شەش دەبات، کە دووە (٢).

کەواتە ئێستا ئەوەی کە زیانی نێرە مووکەکەی تێدایە ئەوەیە کە بە مێیینە دابنرێت، چونکە دوو (٢) بەش دەبات، وە ئەوەی کە زیانی کوڕەکەی تێدایە ئەوەیە کە نێرە مووکەکە نێرینە بێت، چونکە سێ (٣) بەش دەبات، بەمەش: شەش یەکی میراتەکە دەمێنێتەوە، و ڕادەگیرێت، هەتاوەکو ڕوون دەبێتەوە، جا ئەگەر نێرینە دەرچوو، ئەوا شەش یەکەکەش دەبات، وە ئەگەر مێیینە دەرچوو، ئەوا شەش یەکەکە دەدرێت بە کوڕەکە، بەڵام ئەگەر ڕوون نەبووەوە، ئەوا ڕادەگیرێت هەتاوەکو پێك دێن، و ڕێك دەکەون.

# بەشی حەوتەم

## مەسئەلە ناودارەکان

هەندێك مەسئەلە هەن لە (فرائض) دا، بە مەسئەلە شاز و جیاکراوەکان لە یاسا گشتی‌یەکانی ئەم زانستە دادەنرێن، ئەگەرچی باسی هەندێکیانمان لە جێگەی خۆیاندا وەك پێویست کردوە، بەڵام بۆ ئەوەی کە ئەگەر بمانەوێت بە ئاسانی بگەڕێینەوە سەریان، بۆیە بە پێویستی دەزانم، ئەگەرچی بە شێوەیەکی کورتیش بێت باسێکیان لێوە بکەم، کە مەسئەلەکانیش ئەمانەن:

### الغرّاوان، العمريّتان

ئەم دوو مەسئەلەیە بە (عمریتان) یش ناودەبرێت، چونکە ئیمامی عومەر بڕیاری تێدا داون. مەسئەلەکانیش ئەمانەن:

(١) ژن، باوك، دایك.

(٢) مێرد، باوك، دایك.

جا لەم دوو مەسئەلەیەدا، پاش ئەوەی کە ژن — لە مەسئەلەی یەکەم -، و مێرد — لە مەسئەلەی دوەم -، بەشە میراتی خۆیان دەبەن، دواتر ئەوەی کە دەمێنێتەوە دەکرێت بە سێ بەشەوە، باوکەکە دوو بەش دەبات، و دایکەکەش یەك بەش دەبات، واتە دایکەکە لە بریتی ئەوەی کە سێ‌یەکی هەموو میراتەکە ببات، بەشەکەی کەم دەبێتەوە بۆ سێ‌یەکی پاشماوە دەبات، ئەویش لەبەر ڕەچاوکردنی ئەو یاسا گشتی‌یەی کە دەڵێت، هەر کاتێك کە نێرینەیەك، و

مێیینەیەك بەیەکەوە کۆبوونەوە، و لە یەك پلەشدا بوون نیسبەت بە مردوەکە، ئەوا نێرینەکە دوو بەرانبەری مێیینەکە میرات دەبات، جا لێرەدا ئەگەرچی بەشی دایکەکە سێیەکە، بەڵام سێیەکی پاشماوەی دەدرێتی لەبەر ڕەچاوکردنی ئەم یاسایە.

## المنبرية، البخيلة

ئەم مەسئەلەیەش یەکێکە لەو مەسئەلانەی کە پێویستی بە (عول) هەیە، واتە ئەصڵی مەسئەلەکە بریتیە لە بیست و چوار (٢٤)، و پێویست دەکات کە زیاد بکرێت بۆ بیست و حەوت (٢٧) ئەویش لە مەسئەلەیەکدا کە هەشت یەك، و شەش یەك بەیەکەوە کۆدەبنەوە، وەك مەسئەلەی:

ژن، و دوو کچ، و دایك، و باوك.

ژنەکە هەشت یەك دەبات، و دوو کچەکەش دووسێیەك دەبەن، و دایکەکەش شەش یەك دەبات، و باوکەکەش شەش یەك دەبات. بەمەش ئەصڵی مەسئەلەکە بریتیە لە بیست و چوار (٢٤)، بەڵام پاش ئەوەی کە هەر میرات بەرێك بەشی خۆی دەدرێتێ، دەبینین کە ئەصڵی مەسئەلەکە پێویستی بە زیاد کردن هەیە تا دەگاتە بیست و حەوت، بۆ تەواو کردنی هەموو بەشەکان. جا ئەم مەسئەلەیەش بەم ناوەوە ناوبراوە، چونکە ئیمامی عەلی لەسەر مینبەر بوو لە شاری کوفە وتاری دەدا، لەو کاتەدا پرسیاریان لێ کرد، ئەویش هەر لەسەر مینبەرەکە کوتوپڕ بەم شێوەیە وەڵامی دایەوە کە دەبێت مەسئەلەکە عەولی تێدا بکرێت.

هەروەها بە (البخيلة) ناودەبرێت، چونکە ئەصڵی مەسئەلەکەی تەنها یەکجار عەولی تێدا دەکرێت.

## المشرّكة، الحماريّة، الحجريّة، اليمّية

ئەم مەسئەلەیە زانایان تیایدا بوون بە دوو کۆمەڵەوە:

أ. کۆمەڵێکیان پێیان وایە کە دەبێت برا دایك و باوکیەکان بکرێن بە هاوبەشی برا تەنها دایکییەکان.

ب.کۆمەڵەکەی تریش پێیان وایە کە برا دایك و باوکیەکان لە میراتەکە بێ بەش دەبن، و نابن بە هاوبەشی برا تەنها دایکییەکان. مەسئەلەکەش بریتیە لە:

مێرد، دایك (یان داپیرە)، و برای دایك و باوکی، و چەند برایەکی دایکی.

لەم مەسئەلەیەدا ئەصلّ وەهایە کە برا دایك و باوکییەکە لە میراتەکە بێبەش ببێت، چونکە عەصەبەیە، و هەرچی لە خاوەن بەشەکان بمێنێتەوە ئەوە دەبات، بەڵام لەم مەسئەلەیەدا هیچ لە خاوەن بەشەکان نامێنێتەوە تاوەکو ئەو بیبات، بۆیە دەبێت لە میراتەکە بێبەش ببێت، بەڵام برا دایك و باوکییەکە داوا دەکات کە هەر هیچ نەبێت حیسابی برا دایکییەکانی بۆ بکرێت، وەك چۆن ئەوان تەنها لە دایکەوە برای مردوەکەن، و لە هەمان کاتدا میراتیش دەبەن، ئەی بۆچی ئەم لە دایك و باوکیشەوە برای مردوەکەیە، و هیچ میرات نەبات!.

جا ئەم مەسئەلەیە بە چەند ناوێك ناوبراوە، لەوانە:

(١) (الحمارية) چونکە ئەگێڕنەوە کاتێك کە ئەم مەسئەلەیە برایە خزمەت ئیمامی عومەر، برا دایك و باوکییەکە وتی: قوربان، هەروا دابنێ کە باوکمان کەرە (گوێ درێژ)، ئەی خۆ ئێمە لە دایکەوە وەك برا دایکییەکان وەهاین. جا ئیمامی عومەر قسەکەیانی زۆر لەجێی خۆیدا بینی، بۆیە بڕیاریدا کە بیانکاتە هاوبەشی برا دایکییەکان، و لە میراتەکە بێبەشیان نەکات.

(٢) (الحجرية، و اليمية) چونکە ئەڵێن کە برا دایك و باوکیەکە وتوویەتی: قوربان، هەروا دابنێ کە باوکمان بەردێکە و فڕێدراوەتە ناو ئەو ئاوە. [1]

---

١) المغني ١٨، شرح الرحبية ٩١.

## الأكدرية

ئەم مەسئەلەیەش بریتیە لە:
مێرد، و دایك، و باپیرە، و خوشكی دایك وباوكی (یان خوشكی تەنها باوكی)

جا لەم مەسئەلەیەدا جمهوری زانایان بێجگە لە ئەبو حەنیفە بۆچوونی ئیمامی زەیدیان پێ پەسەندە، كە فەرموویەتی: ئەو خوشكە هەركاتێك كە لەگەڵ باپیرەدا كۆببێتەوە، ئەوا وەك خاوەن بەشی دیاری كراو میرات نابات، بەڵكو باپیرەكە دەیكات بە عەصەبە (چونكە حیسابی برای بۆ دەكرێت)، ئەو كاتەش هەرچی لە خاوەن بەشەكان مایەوە، ئەمان بەپێی یاسای (للذكر مثل حظّ الأنثیین) لە نێوان خۆیاندا دابەشی دەكەن، تەنها لەم مەسئەلەیەدا نەبێت كە بە أكدریە ناسراوە.

ئیمامی زەید فەرموویەتی: لەم مەسئەلەیەدا: مێردەكە نیوە دەبات، و دایكەكەش سێیەكە، و باپیرەكەش شەش یەك دەبات، خوشكەكەش نیوە دەبات، كەواتە ئەصڵی مەسئەلەكەش بریتیە لە شەش (٦)، بەڵام پێویست دەكات كە عەولی تێدا بكرێت بۆ نۆ (٩).

ئێستا لەبەر ئەوەی كە باپیرەكە حیسابی برای بۆ دەكرێت، بۆیە داوا دەكات كە بەشەكەی خۆی و بەشی خوشكەكە كۆبكرێتەوە، و پاشان بەپێی یاسای (للذكر مثل حظّ الأنثیین) دابەش بكرێتەوە لە نێوانیاندا.

ئەوجا بۆ ساغ كردنەوەی مەسئەلەكە دێین ئەصڵی مەسئەلەكە لێكدانی سێ (٣) دەكەین -كە بریتیە لە ژمارەی باپیرە و خوشكەكە- بەمەش ئەصڵی مەسئەلەكە دەبێت بە بیست و حەوت (٢٧)، ئەوكاتە مێردەكە نۆ (٩) بەش دەبات، و دایكەكەش شەش (٦) بەش دەبات، و دوازدە (١٢) بەشیش

دەمێنێتەوە بۆ باپیرە و خوشکەکە، باپیرەکە هەشت (٨) بەشی دەبات، و خوشکەکەش چوار (٤) بەشی دەبات.

جا لە هۆی ناونانی ئەم مەسئەلەیە بەم ناوە چەند بۆچوونێك هەیە [1]:

أ. هەندێك فەرموویانە: چونکە ئەم مەسئەلەیە مەزهەبی ئیمامی زەیدی لێڵ کردوە، لە سێ لایەنەوە:

(١) ئەم ئیمامە بەشی دیاریکراو نادات بە خوشك کاتێك کە کۆببێتەوە لەگەڵ باپیرەدا.

(٢) لە هیچ مەسئەلەیەکیشدا کە باپیرەی تێدابێت، ئەم ئیمامە عەولی تێدا نەکردوە.

(٣) لە یەك کاتدا هەردوو بەشی خوشك و باپیرەکەی کۆکردەوە، و پاشان بەپێی یاسای (للذكر مثل حظّ الأنثيين) دابەشی کردەوە بەسەریاندا.

ب. هەندێکی تر فەرموویانە: ئەو کەسەی کە پرسیاری لە ئەم مەسئەلەیە کردوە ناوی (أكدر) بوە.

ت. هەندێکی تر فەرموویان: ئەو کەسەی کە پرسیاری لێکراوە ناوی (أكدر) بوە.

پ. هەندێکی تر فەرموویانە: ئەو مێردەی کە لەناو ئەم مەسئەلەیەدایە ناوی (أكدر) بوە.

## أمّ الفروخ، الشريحيّة

ئەم مەسئەلەیەش یەکێکە لەو مەسئەلانەی کە عەولی تێدا دەکرێت، بەڵام لەبەرئەوەی کە ئەصڵی مەسئەلەکەی _ کە شەشە _ زۆرجار عەولی تێدا دەکرێت، و لە هیچ مەسئەلەیەکی تردا ئەصڵی مەسئەلە بە ئەندازەی ئەم

---

١) المهذب ٢ / ٤١٩، المغني ٢٣، التحفة ٤١٥، الدرة ٩٩.

مەسئەلەیە عەول ناكرێت، هەر لەبەرئەمە بەم ناوەوە ناونراوە، وەك باڵندەیەك كە جوجكەی زۆری لەگەڵدا بێت. مەسئەلەكەش بریتیە لە:

مێرد، و دایك (یان داپیرە)، دوو خوشكی دایك و باوكی (یان تەنها باوكی)، دوو برای دایكی.

مێردەكە نیوە دەبات، و دایكەكەش شەش یەك دەبات، و برا دایكیەكانیش سێیەك دەبەن، و خوشكە دایك وباوكیەكانیش دووسێیەك دەبەن، كەواتە ئەصڵی مەسئەلەكە بریتیە لە شەش (٦).

مێردەكە سێ دەبات، و دایكەكەش یەك بەش دەبات، و برا دایكیەكانیش دوو بەش دەبەن، بەمەش هیچ نەمایەوە بۆ خوشكە دایك و باوكیەكان، بۆیە بە ئەندازەی بەشەكەی ئەمان دەبێت مەسئەلەكە عەولی تێدا بكرێت، تاوەكو ئەمانیش بەشی دیاریكراوی خۆیان ببەن، بۆیە مەسئەلەكە زیاد دەكەین بۆ دە (١٠)، ئیتر ئەمانیش چوار بەشی خۆیان دەبەن. بەڵام ئەگەر لە جێگەی ئەم خوشكە دایك وباوكیانە، برای دایك و باوكی بوونایە، ئەوا لە میرات بێبەش دەبوون، چونكە ئەمان عەصەبەن، و میرات بەرەكانیش هەموو میراتەكەیان بردوە، و هیچ بۆ ئەمان نەماوەتەوە.

هەروەها ناودەبرێت بە (الشريحية) چونكە ئەگێڕنەوە كە پیاوێك لە بەصرە هاتە خزمەت قاضی شورەیح، و پرسیاری كرد: ئایا مێرد چەند میرات دەبات لە ژنەكەی خۆی؟ ئەویش فەرمووی: نیوە دەبات ئەگەر ژنەكە منداڵی نەبێت، و چواریەكیش دەبات ئەگەر ژنەكە منداڵی هەبێت.

ئەوجا كابرا وتی: ژنەكەم مردوە: من، و دایكی، و دوو خوشكی تەنها دایكی، و دوو خوشكی دایك و باوكی لەپاش بەجێ ماوە.

قاضی شورەیحیش فەرمووی: دەی تۆ لە دە بەش سێ بەش دەبەیت.

ئیتر کابراش چوە دەرەوە، و وتی بە خەڵکەکە: قاضی وەکو ئەم قاضیيەی ئێوەم نەدیوە، پرسیارم لیّ کردوە کە ئایا مێرد چەند میرات لە ژنەکەی خۆی دەبات؟ ئەویش وتی: یان نیوە، یان چواریەك، کەچی لەپاش ئەوەی کە مەسئەلەکەی خۆمم پیّ وت، نە نیوەی پیّدام، و نە چواریەك! بۆیە هەرجارێك ئەگەر ئەو کابرایە بگەیشتایە بە قاضی شورەیح، ئەویش پێی ئەفەرموو: تۆ من بە قاضیيەکی ستەمکار دەزانی، منیش تۆ بە کەسێکی تاوانباری خراپەکار دەزانم، چونکە مەسئەلەکەی خۆت لە خەڵك دەشاریتەوە، و دەتەوێت درۆ و فیتنە بڵاو بکەیتەوە. (١)

## أمّ الأرامل، الدينارّية الصغرى، أمّ الفروج

ئەم مەسئەلەیەش یەکێکە لەو مەسئەلانەی کە عەولی تێدا دەکرێت، وە بەم ناوەوە ناونراوە چونکە هەندێکی زۆر لە میرات بەرەکان لەم مەسئەلەیەدا بێوەژنن، وەك دەبینین: مەسئەلەکەش بریتیە لە:

سیّ ژن، و دوو داپیرە، و چوار خوشکی دایکی، و هەشت خوشکی دایك و باوکی.

ژنەکان چواریەك دەبەن، و داپیرەکانیش شەش یەك دەبەن، و خوشکە دایکیيەکانیش سیّیەك دەبەن، و خوشکە دایك و باوکیيەکانیش دووسیّیەك دەبەن، کەواتە ئەصڵی مەسئەلەکە بریتیە لە دوازدە (١٢).

ژنەکان سیّ بەش دەبەن، و داپیرەکانیش دوو بەش دەبەن، و خوشکە دایکیيەکانیش چوار بەش دەبەن، خوشکە دایك و باوکیيەکانیش دەبێت هەشت بەش ببەن، بەلاّم تەنها سیّ بەش ماوەتەوە، بۆیە پێویست دەکات ئەصڵی

---

١) الباجوري على الشنشوري ١٥٠، الشرح الكبير٧ / ٦٩.

مەسئەلەکە زیاد بکەین بۆ حەڤدە (١٧)، تاوەکو ئەمانیش بەتەواوەتی بەشی خۆیان ببەن.

هەروەها ئەم مەسئەلەیە بە سێ ناوی تریش ناو نراوە [1]:

(١) (الدينارية الصغرى) چونکە ئەم مەسئەلەیە کە باسکراوە یەکەم جار، مردووەکە حەڤدە (١٧) دیناری لەپاش بەجێ مابوو، وە هەریەك لە میرات بەرەکان دینارێکیان بەبەرکەوت.

(٢) (أم الفروج) چونکە هەموو میرات بەرەکان مێیینەن.

(٣) (السبعة عشرية) چونکە ئەصڵی مەسئەلەکە زیاد دەکرێت بۆ حەڤدە.

## الدينارية الكبرى، الركابيّة، الشاكيّة، الداودية، العامرية، الشامية

بەو مەسئەلەیە دەوترێت کە مردووەکە شەش صەد (٦٠٠) دیناری لەپاش بەجێ ماوە، و ئەم میرات بەرانەشی هەیە:

ژنێك، و دوو کچ، و دایك (یان داپیرە)، و دوازدە برای دایك و باوکی، و یەك خوشکی دایك وباوکی (یان دوازدە برای تەنها باوکی، و یەك خوشکی تەنها باوکی).

ژنەکە هەشت یەك دەبات، و دوو کچەکەش دووسێیەك دەبەن، و دایکەکەش شەش یەك دەبات، و براو خوشکەکانیش عەصەبەن. کەواتە ئەصڵی مەسئەلەکە بریتیە لە بیست و چوار.

ژنەکە سێ بەش دەبات، و دوو کچەکەش شازدە بەش دەبەن، و دایکەکەش چوار بەش دەبات، و یەك بەشیش دەمێنێتەوە بۆ براو خوشکەکان.

---

٢) الباجوري على الشنشوري ١٥١.

جا لەبەر ئەوەی کە ئەم یەك بەشە بەساغی دابەش ناکرێت بەسەر براو خوشکەکاندا، و نیسبەتی نێوان بەشەکە، و ژمارەی براو خوشکەکانیش بریتیە لە (تباین)، بۆیە بۆ ساغکردنەوەی مەسئەلەکە دێین ئەصڵی مەسئەلەکە لێکدانی ژمارەی براو خوشکەکان دەکەین، کە (بیست و پێنج)ە، چونکە هەر برایەك بە دوو خوشك دادەنرێت، کەواتە براکان دەبن بە بیست و چوار، و یەك خوشکەکەش دەکاتە بیست و پێنج. بەمەش ئەصڵە مەسئەلەکە دەبێت بە شەش صەد (٦٠٠) (٢٤ × ٢٥). جا دووبارە مەسئەلەکە درووست دەکەینەوە.

ژنەکە حەفتا و پێنج (٧٥) بەش دەبات، و دوو کچەکەش چوار صەد (٤٠٠) بەش دەبەن، و دایکەکەش پەنجا (٥٠) بەش دەبات، و بیست و پێنج (٢٥) بەشیش دەمێنێتەوە بۆ برا و خوشکەکان، براکان هەر یەکەیان دوو (٢) بەش دەبەن، و خوشکەکەش یەك (١) بەش دەبات.

جا ئەم مەسئەلەیە ناونراوە بەم ناوەوە، لە لایەك لەبەر ئەوە کە لە (الدينارية الصغری) جیا ببێتەوە، کە ئەصڵی مەسئەلەکە لە دوازدەیە، و عەولی تێدا دەکرێت بۆ حەڤدە، وەك باسمان کرد، وە لە لایەکی تریشەوە، دەگێڕنەوە کە ژنێك هاتە خزمەتی ئیمامی عەلی، و عەرزی کرد: برایەکی دایك و باوکیم مردوە، و شەش صەد دیناری لەپاش بەجێ ماوە، و کەچی من دینارێکم بەرکەوتوە. ئیمامی عەلیش فەرمووی: براکەت ئەو میرات بەرە، و ئەوە، و ئەوەی هەیە؟ ئەویش وتی بەڵێ. ئیتر ئیمامی عەلیش فەرمووی: بەشی خۆتت پێ دراوە، و هەر ئەوەندەت دەکەوێت.

هەروەها ئەم مەسئەلەیە زۆر ناوی تری لێ نراوە، لەوانە:

(١) (الركابية، والشاكية)ش ناو دەبرێت، چونکە ئەگێڕنەوە کە ئیمامی عەلی لەوکاتەی کە دەیویست سواری ولاغەکەی ببێت، ئەو ژنە ولاغەکەی گرت، و

شەکوای حاڵی خۆی لای ئیمامی عەلی کرد کە بەلای خۆیەوە وەهای دانابوو کە کەمی پێدراوە.[١]

(٢) (الشريحية) چونکە قاضی شورەیح بەم جۆرە بڕیاری لەم مەسئەلەیەدا داوە. شێخی نۆدی لەم بارەیەوە دەفەرموێت:

وذيك في عهد علي وقعت ثمّ إلى القاضي شريحٍ رُفعت
وبعد أن جعلها من ست مأةٍ أعطى واحداً للأخت
فأقبلت نحو أبي التراب و رجله إذ ذاك في الركاب
قالت أخي ماتت، و عندما هلك ستّ مِيَةْ من الدنانير ترك
قال: لعلّ حين ذاق حتفه عصابة سواك خلّى خلفه
وعدّهم كما مضى، قالت: نعم فقال بالحق قضى، وما ظلم

(٣) (الداودية) چونکە ئەم مەسئەلەیان پرسیوە لە داوودی طائی، ئەویش بەم جۆرە وەڵامی داوەتەوە. ئەگێڕنەوە کە خوشکەکە هاتوە بۆ خزمەتی ئیمامی ئەبو حەنیفە، و عەرزی کردوە کە برایەکی مردوە، و (٦٠٠) دیناری لەپاش بەجێ ماوە، کەچی ئەم تەنها یەك دیناریان پێ داوە. ئیمامی ئەبو حەنیفەش دەپرسێت: کێ میراتەکەی دابەش کردوە؟ ئەویش دەڵێت: قوتابییەکەی خۆت (داوودی طائی)، ئیمامیش فەرمووی: ئەو ستەمت لێ ناکات، ئایا براکەت داپیرەی هەیە؟ وتی: بەڵی. فرمووی: ئەی دوو کچیشی هەیە؟ وتی: بەڵێ. فەرمووی: یەك ژنیشی هەیە؟ وتی: بەڵێ. فەرمووی: دوازدە براشت لەگەڵدایە؟ وتی: بەڵێ. فەرمووی: دەی بەشی تۆ تەنها یەك دینارە.

(٤) (العامرية) چونکە عامری شەعبی[١] بەم جۆرە بڕیاری لەم مەسئەلەیەدا داوە.

---

١) منتهى الإرادات ٢ / ٥١٩، الإقناع ٣ / ٨٤.

یەکێك لە شاعیران دەفەرموێت [٢]:

إذا امـرأة جـائت إلـى بيت عـالم وقالت أخي أودي، فأعطيت درهماً
وخلّف نصف الإرث مالاً و عشرة ولم أعط شـــيئاً غيـره، فتـفهّما
يقول لـها أودى، و خلّـــف زوجة وبنـتين مع أمّ لـها كـــان مكـرما
ومثل شهور العام في الـعدّ إخـوة وأنت لهم أخت، لكِ الدرهــم انتما

(٥) (الشامية) [٣]. بەلاّم هۆی ناونانیم بەم ناوە نەبینیوە!.

## المروانية، الغرّاء

ئەم مەسئەلەیەش یەکێکە لەو مەسئەلانەی کە عەولی تێدا دەکرێت، وە بەم ناوەوە ناونراوە چونکە لە سەردەمی مەروانی کوڕی حەکەم دا ڕووی داوە. مەسئەلەکەش بریتیە لە:

مێرد، و دوو خوشکی دایك و باوکی، و دوو خوشکی تەنها باوکی، و دوو خوشکی تەنها دایکی.

مێردەکە نیوە دەبات، خوشکە دایك و باوکیەکانیش دووسێیەك دەبەن، و خوشکە تەنها باوکیەکانیش بێبەش دەبن، و خوشکە تەنها دایکیەکانیش سێیەك دەبەن، کەواتە ئەصڵی مەسئەلەکە بریتیە لە شەش (٦).

---

١) ناوی عامری کوڕی شەراحیلە خەڵکی شاری کوفەیە، و یەکێکە لـە زانـا پایەبـەرزەکانی تابعین، و خۆی دەفەرموێت: بە خزمەت پێـنج سـەد لـە هـاوەڵانی حـەزرەت گەیـشتووم، لەوانە: ئیمامی عەلی، و حەسەن، و حوسەین، و عەبـدوڵای کـوڕی کومــەر، و عەبـدوڵای کوڕی عەباس، و ئوسـامەی کـوڕی زەیـد، و جـابیری کـوڕی عەبـدوڵا. وە لـەپاش سـاڵی (١٠٠)ی کۆچی وەفاتی کردوە بڕوانە: تهذيب التهذيب ٥٧/٥: أحمد بن علي بـن حجـر أبـو الفـضل العـسقلاني الـشافعي/دار الفكـر-بـيروت/الطبعـة الأولى ١٤٠٤- ١٩٨٤/عـدد الأجزاء:١٤.

٢) الباجوري على الشنشوري ٢٢١.

١) اللمع ٢٣٤.

مێردەکە سێ بەش دەبات، و خوشکە تەنها دایکیەکانیش دوو بەش دەبەن، و خوشکە دایك و باوکیەکانیش دەبێت چوار بەش ببەن، بەڵام لەبەرئەوەی کە تەنها یەك بەش ماوەتەوە، بۆیە مەسئەلەکە زیاد دەکەین بۆ نۆ (٩)، تاوەکو ئەوانیش بەشی خۆیان بە تەواوەتی ببەن.

هەروەها ئەم مەسئەلەیە ناوبراوە بە (الغرّاء)[1] چونکە زۆر دیارە لە نێو زانایاندا. یان لە دوای مەسئەلەی (المباهلة) بەدەرکەوت.

## المباهلة

ئەم مەسئەلەیە لە سەردەمی ئیمامی عومەردا ڕوویدا، و ئەویش هاوەڵانی حەزرەتی کۆکردەوە، و ڕاوێژی پێ کردن، و لە کۆتاییدا بە کۆدەنگی هاتنە سەر ئەوەی کە عەولی تێدا بکرێت، بۆیە بە یەکەم مەسئەلە دادەنرێت کە لە ئیسلامدا کە عەولی تێدا کرابێت، مەسئەلەکەش بریتیە لە:

مێرد، و دایك، یەك خوشکی دایك و باوکی (یان تەنها باوکی).

مێردەکە نیوە دەبات، و دایکەکەش سێیەك دەبات، و خوشکەکەش نیوە دەبات. کەواتە ئەصڵی مەسئەلەکە بریتیە لە شەش.

مێردەکە سێ بەش دەبات، و دایکەکەش دوو بەش دەبات، و خوشکەکەش دەبێت سێ بەش ببات، بەڵام تەنها یەك بەش ماوەتەوە، بۆیە ئەصڵی مەسئەلەکە زیاد دەکەین بۆ هەشت (٨)، تاوەکو ئەویش بەشی خۆی بە تەواوەتی ببات.

جا وەك وتمان لە سەردەمی ئیمامی عومەردا ئەم مەسئەلەیە کۆدەنگی زانایانی لەسەر بوو، بەڵام دواتر ئیمامی عەبدوڵای کوڕی عەباس بە پێچەوانەی ئەم کۆدەنگیە فەتوایدا، و فەرمووی: ئەم مەسئەلەیە نابێت عەولی تێدا بکرێت، جا هەرکەس دەیەوێت من ئامادەم (مباهلة)ی بکەم، چونکە خوای

---

٢) الباجوري على الشنشوري ١٤٩، الفقه المنهجي ٢ / ٤٨٠.

گەورە هەرگیزماڵێکی دانەناوە کە دوو نیوە و سێیەکێکی هەبێت، لەبەرئــەوەی کە بە دوو نیوە ماڵەکە تەواو دەبێت، ئەی ئیتر سێیەکەکە لەکوێ بهێنین؟!.

(مباهلة)ش بەوە دەوترێت کە دوو بۆچوونی جیاواز هەبێت لە مەسئەلەیەکدا، و خاوەنی یەکێك لەو دوو بۆچوونە بڵێت، ئەگەر خاوەن بۆچوونی بەرانبــەر ڕاست دەکــات -وەك تەحەدایــەك-، بــا بێــت، مــن و ئــەویش خۆمــان، و خێــزان و منداڵەکانمان بهێنین، و پاشان بڵێین: ئەوکەسەی کە لەو مەسئەلەیەدا نـەیپێکاوە، یاخوا خوای گەورە لە ڕەحمەتی خۆی دووری بخاتەوە.

بــەلاّم ئــەم بۆچــونەی ئیبنــو عــەباس ڕەفتــاری پــێ ناکرێــت، و هــەر مەسئەلەیەکیش پێویست بە عەول بکات، زانایان عەولیان تێدا کردوە.

## اليتيمتان، النصفيتان

بەو مەسئەلەیە دەوترێت کە تەنها دوو میرات بەری تێدایە، کە هەریەکەیان نیوەی میراتەکە دەبەن، وەك خاوەن بەشی دیاریکراو. ئەم حاڵەتەش تەنها لە دوو مەسئەلەدا ڕوو دەدات:

(١) مێرد، و یەك خوشکی دایك و باوکی.

(٢) مێرد، و یەك خوشکی تەنها باوکی.

جا لە هەردوو مەسئەلەکەدا مێردەکە نیوە دەبات، و هەریەك لە خوشکەکانیش نیوە دەبەن.

ئەم دوو مەسئەلەیەش بەم ناوەوە ناونراون، [١] چونکە لە هەموو مەسئەلەکانی میرات دابەش کردندا بێجگە لەم دوو مەسئەلەیە، مەسئەلەیەکی تر نیە، کە بەم شێوەیە دوو میرات بەری خاوەن بەشی دیاریکراوی تێدابێت، و هەریەکەشیان نیوە ببەن. بۆیە وەك دوو گەوهەری بێ وێنە وەهان.

١) الشنشوري ١٥٢، المغني ٣١، الكمثرى على الأنوار ٢ / ٨.

وە بە (نصفیتان) ناودەبرێن، چونکە مەسئەلەکە تەنها دوو خاوەن بەشی دیاری کراوی تێدایە کە هەریەکەیان نیوە دەبەن.

## الخرقاء، المسبعة، المسدسة، المخمسة، المربعة، المثلثة، العثمانية، الشعبية، الحجاجية

ئەم مەسئەلەیە یەکێکە لەو مەسئەلانەی کە ڕاو بۆچوونی زۆر و جیاوازی لەسەرە، هەربۆیە ناونراوە بە (خرقاء). مەسئەلەکەش بریتیە لە:

دایك، و باپیرە، و یەك خوشکی دایك و باوکی (یان تەنها باوکی).

دایکەکە سێیەك دەبات، و باپیرە، و خوشکەکەش ئەوەی کە دەمێنێتەوە بەپێی یاسای (للذكر مثل حظ الأنثيين) دابەشی دەکەن. کەواتە ئەصڵی مەسئەلەکە بریتیە لە سێ (٣).

دایکەکە یەك بەش دەبات، و دوو بەشیش دەمێنێتەوە بۆ باپیرە و خوشکەکە، بەڵام لەبەر ئەوەی کە ئەو دوو بەشە بە ساغی دابەش ناکرێت لە نێوان باپیرە و خوشکەکەدا، و نیسبەتی نێوان بەشەکە، و ژمارەی ئەوانیش بریتیە لە (تباین)، بۆیە ژمارەکەیان وەردەگرین -کە سێیە- و لێکدانی ئەصڵی مەسئەلەکەی دەکەین، و بەمەش ئەصڵی مەسئەلەکە دەبێت، بە نۆ (٩). ئەوجا دووبارە مەسئەلەکە دروست دەکەینەوە.

جا دایکەکە سێ بەش دەبات، و شەش بەشیش دەمێنێتەوە بۆ باپیرە، و خوشکەکە، باپیرەکە چوار بەش دەبات، و خوشکەکەش دوو بەش دەبات. بەمەش هەموو کەسێك بەساغی بەشی خۆی دەبات.

هەروەها ئەم مەسئەلەیە زۆر ناوی تری لیّ نراوە [1]، لەوانە:

(١) (مسبعة) چونکە حەوت راو بۆچونی جیاوازی لەسەرە.

(٢) (مسدسة) چونکە ئەگەرچی حەوت ڕاو بۆچونی لەسەرە، بەلاّم سەرئەنجام دەبێتەوە بە شەش بۆچوون.

(٣) (مخمسة) چونکە پێنج لە هاوەلاّنی حەزرەتی پێغەمبەر ناکۆکن تیایدا، کە ئەوانیش هەر پێنج ئیمام (عثمان وعلي وابن مسعود وزيد وابن عباس) خوایان لیّ ڕازی بێت.

(٤) (مربعة) چونکە عەبدولاّی کوڕی مەسعود نیوەی داوە بە خوشکەکە، و ئەو نیوەکەشی بەیەکسانی داوە بە دایك و باپیرەکە، بەمەش ئەصلّی مەسئەلەکە بوە بە چوار (٤).

(٥) (مثلثة، و عثمانية) چونکە ئیمامی عوثمان میراتەکەی کردوە بە سیّ بەشەوە، و هەرکەسەو یەك بەشی پێداوە.

(٦) (شعبية، و حجاجية) چونکە ئەگێڕنەوە کە حەجاجی کوڕی یوسف بەم پرسیارە (شەعبی) تاقی کردوەتەوە، ئەویش زانیویەتی، و ئیتر حەجاجیش لە گرتووخانە ئازادی کردوە.

## الزيديَات الأربع [2]

### (١) عشرية زيد

ئەم مەسئەلەیە یەکێکە لە مەسئەلە ژمێردراوەکان، کە تیایدا خوشکی دایك و باوکی برای باوکی دەژمێرێت لە دژی باپیرە. و مەسئەلەکەش بریتیە لە:

---

١) المهذب ٤١٩/٢، مغني ابن قدامة ٧٩/٧، المبسوط ٥٦٠/٧. الدرة ٩٥–٩٦، الكنوز ٢٢٧، الإنصاف ٣٦٠/٧

١) الفقه المنهجي ٢ / ٣٢٢ – ٣٢٤.

باپیرە، خوشکێکی دایك و باوکی، و برایەکی تەنها باوکی.

لێرەدا خوشکەکە بە باپیرەکە دەڵێت: من، و براکەم دەبینە هاوبەشی تۆ لە میراتەکەدا. کەواتە میراتەکە دەکرێت بە پێنج (٥) بەشەوە، کە ژمارەی باپیرە، و خوشك، و براکەیە — هەر نێرینەیەك بەرامبەر بە دوو مێیینە --، جا لەبەر ئەوەی کە لەم مەسئەلەدا برا بەشی بە سوود ترە بۆ باپیرەکە، بۆیە دوو (٢) بەش دەبات، و براکەش دوو (٢) بەش دەبات، و یەك (١) بەش بۆ خوشکەکە دەمێنێتەوە، ئەوجا خوشکەکە بە برا باوکیەکە دەڵێت: من خاوەن بەشی دیاری کراوم "کە نیوەیە"، تاوەکو بەشی من تەواو نەبێت، نابێت تۆ هیچ ببەیت، کەواتە لە بەشەکەی خۆت نیوەکەم بۆ تەواو بکە، ئەوجا براکە بەش و نیوێکی خۆی دەدات بە خوشکەکە، بەمەش بەشەکەی خوشکەکە تەواو دەبێت، بەڵام لەبەرئەوەی کە بەشی براکە بوە بە نیوەبەش، بۆیە بۆ ساغکردنەوەی مەسئەلەکە پێویست دەکات ئەصڵی مەسئەلەکە لێکدانی دوو بکەین، بەمەش ئەصڵی مەسئەلەکە دەبێت بە دە (١٠).

جا ئێستا چوار (٤) بەشی بۆ باپیرەکە بە برا بەشی، و نیوەی بۆ خوشکەکە کە دەکاتە پێنج (٥)، و یەك (١) بەشەکەش کە دەمێنێتەوە بۆ برا باوکیەکە بە عەصەبەگەرایەتی دەیبات.

جا ئەم مەسئەلەیەش ناونراوە بەم ناوەوە [1]، چونکە ئیمامی زەید لەم مەسئەلەدا ئەصڵی مەسئەلەکەی کردوە بە دە (١٠)، و دەیەکی داناوە بۆ برا باوکیەکە.

---

١) الشنشوري مع الباجوري ١٣٦ — ١٣٧.

## (٢) عشرينية زيد

ئـــەم مەســـئەلەیەش وەك مەســـئەلەكەی پێـــشوو یەكێكـــە لـــە مەســـئەلە ژمێردراوەكان، كە تیایدا خوشكی دایك و باوكی خوشكی تەنها باوكی دەژمێرێت لە دژی باپیرە. و مەسئەلەكەش بریتیە لە:

باپیرە، و خوشكێكی دایك و باوكی، و دوو خوشكی تەنها باوكی.

لەم مەسئەلەیەشدا ئەصڵی مەسئەلەكە بریتیە لە پێنج، كە ژمارەی بـاپیرە و خوشكەكانە. جا باپیرەكە دوو بەش دەبات، و سێ بەشیش دەمێنێتـەوە بـۆ سـێ خوشكەكە، بەڵام خوشكە دایك و باوكییەكە بە دوو خوشكە تـەنها باوكییـەكان دەڵێت: من خاوەن بەشی دیاری كراوم -- كە نیوەیە --، تاوەكو بەشی من تەواو نەبێت، نابێت ئێوە هیچ ببەن، كەواتە لە بەشـەكەی خۆتـان نیوەكـەم بـۆ تـەواو بكەن، ئەوجا دوو خوشكە تەنها باوكییەكـە بـەش و نیوێـك دەدەن بـە خوشـكە دایك و باوكییەكە، بەمەش بەشەكەی خوشكە دایك و باوكییەكە تەواو دەبێـت، بەڵام لەبەرئەوەی كە بەشی دوو خوشكە تەنها باوكییەكە بریتیە لە نیو بـەش، و هەر یەكەیان نیوەی ئـەو نیـو بەشـەیان دەكـەوێت (واتـە چـواریەك)، بۆیـە بـۆ ساغكردنەوەی مەسئەلەكە پێویست دەكات ئەصڵی مەسـئەلەكە لێكـدانی چـوار بكەین، بەمەش ئەصڵی مەسئەلەكە دەبێت بە بیست (٢٠).

جا ئێستا باپیرەكە هەشت بەش دەبات، و خوشكە دایك و باوكییەكـەش دە بەش دەبات، و دوو خوشكە تەنها باوكیەكەش بە هـەردووكیان دوو بـەش دەبـەن (واتە یەكی یەك بەش).

ئەوجا ئەم مەسئەلەیەش ناونراوە بەم ناوەوە [1]، چونكە ئیمـامی زەیـد لـەم مەسئەلەدا ئەصڵی مەسئەلەكەی كردوە بە بیست (٢٠).

---

١) منار السبيل ٢ / ٤٢، دليل الطالب ٢ / ٤٢.

## (٣) مختصرة زيد

ئـەم مەسـئەلەیەش وەك دوو مەسـئەلەكەی پێـشوو یەكێكـە لـە مەسـئەلە ژمێردراوەكان، كە تیایدا خوشكی دایك و بـاوكی بـرا و خوشـكی تـەنها بـاوكی دەژمێرێت لە دژی باپیرە. و مەسئەلەكەش بریتیە لە:

دایك، و خوشكێكی دایك و باوكی، برا و خوشكێكی تەنها باوكی، و باپیرە.

دایكەكە شەش یەك دەبات، باپیرەكەش سێیەكی پاشماوە دەبات، و خوشكە دایك و باوكیەكەش نیوە دەبات، و براو خوشكە تەنها باوكیەكانیش عەصەبەن. كەواتە ئەصڵی مەسئەلەكە بریتیە لە شەش (٦)، بەڵام بەهۆی بەشی باپیرەكەوە دەبێت بە هەژدە (١٨).

دایكەكە سێ بەش دەبات، و پازدە بەشیش دەمێنێتەوە، باپیرەكە سێیەكی ئەو پازدەیە دەبات، كە دەكاتە پێنج، و خوشكە دایك و باوكیەكەش نۆ بەش دەبات، یەك بەشیش دەمێنێتەوە بۆ برا و خوشكە تەنا باوكیەكان.

بەڵام لەبەر ئەوەی كە ئەو یەك بەشە بەساغی دابەش ناكرێت بەسەر براو خوشكەكەدا، و لە هەمان كاتیشدا لە نێوان بەشەكە و ژمارەیاندا (تباين) هەیە، بۆیە بۆ ساغكردنەوەی مەسئەلەكە، ئەصڵی مەسئەلەكە لێكدانی ژمارەی براو خوشكەكە دەكەین كە سێیە، بەمەش ئەصڵی مەسئەلەكە دەبێت بە پەنجا و چوار (٥٤). ئێستا دووبارە مەسئەلەكە دروست دەكەینەوە.

دایكەكە نۆ بەش دەبات، و باپیرەكەش پازدە بەش دەبات، و خوشكە دایك و باوكیەكەش بیست و حەوت بەش دەبات، و سێ بەشیش دەمێنێتەوە بۆ براو خوشكە تەنها باوكیەكە.

ئەوجا ئەم مەسئەلەیە ناونراوە بەم ناوەوە[١]، چونكە ئیمامی زەید فەرموو یەتی: باپیرەكە لەم مەسئەلەیەدا سێیەكی پاشماوە، و برا بەشی یەكسانن بۆی،

١) مغني ابن قدامة ٧ / ٨٠، الشرح الكبير ٧ / ٢١، العدة شرح العمدة ١ / ٣٠٣

بۆیە ئەگەر سێیەکی پاشماوەی بدرێتێ، ئەوا ئەصڵی مەسئەلەکە لە پەنجا و چوار ساغ دەبێتەوە، وە ئەگەر بشکرێت بە برا بەش، ئەوا مەسئەلەکە لە صەد و هەشت، ساغ دەبێتەوە، بەڵام دواتر دووبارە کورت دەبێتەوە بۆ پەنجاو چوار.

## (٤) تسعينية زيد

ئەم مەسئەلەیەش وەك سێ مەسئەلەکەی پێشوو یەکێکە لە مەسئەلە ژمێردراوەکان، کە تیایدا خوشکی دایك و باوکی برا و خوشکی تەنها باوکی دەژمێرێت لە دژی باپیرە. و مەسئەلەکەش بریتیە لە: دایك، خوشکێکی دایك و باوکی، و دوو برا و خوشکێکی تەنها باوکی، و باپیرە.

دایکەکە شەش یەك دەبات، باپیرەکەش سێیەکی پاشماوە دەبات، و خوشکە دایك وباوکییەکەش نیوە دەبات، و براو خوشکە تەنها باوکییەکانیش عەصەبەن. کەواتە ئەصڵی مەسئەلەکە بریتیە لە شەش (٦)، بەڵام بەهۆی بەشی باپیرەکەوە دەبێت بە هەژدە (١٨).

دایکەکە سێ بەش دەبات، و پازدە بەشیش دەمێنێتەوە، باپیرەکە سێیەکی ئەو پازدەیە دەبات، کە دەکاتە پێنج، و خوشکە دایك و باوکییەکەش نۆ بەش دەبات، یەك بەشیش دەمێنێتەوە بۆ دوو برا و خوشکە تەنا باوکیەکان.

بەڵام لەبەر ئەوەی کە ئەو یەك بەشە بەساغی دابەش ناکرێت بەسەر براو خوشکەکەدا، و لە هەمان کاتیشدا لە نێوان بەشەکە و ژمارەیاندا (تباين) هەیە، بۆیە بۆ ساغکردنەوەی مەسئەلەکە، ئەصڵی مەسئەلەکە لێکدانی ژمارەی براو خوشکەکە دەکەین کە پێنجە، بەمەش ئەصڵی مەسئەلەکە دەبێت بە نەوەد (٩٠). ئێستا دووبارە مەسئەلەکە دروست دەکەینەوە.

دایکەکە پازدە بەش دەبات، و باپیرەکەش بیست و پێنج بەش دەبات، و خوشکە دایك و باوکییەکەش چل و پێنج بەش دەبات، و پێنج بەشیش

دەمێنێتەوە بۆ دوو برا و خوشکە تەنها باوکی‌یەکە، هەریەك لە براکان دوو بەش دەبات، و خوشکەکەش یەك بەش دەبات.

ئەم مەسئەلەیەش ناونراوە بەم ناوەوە، چونکە بە لای ئیمامی زەیدەوە ئەصڵی مەسئەلەکە لە نەوەد ساغ دەبێتەوە.[1]

---

١) مغني ابن قدامة ٧ / ٨٠، العدة شرح العمدة ١ / ٣٠٣، الإقناع ٣ / ٨٣.

# کۆتایی

## بابەتێکی زیندووی هەستیار (١)

دووژمنانی ئاینی پیرۆزی ئیسلام لە دێر زەمانەوە، چی لە دوور و چی لە نزیك، و چی بە خۆیان، یان لە ڕێگەی دەلاڵ و کاسەلێس، و ئەوانەی کە کۆنەی بێ باوەڕان دەهێنن، و لەم ولاتەی ئێمەدا بە نرخی تازە دەیفرۆشنەوە بە خەڵکی نەشارەزا، و بێ ئاگا لە ئەحکامەکانی ئەم ئاینە پیرۆزە، هەمیشە و بەردەوام لە پیلانگێڕاندا بوون بۆ دۆزینەوەی تەنها کەلێنێك کە ژەهری پیسی خۆیانی تێدا بڕێژنە لاشەی ئەم بەرنامە خوایی‌یەوە .

وە یەکێك لەو بەناو دەروازانەی کە لە ڕێگەیەوە بە عەقلی نەزان و نەفامی خۆیان ڕەخنەی بەناو ڕەخنە ئاراستەی ئەم ڕێباز و پەیامە خودایی‌یە دەکەن، ئەوەیە کە دەڵێن:

• ئیسلام مافی کەمی داناوە بۆ (ئافرەت، ژن) لە میرات بردندا، ئەوەتە بە دوو مێیینەوە بەشی نێرینەیەکیان دەداتی، جا بەڕاستی ئەمە ستەمێکی گەورەیە کە ئیسلام لە مێیینەی کردوە، و مافی وەکو پێویست نەدراوەتێ، ئەم جیاوازی کردنەش لە نێوان نێرینە و مێیینەدا سەرچاوە لەوەوە دەگرێت کە ئەم کۆمەڵگایە

---

١) ئەم باسە پوختەی نوسراوێکی خۆمە بە زمانی عەرەبی بە ناونیشانی (في ظلِّ آية للذكر مثلُ حظِّ الأنثيين) کە لە گۆڤاری (پەیڕەو) لە ژمارە (٤٦ - ٤٧) ساڵی (١٤٢٩) ی کۆچیدا بلاو کراوەتەوە، کە بە تێروتەسەلی وەڵامی هەموو ئەو بەناو ڕەخنانەی تێدا دراوەتەوە.

بە چاوێکی کەمەوە تەماشای مێینە دەکات، بـە جۆرێـك وەك بڵێیـت مێینـە مرۆڤی تەواو نیە، بەڵکو نیوە مرۆڤە، ئەگینا بۆچی نیوەی نێرینە میرات دەبات؟!

هەروا بەردەوام دەبن لەسەر بەناو ڕەخنەکانیان، و دەڵێن:

• خۆ لە دونیای ئەمڕۆدا مێینەش بە هەمان هەوڵ و کۆششێك کە نێرینە دەیدات بۆ بەڕێوەچوونی کاروبارەکانی خێزان، و بەڵکو کۆمەڵگەش بە گشتی، ئەمیش ماندوو دەبێت، چالاکانە خزمەت دەکات لە هەموو بوارەکاندا، و گەشەسەندن، و بەرەوپێشچوونی وڵات بەسراوە بە لێبڕان و کۆششی هەردوو ڕەگەزەکەوە، ئیتر ئەم جیاوازیە لە پای چی؟!

• ئایا بڕیارەکانی شەریعەتی ئیسلام قابیلی گۆڕان نین؟ ئەی وەك چۆن دونیـا بەوەی کـە هەیـە ڕۆژ لـەدوای ڕۆژ لـە گەشەسـەندن، و گۆڕاندایـە، ئایـا بۆچـی بڕیارەکانی شەریعەتیش بەجۆرێك نەگۆڕدرێن کە لەگەڵ ئەم هەموو گۆڕانکاریـەدا بگونجێن.

• ڕاستە کە لە ڕواڵەتدا بەزۆری لاشە و توانای نێرینە لە مێینە بەهێزتر و زیاترە، بەڵام ئەمە وەها ناگەیەنێت کە هەموو نێرینەیەك لە هەموو مێینەیەك بەتواناترە.

• ئەگەرچی لە سەردەمانێکدا مێینە کار و هەڵسوکەوتیان تەنها لە چوارچێوەی ماڵ و پێویستیەکانی خێزانەوە بوو، بەڵام چالاکی ئەمڕۆی ئەم ڕەگەزە زۆر لەبەر چاوە لە زۆر بواردا، ئەو سەردەمە بەسەر چوو کە بوترێت: باوەکو مێینە تەنها کاری خواردن لێنان، و جل و بەرگ شۆردن، و خزمەتی منداڵ و ناوماڵ بێت، بەڵکو بە هەوڵ و ڕەنجی زۆرێك لە ئافرەتان، ئەمڕۆ زۆرێك لە پیاوان دەتوانن بژێوی ژیانیان مسۆگەر بکەن، کەواتە ئەم جیاوازیە بۆچی؟!

• ئەوەی کە ئیسلام دەیلێت، پەسەندە بۆ کاتێك کـە ئـافرەت دوور بـوو لـە بازاڕ و کار و پیشـەوە، بـەڵام ئێـستا بـوە بـە هاوبەشـی ژیـان، و بەشـداریەکی

چالاکانە و بەرچاوی هەیە، باشە بۆچی تەنها کوڕ بەرپرس بێت لە بەرامبەر بژێوی ژیانی باوك، کاتێك کە توانای کارکردنی نامێنێت؟ چی ڕێگرێك هەیە لەوەدا کە خوشکەکەشی لەم کارەدا یارمەتی بدات؟ یان بۆچی بەتەنها کوڕی گەنج تێچوون و خەرجی پێکەوەنانی خێزان، و مارەیی، و خانوو، و پێویستیەکانی تری لەسەر بێت؟ لە هەمان کاتدا خێزان و هاوسەرەکەشی وەك ئەو کاردەکات، و پیشەدارە، و پارە پەیدا دەکات؟! جا کەوابوو نێر و مێ هەردووکیان لە خۆشی و ناخۆشیدا بەیەکەوەن، و سود و زیان بە یەکسانی ڕوو لە هەردووکیان دەکات، وە هەردووکیان پێکەوە ڕووبەڕووی هەموو کێشەکان دەبنەوە، وەك لە زۆرێك لە کۆمەڵگاکاندا، کەوابوو ئەو هۆکار و پاڵپێوەنەرەی کە پێشتر هەبوە بۆ ئەو جیاوازی کردنە، ئێستا نەماوە، بۆیە دەبێت لە میراتیش دا وەك یەك وەها بن، و جیاواز نەبن.

ئەمانەو زۆرێکی تریش لە پڕوپاگەندە و خەیاڵاتی پوچەڵ کە مێشکی هەندێك خەڵکی ساویلکەی بەناو موسوڵمانیان پێ ئاخنیوە، جا خاوەنی ئەم پرسیارە نابەجێیانە، هەر دەبێت یەکێك لەم دوو کۆمەڵ و تاقمە بن:

(١)دوژمنانی ئاینی پیرۆزی ئیسلام، لە دەرەوەی کۆمەڵگای موسوڵمانان، کە دوور بەدوور تیری ژەهراوی خۆیان دەهاون بۆ لاشەی ئەم ئاینە خاوێنە بێخەڵتە و بێلەکە، بە بەرچاوی خەڵکی موسوڵمانی بێ ئاگای خەڵەفاو بە دونیا و لەزەتەکانی.

(٢)کۆمەڵێك سەر لێ شێواوی ئارەزووباز و گێل، یان خۆگێلکەر لە کەسانی ناو ئەم کۆمەڵگای خۆمان، کە یەکێکە لەو کۆمەڵگا و گەل و میلەتانەی کە بە شێوەیەکی ئارەزوومەندانە ئەم ئاینەیان وەرگرتوە، و بە مێژوویەکی دوور و درێژ بە کوێرایی چاوی ئەوان، بە تەواوی بڕوا و قەناعەتەوە دڵبەستەی تەواوی بڕیارەکانی بوون، بەڵام وەك باپیرانمان وتوویانە (چەم بێ چەقەڵ نابێت)، هەندێك لەزەتی کاتی، و پول و پارە سەری لێ شێواندون، بێ ئاگان، یان خۆیان بێ

ئاگاکردوە لە تەفصیلاتی بڕیارە شەرعی‌یەکان سەبارەت بە ماف و میراتی ئافرەت لە ئیسلامدا.

بۆیە بە پێویستی دەزانم کە بە خۆری پڕنووری ئیسلام، پرشێك بنێرم بۆ ئەو دڵە تاریکانە، تاوەکو ئەگەر ئامادەیی‌یان هەبێت ڕووناك ببنەوە، وە کەمێك لە ئاوی زولاڵ و ڕوون و بێگەردی ئەم ئاینە بکەم بەسەر دڵی ڕەش و چڵکن بە تاوانی بێ بڕوایی‌یان تاوەکو خاوێن و بێ‌پەڵەکە ببێتەوە، ئیتر ئەم نەخۆشیانە بۆ هەتاهەتایە بنبڕ بن و نەمێنن، کە موسوڵمان پێیانەوە گیرۆدە بێت، و بە دەردی بێ دەرمانیان بزانێت.

سەرەتا دەڵێم:

سەرچاوەی ئەو گومانە خراپەی کە بەم ئاینە پیرۆزە براوە ئەو تێگەیشتنە هەڵە و نادروستەیە لە مانای ئایەتی یازدەی سورەتی (نساء) کە دەفەرموێت: ﴿يُوصِيكُمُ اللَّهُ فِي أَوْلَادِكُمْ لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الْأُنثَيَيْنِ﴾، وە ئایەتی صەد و حەفتا و شەشی هەمان سورەت کە دەفەرموێت: ﴿وَإِن كَانُوا إِخْوَةً رِّجَالًا وَنِسَاءً فَلِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ الْأُنثَيَيْنِ﴾.

بۆیە منیش دەمەوێت لە مانا ڕاستەقینەکەی ئەو دوو ئایەتەوە دەست پێ بکەم، و ڕوونکردنەوەیەکی وەها بدەم بە ڕەخنەگران، تێیان بگەیەنێت، کە مانای ئەم دوو ئایەتە هەر پەیوەندیشی نیە بەو بنەما یەکسانی‌یەی کە ئەوان بانگەشەی بۆ دەکەن، و هیچ جۆرە دژایەتی، و ناچوونیەکی‌یەکی نیە لەگەڵیدا.

## پێوەرەکانی جیاوازی نێوان میراتی نێرینە و مێیینە

ئێمە وەکو موسوڵمان بڕوای تەواومان بەوە هەیە کە خودای گەورەدا کۆمەڵێك صیفاتی هەیە، ئەوەمان تێدەگەیەنێت کە هەرگیز نابێت هیچ جۆرە گومانێکی لەم جۆرە بدرێتە پاڵی، یەکێك لەو صیفاتانە ئەوەیە کە خودای گەورە لە بڕیارەکانیدا زۆر دادوەرە، وە لەو بەرنامانەی کە بۆ ئێمەی ئادەمیزادی ناردوە هیچ جۆرە ستەمێکی بەرامبەر هیچ کەسێك، و بگرە هیچ درووستکراوێکیشی تێدا نیە، وە ئەم ڕاستیەش لە چەند ئایەتدا دووپات کراوەتەوە، وەك ئەم ئایەتانە: ﴿وَلَا يَظْلِمُ رَبُّكَ أَحَدًا ﴿٤٩﴾﴾ الكهف، ﴿وَلَا يُظْلَمُونَ فَتِيلًا ﴿٤٩﴾﴾ النساء، ﴿وَأَنَّ ٱللَّهَ لَيْسَ بِظَلَّٰمٍ لِّلْعَبِيدِ ﴿١٠﴾﴾ الحج، ﴿وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيَظْلِمَهُمْ ﴿٤٠﴾﴾ العنكبوت، ﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَظْلِمُ مِثْقَالَ ذَرَّةٍ ﴿٤٠﴾﴾ النساء، ﴿وَلَا يُظْلَمُونَ نَقِيرًا ﴿١٢٤﴾﴾ النساء، ﴿فَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيَظْلِمَهُمْ ﴿٧٠﴾﴾ التوبة.

وە ئەو جیاوازیانەش کە لە بەشی هەموو میرات بەرەکان، لە میرات بەرێکەوە بۆ میرات بەرێکی تر، و لە حاڵەتێکەوە بۆ حاڵەتێکی تر، پەیوەندی بە جۆری میرت بەرەکەوە نیە کە ئایا مێیینەیە یان نێرینە، بەڵکو سەرچاوەی جیاوازیەکە لەم سێ پێوەرەدا خۆی دەبینێتەوە:

### (١) پلەی خزمایەتی نێوان میرات بەر و مردوەکە

ئیتر میرات بەرەکە نێر بێت یان مێ، بە جۆرێك کە چەندە پەیوەندی خزمایەتیەکە نزیك تربێت، ئەوەندە بەشی ئەو میرات بەرە لە میراتەکە زیاد دەبێت، وە بە پێچەوانەشەوە، چەندە پەیوەندیەکە دوورتربێت، ئەوەندە بەشە میراتەکەش کەم دەبێت، ئیتر بێ گوێدانە ڕەگەزی میرات بەرەکە، کە نێرە یان مێیە.

بۆ نمونە: کچێك نیوەی میراتەکەی دایکی دەبات لەگەڵ ئەوەشدا کە مێیینەیە، کەچی باوکی ئەو کچە کە مێردی ژنە مردوەکەیە، چواریەکی میراتەکە دەبات، خودای گەورە دەفەرموێت: وَإِن كَانَتْ وَٰحِدَةً فَلَهَا ٱلنِّصْفُ ..... إِن لَّمْ يَكُن لَّهُنَّ وَلَدٌ فَإِن كَانَ لَهُنَّ وَلَدٌ فَلَكُمُ ٱلرُّبُعُ مِمَّا تَرَكْنَ .

هۆی ئەم جیاوازییەش دەگەڕێتەوە بۆ پلەی خزمایەتی نێوان کچ و دایکەکەیەتی، کە نزیك ترە لە پلەی خزمایەتی نێوان مێرد و ژنەکە، هەر لەبەر ئەمەیە کە بەشە میراتی کچەکە لە بەشە میراتی مێردەکە (کە باوکی کچەکەیە) زیاترە.

## (٢) جێگە و پێگەی میرات بەرەکە

کە بێ گومان هەر نەوە و وەچەیەك کە سەرەتای بەرەو ژیان چوونی بێت، و زیاتر ئامادەبێت کە ڕووبەڕووی ناڕەحەتیەیەکانی ژیان ببێتەوە، ئەو میرات بەرە دەبێت بەشە میراتی لەو نەوە و میرات بەرانەی تر زیاتربێت کە پشتیان کردوەتە ژیان، و تەمەنیان بەرەو کۆتایی دەچێت، و قورساییەیەکانی ژیانیان لەسەر سووك دەبێت، بەڵکو نەك هەر سوك دەبێت، بگرە ناڕەحەتیەیەکانیان دەکەوێتە سەر کەسانێکی تر، ئەم پێوەرەش هیچ ڕەچاوێکی ڕەگەزی میرات بەرەکانی تێدا نیە.

بۆ نمونە: بەشە میراتی کچی مردوەکە زیاترە لە بەشە میراتی دایکی مردوەکە، لەگەڵ ئەوەشدا کە هەردووکیان مێیینەن، خودای گەورە دەفەرموێت: وَإِن كَانَتْ وَٰحِدَةً فَلَهَا ٱلنِّصْفُ وَلِأَبَوَيْهِ لِكُلِّ وَٰحِدٍ مِّنْهُمَا ٱلسُّدُسُ مِمَّا تَرَكَ إِن كَانَ لَهُۥ وَلَدٌ فَإِن لَّمْ يَكُن لَّهُۥ وَلَدٌ وَوَرِثَهُۥٓ أَبَوَاهُ فَلِأُمِّهِ ٱلثُّلُثُ فَإِن كَانَ لَهُۥٓ إِخْوَةٌ فَلِأُمِّهِ ٱلسُّدُسُ .

هەروەها کچی مردوەکە لە باوکی مردوەکە میرات زیاتر دەبات، کاتێك کە کچەکە برایەکی خۆی لەگەڵدا بێت، چونکە باوکی مردوەکە شەش یەك دەبات کاتێك کە مردوەکە کوڕی هەبێت، ئەوجا ئەو پێنج بەشەش کە دەمێنێتەوە کوڕ و کچەکە دەیبەن بەپێی یاسای (لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ ٱلْأُنثَيَيْنِ).

## (٣) ئەرکی ماڵی و دارایی:

جیاوازییەك کە بەدی دەکرێت لە نێوان نێرینە و مێیینە، زیاتر لەم پێوەرەدا ڕەنگ دەداتەوە و دەردەکەوێت، بەڵام جیاوازیەکە هەرگیز بەو جۆرە نیە کە ستەمی بۆ مێیینەکە تێدابێت، و ببێت بە هۆی خواردن و پێشێل کردنی مافەکانی، بەڵکو ئەگەر بە وردی بۆی بڕوانین، دەبینین پێچەوانەکەی لە ڕاست دەچێت.

بۆ نمونە: ئەگەر دوو میرات بەر لە هەردوو پێوەرەکەی پێشوودا وەکو یەك بوون، وەك منداڵی مردوەکە، نێرینە و مێیینە پێکەوە، ئەوکاتە دەبێت ئەم پێوەرەی سێیەم ڕەچاو بکرێت بۆ جیاوازی بەشە میراتی نێرینە و مێیینە لە یەکتر، هەر لەبەر ئەمەیە کە خودای گەورە ئەو جیاوازیەی گشتگیر نەکردوە بۆ هەموو میرات بەران، بە جۆرێك کە ئایەتی (لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ ٱلْأُنثَيَيْنِ) وەك یاسایەکی گشتی دابنرێت کە هەموو کات لە کاتی کۆبوونەوەی نێرینە و مێیینەدا جێبەجێی بکرێت، وەکو چۆن ڕەخنەگران لێکی دەدەنەوە، بەڵکو ئەم یاسایە تەنها بۆ حاڵەتێکی تایبەتە کە خودای گەورە لە سەرەتای ئایەتەکەوە باسی لێوە دەکات وەك دەفەرموێت: يُوصِيكُمُ ٱللَّهُ فِىٓ أَوْلَٰدِكُمْ. واتە حاڵەتی کۆبوونەوەی منداڵ بەیەکەوە، کاتێك کە نێرینە و مێیینەی منداڵەکان بەیەکەوە کۆبوونەوە، ئەوا نێرینەکان مێیینەکان دەکەن بە عەصەبە، ئەوا یان هەموو میراتەکە دەبەن پێکەوە، یان پاشماوەی خاوەن بەشە دیاریکراوەکان دەبەن پێکەوە،

بەجۆرێك كە هەر نێرینەیەك دوو بەرامبەری مێیینەیەك میرات دەبات، هەروەها ئەم یاسایە جێبەجێ دەكرێت كاتێك كە برا و خوشكی باوك و دایكی، یان تەنها باوكیش بەیەكەوە كۆبوونەوە، وەك خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَإِن كَانُوٓاْ إِخۡوَةٗ رِّجَالٗا وَنِسَآءٗ فَلِلذَّكَرِ مِثۡلُ حَظِّ ٱلۡأُنثَيَيۡنِ ١٧٦﴾.

كەواتە حیكمەت لەم جیاوازیەدا بە تایبەتی ئەوەیە كە نێرینە پێویستە لەسەری و ئەركی سەرشانی خۆیەتی كە بژێوی ژیانی خێزان و منداڵەكانیش دەستەبەر و پەیدا بكات، لە كاتێكدا كە مێیینە ژیان و بژێوی خۆی و منداڵەكانیشی دەكەوێتە ئەستۆی ئەو نێرینەیەی كە لەگەڵیدا دەژی.

بەمەش ئەگەرچی مێیینە لەم حاڵەتەدا بە ڕواڵەت وەها دەردەكەوێت كە بەشە میراتەكەی كەم ترە لە بەشە میراتی نێرینە، بەڵام ئەگەر بە وردی بۆی بڕوانین دەبینین: كە ئەو بەشە میراتەی كە بۆ ئەم مێیینەیە دانراوە، بە مافێكی سەربەخۆ دادەنرێت بۆی، و دەتوانێت پاشەكەوتی بكات، و هیچی لێ خەرج نەكات، بۆ ئەوەی كە هەر نوقسانیيەكی هەبێت پێی پڕ بكاتەوە، و ژیانی خۆیی پێ تەئمین بكات، كە ئەمەش یەكێكە لە حیكمەتە خوداییيەكان كە زۆر كەسی بێئاگا هەستی پێ ناكەن.

ئەمە لەلایەك كە مێیینە ئەركی ماڵی و دارایی لەسەر نیە، بەڵام نێرینە ئەركەكانی یەكجار زۆرە، لەوانە:

أ. نێرینە هەر لەسەرەتای پێكهێنانی خێزان و دەست پێكردنی ژیانی هاوسەری پێویستە لەسەری كە مارەیی بدات بە هاوسەرەكەی، ئەم مارەییيەش بریتیە لە ئەركێكی ماڵی و دارایی كە ژنخواز دەیدات بە ئافرەتەكە لە سەرەتای پێكەوەنانی ژیانی هاوسەریدا، جا ئەم مارەییيەش تەنها دەكەوێتە ئەستۆی

نێرینە، و ئەم بۆی نیە کە داوای مارەیی بکات لەو ئافرەتەی کە داخوازی کردوە. خودای گەورە دەفەرمویێت: ﴿وَءَاتُواْ ٱلنِّسَآءَ صَدُقَٰتِهِنَّ نِحۡلَةٗ ۚ ٤﴾ النساء

ب. پیاو لەپاش ژن مارەبڕین، و ژن گواستنەوە ئەرکی خەرجی کێشانی ئەو ژنەی دەکەوێتە ئەستۆ، ئەگەرچی ژنەکە لە پیاوەکەش دەوڵەمەند تربێت، کەواتە ئەم پیاوە بۆی نیە کە داوای ئەوە بکات کە باوەکو ژنەکە خەرجی لەسەر خۆی بێت، چی جای ئەوەی کە خەرجی ئەم بکێشێت، چونکە ئاینی ئیسلام ئەم تایبەتمەندیەی داوە بە ئافرەت و نەیداوە بە پیاو.

ت. پیاو ئەرکی بەخێوکردن و خەرجی کێشانی خزمانیشی لە ئەستۆدایە، وەك چۆن ئەرکی خێزانەکەشی لە ئەستۆدایە، سەرەڕای هەندێك ئەرکی کۆمەڵایەتی تریش.

کەواتە ئەم هۆیانە وەهامان لێ دەکەن کە ئێمە بە شێوەیەکی ورد تر بڕوانینە مەسئەلەکە.

ڕاستە کە لەو حاڵەتەی کە باسمان کرد مێیینە نیوەی نێرینە میرات دەبات، بەلاّم بزانین ئایا ئەو بەشە زۆرەی کە بە نێرینەکە دراوە بەرەو کوێ دەچێت، و چی بەسەردێت، وە بە هەمان شێوە بەشە کەمەکەی مێیینەکەش چی بەسەردێت.

وەك وتمان ئاینی ئیسلام ئەو مافەی داوە بە مێیینە کە بەشە میراتی خۆی پاشەکەوت بکات، و هیچی لێ خەرج نەکات، تەنها زەکات دەرکردن نەبێت، کە ئەویش پەیوەندی بە ماڵەوە هەیە نەك بە خاوەنەکەی، بەلاّم نێرینەکە کە بەشە زۆرەکەی پێدراوە، لە هەمان کاتدا ئەرکی خەرجی خێزان و منداڵەکانی، و دایك و باوکی کە تەمەنیان چوەتە سەرەوە، وە خەرجی خزم و کەس و کار، و خزمەتکار، و هەموو ئەو پێداویستیـیە نوێیانەی ئەمڕۆ، وەك کرێ خانوو، و پارەی کارەبا، و ئاو، و تەلەفوون، و پێویستیـیەکانی تر. ئەمەش بڕوای تەواومان

بۆ دروست دەکات کە ئەگەر ئاوا دوور بڕوانین دەزانین کە بەشی مێیینەکە لە بەشی نێرینەکە زۆرترە، نەك بە پێچەوانەوە، وەك ئەوان دەڵێن!

چونکە مێیینە لە هەر جێگەیەکدا بژی ئەوا نێرینەیەك دەبێت کە خەرجی بکێشێت، و خزمەتی بکات، و لێی بەرپرسیاربێت. وەك دەبینین، تاوەکو لە ماڵی باوکیدایە، باوکی خزمەتی دەکات، جائەگەر باوکی نەمابێت، ئەوا براکەی یان مامی یان خاڵی بەم ئەرکە هەڵدەسێت، وە ئەگەر شووی کرد، ئەوا مێردەکەی لێی بەرپرسیارە کە مارەیی بداتێ، و خەرجی بۆ بکات، و خانووی بۆ دابین بکات، و هەموو پێویستییەکانی ژیانی بۆ فەراهەم بکات، باوەکو ژنەکەش دەوڵەمەند تر بێت، بەمەش ئەو مێیینە لەلایەك میراتی وەرگرتوە و خەرجی ناکات، وە لەلایەکی تریشەوە مارەییان پێداوە، کە بێجگە لەوەی کە دەتوانێت پاشەکەوتی بکات، دەشتوانێت بیخاتە پرۆژەیەك کە قازانج و سوودی زیاتری لێ بکات.

کەواتە دەکرێت بڵێین: لەوەدا کە ئیسلام ئەو نیوەیەی بۆ داناوە جۆرە فەزڵێکی تێدایە بەسەر نێرینەدا، بەڵام لە هەمان کاتدا پێویستی بەم بەشە میراتە هەیە، بەهۆی ئەوەی کە بە شێوەیەکی گشتی لە نێرینە بێ هێز ترە، هەروەها ماندووبوون و ئەرکی سك پڕی و دایکایەتی و پەروەردەکردنی منداڵ و چەند ئەرکێکی تر وەها دەکەن کە ئەم مێیینە توانای کارکردن، و دەست خستنی پارەی نەبێت، بەو جۆرەی کە نێرینە توانای هەیە، بۆیە دەکرێت بڵێین: لەوەشدا کە ئەرکێکی زۆر کەوتوەتە سەر شانی نێرینە، هیچ جۆرە ستەمێکی تێدا نیە دەرهەق بەو نێرینەیە، وە ناشڵێین کە ئیسلام فەزڵی مێیینەی داوە بەسەر نێرینەدا.

وە ئەو بەشە میراتەش کە دانراوە بۆ مێیینە، ئیسلام ڕەچاوی ئەوەی کردوە کە ئەگەر مێیینەیەك، باوکی نەمابوو، وە برا و مام و خاڵیشی نەبوو، وە

شووشی نەکردبوو، کە ئەم حاڵەتەش زۆر کەمە، لەم کاتەدا کە کەسێك نیە خەرجی بکێشێت، ئەم ماڵەی دەدرێتی وەك ماڵێکی ئیحتیات، بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی ئەو جۆرە حاڵەتانە.

پێم باشە کە نمونەیەك بێنینەوە تاوەکو زیاتر مەسئەلەکەمان لەلا ڕوون ببێتەوە:

پیاوێك مردوە: شەش هەزار (٦٠٠٠) دیناری لەپاش بەجێ ماوە، و تەنها کوڕێك، و کچێکیشی هەیە.

لەم مەسئەلەیەدا کوڕەکە چوار هەزار (٤٠٠٠) دیناری پێدەدرێت، و کچەکەش دوو هەزار (٢٠٠٠)، جا وەك وتمان: خراپترین حاڵەتی کچەکە ئەوەیە کە تەنها خەرجی خۆی بکێشێت و بەس، کە لەم کاتەدا دوو هەزارەکە پارەیەکی باشە بۆ ئەم مەبەستە، وە لە کاتێکدا کە شوو دەکات، ئەو کاتە خەرجیەکەی دەکەوێتە ئەستۆی مێردەکەی، و دەتوانێت کە هەموو دوو هەزارەکەی بۆ بمێنێتەوە، بەڵام کوڕەکە کە چوار هەزاری بردوە، دەبێت ژن بهێنێت، و مارەییشی بدات، و خەرجیشی بکێشێت، کەواتە ئەو چوار هەزارە تەنها بۆ کوڕەکە نەبوو، بەڵکو بۆ دوو کەس بوو.

جا ئێستا ئەگەر بپرسین: ئایا کامیان زۆرتریان بردوە؟ بێ گومان کەسی ژیر دەڵێت: مێیینەکە، چونکە بەرپرس نیە لە بژێوی هیچ کەسێك.

هەر لەبەر ئەمە، هەرکاتێك مەسئەلەی بژێوی و نارەحەتیەکانی ژیان لە ئارادا نەبێت، بێ گومان ئەو کاتە جیاوازیەکەش نامێنێت، وەك دەبینین خودای گەورە جیاوازی نەکردوە لە نێوان برا و خوشکی تەنها دایکی لە میرات دا، وەك دەفەرموێت: ﴿وَإِن كَانَ رَجُلٌ يُورَثُ كَلَٰلَةً أَوِ امْرَأَةٌ وَلَهُۥٓ أَخٌ أَوْ أُخْتٌ فَلِكُلِّ وَٰحِدٍ مِّنْهُمَا ٱلسُّدُسُ ۚ فَإِن كَانُوٓا۟ أَكْثَرَ مِن ذَٰلِكَ فَهُمْ شُرَكَآءُ فِى ٱلثُّلُثِ ۚ﴾ .

کەواتە لێرەدا جیاوازی لە نێوان نێرینە و مێیینەدا نیە، چونکە سەرچاوەی میرات بردنەکەیان بریتی نیە لە عەصەبەگەرایەتی، و هیچکامیان ئەرك و بەرپرسیارێتیان ناکەوێتە ئەستۆ، کەواتە دەبێت جیاوازی نەکرێت لە نێوانیاندا.

سەرەڕای ئەم ڕوون کردنەوەیەش، ئەگەر بگەڕێین بەناو هەموو مەسئەلەکانی میراتدا، دەبینین کە بەشێوەیەکی گشتی بەراوردی نێوان میراتی نێرینە و مێیینە لە چوار حاڵەت بەدەر نیە، کە حاڵەتەکانیش ئەمانەن:

(١) ئەو حاڵەتانەی کە نێرینە دووبەرامبەری مێیینە میرات دەبات.

(٢) ئەو حاڵەتانەی کە مێیینە و نێرینە یەکسانن لە میرات برندا.

(٣) ئەو حاڵەتانەی کە مێیینە لە نێرینە زیاتر میرات دەبات.

(٤) ئەو حاڵەتانەی کە مێیینە میرات دەبات، و ئەگەر نێرینە لە جێگەی ئەو بێت میرات نابات.

## بەراوردێك لەنێوان میراتی نێرینە و مێیینە:

### (١) ئەو حاڵەتانەی کە نێرینە دووبەرامبەری مێیینە میرات دەبات

(١)کچ کاتێك کە لەگەڵ کوڕدا کۆ ببێتەوە. وە کچی کوڕ کاتێك کە لەگەڵ کوڕی کوڕدا کۆببێتەوە. خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿ يُوصِيكُمُ ٱللَّهُ فِيٓ أَوۡلَٰدِكُمۡۖ لِلذَّكَرِ مِثۡلُ حَظِّ ٱلۡأُنثَيَيۡنِ ﴾.

(٢)خوشکی دایك و باوکی کاتێك کە لەگەڵ برای دایك و باوکیدا کۆ ببێتەوە. وە خوشکی تەنها باوکی کاتێك کە لەگەڵ برای تەنها باوکیدا کۆ ببێتەوە. خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿ وَإِن كَانُوٓاْ إِخۡوَةٗ رِّجَالٗا وَنِسَآءٗ فَلِلذَّكَرِ مِثۡلُ حَظِّ ٱلۡأُنثَيَيۡنِ ﴾.

(٣)دایك لە گەڵ باوك دا لە دوو مەسئەلە پرشنگدارەکەدا (غرّاوین)، بەلای زۆرینەی زانایانەوە. هەروەها دایك لەگەڵ باوك دا کاتێك کە مردووەکە منداڵی نەبێت. خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَإِن لَّمْ يَكُن لَّهُۥ وَلَدٌ وَوَرِثَهُۥٓ أَبَوَاهُ فَلِأُمِّهِ ٱلثُّلُثُ﴾. واتە باپیرەکە دووسێیەکەکەی تر دەبات.

یەکێك لە شاعیران دەفەرموێت:

و الثلث فرض الأم حيث لا عدد   من إخوة، و لا لميت ولد

لا من أب و أحد الزوجين   بل ثلث ما يبقى عن الفرضين

(٤)ژن، و مێرد، خودای گەورە دەفەرموێت:﴿وَلَكُمْ نِصْفُ مَا تَرَكَ أَزْوَٰجُكُمْ إِن لَّمْ يَكُن لَّهُنَّ وَلَدٌ فَإِن كَانَ لَهُنَّ وَلَدٌ فَلَكُمُ ٱلرُّبُعُ مِمَّا تَرَكْنَ﴾....... ﴿وَلَهُنَّ ٱلرُّبُعُ مِمَّا تَرَكْتُمْ إِن لَّمْ يَكُن لَّكُمْ وَلَدٌ فَإِن كَانَ لَكُمْ وَلَدٌ فَلَهُنَّ ٱلثُّمُنُ مِمَّا تَرَكْتُم﴾.

## (٢) ئەو حاڵەتانەی کە مێیینە و نێرینە یەکسانن لە میرات بردندا

(١) دایك وەکو باوك میرات دەبات لەکاتێکدا کە مردووەکە کوڕ یان کوڕی کوڕی هەبێت، هەریەکەیان شەش یەك دەبەن، و پاشماوەکەش دەدرێت بە کوڕ یان کوڕی کوڕەکە بە عەصەبەگەرایەتی، خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلِأَبَوَيْهِ لِكُلِّ وَٰحِدٍ مِّنْهُمَا ٱلسُّدُسُ مِمَّا تَرَكَ إِن كَانَ لَهُۥ وَلَدٌ﴾.

(٢) خوشك و برای تەنها دایکی، ئەگەر کەسێك نەبێت کە لە میرات بێبەشیان بکات، هەریەکەیان شەش یەکی میراتەکە دەبەن، ئەگەر بە تەنها بن، خودای گەورە دەفەرموێت: وَلَهُۥٓ أَخٌ أَوْ أُخْتٌ فَلِكُلِّ وَٰحِدٍ مِّنْهُمَا ٱلسُّدُسُ .

(٣) خوشکی دایکی ئەگەر لەگەڵ برای دایکیدا کۆببێتەوە، ئیتر ژمارەیان دوان بێت یان زیاتر، بە هەردووکیانەوە یان بە هەموویانەوە سێیەکی میراتەکە دەبەن، بەبێ جیاوازی نێوان نێرینە و مێیینە، خودای گەورە دەفەرموێت: فَإِن كَانُوٓاْ أَكۡثَرَ مِن ذَٰلِكَ فَهُمۡ شُرَكَآءُ فِي ٱلثُّلُثِۚ .

(٤) کچ کاتێك کە لەگەڵ مامی خۆیدا، کاتێك کە کەسێك نەبێت کە مامەکە لە میرات بێبەش بکات، لەم کاتەدا کچەکە نیوە دەبات وەك خاوەن بەشی دیاریکراو، و مامەکەش (یان هەر عەصەبەیەکی تر) نیوەکەی تر دەبات بە عەصەبەگەرایەتی.

(٥) دایکی دایك کە لەگەڵ باوکی مردوەکەدابێت، و کوڕی کوڕی مردوەکەشیان لەگەڵدابێت، لەم کاتەدا دایکی دایك شەش یەك دەبات، و باوکیش شەش یەك دەبات، و پاشماوەکەش کوڕی کوڕەکە دەیبات بەعەصەبەگەرایەتی.

(٦) لە مەسئەلەی (مشركة) دا برای دایك و باوکی کە کرا بەهاوبەشی خوشك و برا دایکییەکان، ئەو کاتە بە هاوبەشی لەگەڵیاندا سێیەکی میراتەکە دەبەن، بەبێ جیاوازی نێوان نێرینە و مێیینە.

(٧) ئەگەر مردوویەك تەنها یەك کوڕ یان تەنها یەك کچ، یان تەنها باوك، یان تەنها دایك، یان تەنها یەك برا، یان تەنها یەك خوشکی هەبوو، ئەوا جیاوازی نیە لە نێوان نێرینە و مێیینەدا، چونکە تەنها کوڕەکە هەموو میراتەکە دەبات بە عەصەبەگەرایەتی، هەروەها تەنها کچەکەش نیوەی میراتەکە دەبات وەك خاوەن بەشی دیاریکراو، و نیوەکەی تریشی بۆ دەگەڕێنرێتەوە. هەروەها نمونەکانی تریش.

(٨) خوشکی دایك و باوکی (یان تەنها باوکی)، ئەگەر کۆبویەوە لەگەڵ مێرد بۆ نمونە، ئەوا مێردەکە نیوەی میراتەکە دەبات، و خوشکەکەش نیوەکەی تر دەبات، جا ئەگەر لەم نمونەدا لە جێگەی خوشکەکە براش بێت، ئەوا هەر بەو

شێوەیە، مێردەکە نیوە دەبات، و براکەش نیوەکەی تر دەبات بە عەصەبەگەرایەتی، واتە جیاوازی نێوان خوشك و برا نیە لەم نمونەدا.

(٩) خوشکێکی دایکی لەگەڵ هاوایەکی دایك و باوکی لە کاتێکدا کە لەگەڵ مێرد، و دایك دا کۆببنەوە، مێردەکە نیوە دەبات، و دایکەکەش شەش یەك دەبات، و خوشکەکەش شەش یەك دەبات، و پاشماوەکەش (کە شەش یەك دەکات) براکە بە عەصەبەگەرایەتی دەیبات.

(١٠) (ذوو الأرحام) بەلای مەزهەبی (أهل الرحم) ەوە، ئەمانیش لە کاتێکدا کە مردوەکە نە میرات بەری خاوەن بەشی دیاریکراو، و نە عەصەبەی نەبوو، ئەوا میراتەکە بە یەکسانی لە نێوانیاندا دابەش دەکرێت، بەبێ جیاوازی لە نێوان نێرینە، و مێیینە.

## (٣) ئەو حاڵەتانەی کە مێیینە لە نێرینە زیاتر میرات دەبات

(١) کچ کاتێك کە لەگەڵ مێرددا کۆ ببێتەوە، مێردەکە چواریەك دەبات، و کچەکەش نیوە دەبات وەك خاوەن بەشی دیاریکراو، و پاشماوەکەشی بۆ دەگەڕێنرێتەوە.

(٢) دوو کچ کە لەگەڵ مێرددا کۆببنەوە، مێردەکە چواریەك دەبات، و دوو کچەکەش دووسێیەك دەبەن وەك خاوەن بەشی دیاریکراو، و پاشماوەکەشیان بۆ دەگەڕێنرێتەوە.

(٣) کچێك (یان کچی کوڕێك، یان خوشکێکی دایك و باوکی، یان خوشکێکی تەنها باوکی) کاتێك کە لەگەڵ چەند مامێکی خۆیدا (ژمارەیان هەرچەند بێت) کۆببێتەوە، کچەکە بەتەنها نیوە دەبات وەك خاوەن بەشی دیاریکراو، و مامەکانیش بە هەموویانەوە نیوەکەی تر دەبەن بە عەصەبەگەرایەتی.

(٤) ئەگەر ژنێك بمرێت، و (٦٠) دیناری لەپاش بەجێ بمێنێت، و ئەم میرات بەرانەشی هەبێت: مێرد، و باوك، و دایك، و دوو كچ، ئەوا مێردەكە چواریەك دەبات، و باوك و دایكەكەش هەریەكەیان شەش یەك دەبەن، و دوو كچەكەش دووسێیەك دەبەن، كەواتە ئەصڵی مەسئەلەكە بریتیە لە دوازدە (١٢)، بەمەش مێردەكە سێ بەش دەبات، و باوك و دایكەكەش هەر یەكەیان دوو بەش دەبەن، و دوو كچەكەش هەشت بەش دەبەن، كەواتە دەبێت مەسئەلەكە عەولی تێدا بكرێت بۆ پازدە (١٥)، جا ئێستا ئەگەر بێینە سەر دابەش كردنی (٦٠) دینارەكە، ئەوا هەردوو كچەكە بەیەكەوە (٣٢) دینار دەبەن (واتە: یەكی (١٦) دینار). بەڵام ئەگەر لە جێگەی ئەم دوو كچە مردوەكە دوو كوڕی هەبوایە، ئەوا كوڕەكان عەصەبەبوون، و پاشماوەی بەشی خاوەن بەشەكانیان دەبرد، و مەسئەلەكەش پێویستی بە عەول نەدەكرد، و ئەو كاتەش بە هەردوو كوڕەكەوە (٢٥) دینار دەبەن، بەمەش بەشی دوو كچەكە لە بەشی دوو كوڕەكە زیاتر دەبێت.

(٥) ئەگەر پیاوێك بمرێت، و (٤٨) دیناری لەپاش بەجێ بمێنێت، و ئەم میرات بەرانەشی هەبێت: ژنێك، و دایك، دوو خوشكی تەنها دایكی، و دوو برای دایك و باوكی، ئەوا ژنەكە چواریەك دەبات، و دایكەكەش شەش یەك دەبات، و خوشكە دایكییەكانیش سێیەك دەبەن، و براكانیش عەصەبەن، كەواتە ئەصڵی مەسئەلەكە بریتیە لە دوازدە (١٢). بەمەش ژنەكە سێ بەش دەبات، و دایكەكەش دوو بەش دەبات، و خوشكەكانیش چوار بەش دەبەن، و سێ بەشیش دەمێنێتەوە بۆ دوو براكە. ئێستا ئەگەر بێینە سەر دابەش كردنی (٤٨) دینارەكە، ئەوا دوو خوشكەكە (١٦) دینار دەبەن (واتە: یەكی (٨) دینار)، بەڵام دوو براكە (١٢) دینار دەبەن (واتە: یەكی (٦) دینار)، بەمەش بەشی خوشكەكان لە بەشی براكان زیاتردەبێت.

(٦) ئەگەر ژنێك بمرێت، و (١٥٦) دیناری لەپاش بەجێ بمێنێت، و ئەم میرات بەرانەشی هەبێت: مێرد، و باوك، و دایك، و کچێك، ئەوا مێردەکە چواریەك دەبات، و باوك و دایکەکەش هەریەکەیان شەش یەك دەبەن، و کچەکەش نیوە دەبات، کەواتە ئەصڵی مەسئەلەکە بریتیە لە دوازدە (١٢)، بەمەش مێردەکە سێ بەش دەبات، و باوك و دایکەکەش هەر یەکەیان دوو بەش دەبەن، و کچەکەش شەش بەش دەبات، کەواتە دەبێت مەسئەلەکە عەولی تێدا بکرێت بۆ سیازدە (١٣). ئێستا ئەگەر بێینە سەر دابەش کردنی (١٥٦) دینارەکە، ئەوا کچەکە (٧٢) دینار دەبات. بەڵام ئەگەر لە جێگەی ئەم تەنها کچە مردوەکە کوڕێکی هەبوایە، ئەوا ئەم کوڕە عەصەبە دەبوو، و پاشماوەی بەشی خاوەن بەشەکانیان دەبرد، و مەسئەلەکەش پێویستی بە عەول نەدەکرد، و ئەو کاتەش کوڕەکە (٦٥) دیناری دەبرد، بەمەش بەشی کچەکە لە بەشی کوڕەکە زیاتر دەبێت.

(٧) ئەگەر ژنێك بمرێت، و (٤٨) دیناری لەپاش بەجێ بمێنێت، و ئەم میرات بەرانەشی هەبێت: مێرد، و دوو خوشکی دایك و باوکی، و دایك، ئەوا مێردەکە نیوە دەبات، و دایکەکەش شەش یەك دەبات، و دوو خوشکەکەش دووسێیەك دەبەن، کەواتە ئەصڵی مەسئەلەکە بریتیە لە شەش (٦)، بەمەش مێردەکە سێ بەش دەبات، و دایکەکەش یەك بەش دەبات، و خوشکەکانیش چوار بەش دەبەن، کەواتە دەبێت مەسئەلەکە عەولی تێدا بکرێت بۆ هەشت (٨). ئێستا ئەگەر بێینە سەر دابەش کردنی (٤٨) دینارەکە، ئەوا هەردوو خوشکەکە بەیەکەوە (٢٤) دینار دەبەن (واتە: یەکی (١٢) دینار). بەڵام ئەگەر لە جێگەی ئەم دوو خوشکە مردوەکە دوو برای دایك و باوکی هەبوایە، ئەوا براکان عەصەبەبوون، و پاشماوەی بەشی خاوەن بەشەکانیان دەبرد، و مەسئەلەکەش پێویستی بە عەول نەدەکرد، و ئەو کاتەش بە هەردوو براکەوە (١٦) دینار دەبەن، بەمەش بەشی دوو خوشکەکە لە بەشی دوو براکە زیاتر دەبێت. هەروەها لەم مەسئەلەدا ئەگەر

خوشکی تەنها باوکیش بن، و لە جێگەی ئەوان برای تەنها باوکی دابنرێت، ئەوا خوشکەکان هەر لە براکان زیاتر دەبەن.

(٨) ئەگەر ژنێك بمرێت، و (٤٨) دیناری لەپاش بەجێ بمێنێت، و ئەم میرات بەرانەشی هەبێت: مێرد، و خوشکێکی دایك و باوکی، و دایك، ئەوا مێردەکە نیوە دەبات، و دایکەکەش شەش یەك دەبات، و خوشکەکەش نیوە دەبات، کەواتە ئەصڵی مەسئەلەکە بریتیە لە شەش (٦)، بەمەش مێردەکە سێ بەش دەبات، و دایکەکەش یەك بەش دەبات، و خوشکەکەش سێ بەش دەبات، کەواتە دەبێت مەسئەلەکە عەولی تێدا بکرێت بۆ حەوت (٧). ئێستا ئەگەر بێینە سەر دابەش کردنی (٤٨) دینارەکە، ئەوا خوشکەکە (١٨) دینار دەبات. بەڵام ئەگەر لە جێگەی ئەم تەنها خوشکە مردوەکە برایەکی دایك و باوکی هەبوایە، ئەوا براکە عەصەبە دەبوو، و پاشماوەی بەشی خاوەن بەشەکانیان دەبرد، و مەسئەلەکەش پێویستی بە عەول نەدەکرد، و ئەو کاتەش براکە (٨) دیناری دەبرد، بەمەش بەشی خوشکەکە لە بەشی براکە زیاتر دەبێت. هەروەها لەم مەسئەلەدا ئەگەر خوشکێکی تەنها باوکیش بێت، و لە جێگەی ئەو برایەکی تەنها باوکی دابنرێت، ئەوا خوشکەکە هەر لە براکە زیاتر دەبات.

(٩) دایك لەگەڵ باوك لە دوو مەسئەلە پرشنگدارەکەدا (غرّاوین) بەلای مەزهەبی ئیبنو عەباسەوە، دایکەکە سێیەك دەبات، نەك سێیەکی پاشماوە.

(١٠) ئەگەر ژنێك بمرێت، و (٦٠) دیناری لەپاش بەجێ بمێنێت، و ئەم میرات بەرانەشی هەبێت: مێرد، و دایك، و خوشکێکی تەنها دایکی، و دوو برای دایك و باوکی، ئەوا مێردەکە نیوە دەبات، دایکەکەش شەش یەك دەبات، و خوشکەکەش شەش یەك دەبات، و براکانیش عەصەبەن، کەواتە ئەصڵی مەسئەلەکە بریتیە لە شەش (٦)، بەمەش مێردەکە سێ بەش دەبات، و دایکەکەش یەك بەش دەبات، و خوشکەکەش یەك بەش دەبات، و یەك بەشیش

دەمێنێتەوە بۆ دوو براکە، بەمەش ئەو تەنها خوشکە بە ئەندازەی هەردوو براکە میرات دەبات جا ئێستا ئەگەر بێینە سەر دابەش کردنی (٦٠) دینارەکە، ئەوا خوشکەکە بە تەنها (١٠) دینار دەبات، بەلاّم هەردوو براکە بەیەکەوە (١٠) دینار دەبەن (واتە: یەکی (٥) دینار).

هەروەها ئەگەر چاو بگێرِین بە سەرچاوە فیقهیەکاندا ئەوا زۆرێك مەسئەلەی ترمان دەست دەکەوێت کە مێیینە تیایاندا لە نێرینە زیاتر دەبات، بۆیە من بە ئەمەندە واز دەهێنم، و هەرکەس بیەوێت، ئەتوانێت بگەرِێتەوە سەر ئەو سەرچاوانە.

## (٤) ئەو حاڵەتانەی کە مێیینە میرات دەبات، و ئەگەر نێرینە لە جێگەی ئەو بێت میرات نابات

(١) ئەگەر ژنێك بمرێت: مێرد، و باوك، دایك، و کچێك، و کچی کورِێکی هەبێت لەپاش بەجیّ بمێنێت، ئەوا مێردەکە چواریەك دەبات، و هەریەکە لە باوك و دایکەکەش شەش یەك دەبەن، و کچەکەش نیوە دەبات، و کچی کورِەکەش شەش یەك دەبات، کەواتە ئەصڵی مەسئەلەکە بریتیە لە دوازدە (١٢)، مێردەکە سیّ بەش دەبات، و باوك و دایکەکەش یەکی دوو بەش دەبەن، و کچەکەش شەش بەش دەبات، و کچی کورِەکەش دوو بەش دەبات، بەمەش پێویست دەکات ئەصڵی مەسئەلەکە عەولی تێدا بکرێت بۆ پازدە (١٥)، لەبەر ئەوەی کە هەم بەشی کچەکە، و هەم بەشی کچی کورِەکە تەواو بن، بەلاّم ئەگەر لەم مەسئەلەیەدا لە جێگەی ئەو کچی کورِە ئەگەر کورِی کورِێك بوایە، ئەوا عەصەبە دەبوو، وە مەسئەلەکەش تەنها عەولی تێدا دەکرا بۆ سیازدە (١٣) بۆ ئەوەی کە بەشی کچەکە تەواو ببێت، ئیتر هیچ نەدەماوە بۆ کورِی کورِەکە، و لە میراتەکە بیّبەش دەبوو.

(٢) ئەگەر ژنێك بمرێت: مێرد، و خوشكێكی دایك و باوكی، و خوشكێكی تەنها باوكی لەپاش بەجێ بمێنێت، ئەوا مێردەكە نیوە دەبات، و خوشكە دایك و باوكییەكەش نیوە دەبات، و خوشكە تەنها باوكییەكەش شەش یەك دەبات، كەواتە ئەصڵی مەسئەلەكە بریتیە لە شەش، مێردەكە سێ بەش دەبات، و خوشكە دایك و باوكییەكەش سێ بەش دەبات، و خوشكە تەنها باوكییەكەش یەك بەش دەبات، بەمەش پێویست دەكات ئەصڵی مەسئەلەكە عەولی تێدا بكرێت بۆ حەوت (٧) تاوەكو بەشی خوشكە تەنها باوكییەكەش تەواو بكات، بەلاّم ئەگەر لەم مەسئەلەیەدا لە جێگەی ئەو خوشكە تەنها باوكییە ئەگەر برایەكی تەنها باوكی بوایە، ئەوا عەصەبە دەبوو، وە ئەصڵی مەسئەلەكەش بریتی بوو لە دوو (٢)، مێردەكە نیوەی دەبرد، و خوشكەكەش نیوەكەی تریی دەبرد، ئیتر هیچ نەدەماوە بۆ ئەم برا تەنها باوكییە، و لە میراتەكە بێبەش دەبوو.

(٣) داپیرە، لە زۆر مەسئەلەدا میرات دەبات، بەلاّم ئەگەر لەجێگەی ئەو باپیرە بێت، ئەوا میرات نابات. بۆ نمونە: ئەگەر كەسێك بمرێت: دایكی دایك، و باوكی دایكی لەپاش بەجێ بمێنێت، ئەوا دایكی دایكەكە هەموو میراتەكە دەبات (شەش یەك وەك خاوەن بەش، و پاشماوەكەش بە گەڕاندنەوە)، بەلاّم باوكی دایكەكە میرات نابات، چونكە(ذوي الأرحام) ە. یان ئەگەر دایكی دایكی دایك، و باوكی دایكی دایك بەیەكەوە كۆببنەوە، بە هەمان شێوە دایكی دایكەكە هەموو میراتەكە دەبات، بەلاّم باوكی دایكەكە هیچ میرات نابات.

كەواتە لە بەرامبەر هەموو ئەو حاڵەتانەی كە مێیینە وەك نێرینە میرات دەبات، یان لەو زیاتر، یان مێیینە میرات دەبات، و نێرینە نایبات، ئێمە تەنها چوار حاڵەتمان هەیە كە نێرینە زیاتر ببات لە مێیینە، بۆیە دەڵێین:

ئەم خەرافات و ساختەکاری و چەواشەکردنە با بەس بێت، ڕەخنە ئەگەر بابەتی، و بونیاتنەرانە بێت، هەموو کەس و هەموو لایەنێك پێی ڕازیە، بەلاّم هەڵبەستنی درۆی بێ ئەساس، و خەڵەتاندنی خەڵکی سادە و نەشارەزا دەکرێت بۆ ماوەیەك سەربگرێت، بەلاّم هەرکەس کە بیەوێت بەشوێن ڕاستییەکاندا بگەڕێت، دەبێت بچێتە لای خەڵکانی پسپۆڕ و شارەزا، پزیشك نەخۆشی دەدۆزێتەوە، و دەرمان و چارەسەری گونجاوی بۆ دیاری دەکات، بۆیە وازهێنان لەم بەناو ڕەخنە و ساختەکاریانە، کارێکی ژیرانەیە و گەڕان و گەڕانەوەیە بۆ ڕاستییەکان، جا ئەگەر کەسێك چاوی ڕاستی نابینێت، یان نازانێ ڕاستی چییە، یان خۆی گێل دەکات، ئەوە خۆی بەرپرسیارە، ئەگینا وەك وتم چەواشەکاریش تا ماوەیەکە.

## هەندێك لەو لایەنانەی کە نێرینە و مێینەی تێدایەکسانن

ئەو یەکسانییەی کە ئەو ئارەزووپەرستانە بانگەشەی بۆ دەکەن، بۆ نازانن کە ئیسلام لە پێش چواردە سەدەوە دانی پێدا ناوە، و هەرگیز جیاوازی ڕەگەزیش نەبوە بە هۆی لەکەدار کردنی ئەو یەکسانییە، ئەوەتا کە ئیسلام لە زۆر بوار و لایەنی دونیایی و ئاینیش یەکسانی بڕیار داوە لە نێوان نێرینە و مێینە، کە من چەند لایەنێك باس دەکەم:

### (١) لایەنی ئینسانی یەت:

هیچ جیاوازیەك نیە لە نێوان مرۆڤەکاندا لەم لایەنەدا، بەڵکو هەموو کەسێك هەر مرۆڤە و جیاوازی و فەزڵ بۆ هیچ ڕەگەزێك نیە. خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَـٰكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَىٰ ﴿١٣﴾ ﴾الحجرات. وە لە جێگەیەکی تردا

دەفەرمویێت: ﴿ فَٱسۡتَجَابَ لَهُمۡ رَبُّهُمۡ أَنِّي لَآ أُضِيعُ عَمَلَ عَٰمِلٖ مِّنكُم مِّن ذَكَرٍ أَوۡ أُنثَىٰۖ بَعۡضُكُم مِّنۢ بَعۡضٖ ﴿١٩٥﴾ ﴾آل عمران.

## (٢) لایەنی بەرپرسیاری و پاداشت:

خودای گەورە دەفەرمویێت: ﴿ مَنۡ عَمِلَ صَٰلِحٗا مِّن ذَكَرٍ أَوۡ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤۡمِنٞ فَلَنُحۡيِيَنَّهُۥ حَيَوٰةٗ طَيِّبَةٗۖ وَلَنَجۡزِيَنَّهُمۡ أَجۡرَهُم بِأَحۡسَنِ مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴿٩٧﴾ ﴾ النحل. وە لە جێگەیەکی تردا دەفەرمویێت: ﴿ ٱلزَّانِيَةُ وَٱلزَّانِي فَٱجۡلِدُواْ كُلَّ وَٰحِدٖ مِّنۡهُمَا مِاْئَةَ جَلۡدَةٖ ﴿٢﴾ ﴾النور. وە لە جێگەیەکی تردا دەفەرمویێت: ﴿ وَٱلسَّارِقُ وَٱلسَّارِقَةُ فَٱقۡطَعُوٓاْ أَيۡدِيَهُمَا جَزَآءَۢ بِمَا كَسَبَا نَكَٰلٗا مِّنَ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٞ ﴿٣٨﴾ ﴾ المائدة.

## (٣) لایەنی کارکردن:

کە ئیسلام هەرگیز ڕێگەی کارکردن ناگرێت لە مێیینە، بەڵام کارێك کە گونجاوبێت بۆی، و کاریگەری خراپی لەسەر کەرامەتی نەبێت، و نەبێتە هۆی لەدەستدانی کەسایەتی، و ڕێگەی پیشە سەرەکی‌یەکەی لێنەگرێت، کە بریتیە لە سەرپەرشتیاری و پەروەردەی منداڵەکانی لە ماڵەوە و لە چوارچێوەی خێزانەکەی، واتە هەر کار و پیشەیەك هەڵدەبژێرێت ئازادە، بەڵام نابێت ئەو کارە خراپەی کۆمەڵایەتی و ڕەوشتی لێ بکەوێتەوە.

**(٤) لایەنی فێربوونی زانست و ڕۆشنبیری:**

خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿ أَمَّنْ هُوَ قَٰنِتٌ ءَانَآءَ ٱلَّيْلِ سَاجِدًا وَقَآئِمًا يَحْذَرُ ٱلْءَاخِرَةَ وَيَرْجُوا۟ رَحْمَةَ رَبِّهِۦ ۗ قُلْ هَلْ يَسْتَوِى ٱلَّذِينَ يَعْلَمُونَ وَٱلَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ ۗ إِنَّمَا يَتَذَكَّرُ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿٩﴾ ﴾الزمر.

**(٥) لایەنی کاروباری شارستانی:**

ئیسلام بڕیاری داوە کە مێیینە پرسی پێ بکرێت لە کاتی بەشوودانی، حەزرەتی پێغەمبەر دەفەرموێت: لا تنكح الأيم (الثيب) حتى تستأمر ولا تنكح البكر حتى تستأذن ). قالوا يا رسول الله وكيف إذنها؟ قال: أن تسكت.[١] وە ئەگەر طلاقی ڕەجعی کەوتە نێوان ئەو و مێردەکەی، نابێت زۆری لێ بکرێت کە بگەڕێتەوە لای مێردەکەی، یان ئەگەر طلاقی بائینە بوو، نابێت زۆری لێ بکرێت کە شوو بکات بە کەسێکی تر. خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا يَحِلُّ لَكُمْ أَن تَرِثُوا۟ ٱلنِّسَآءَ كَرْهًا ۖ وَلَا تَعْضُلُوهُنَّ لِتَذْهَبُوا۟ بِبَعْضِ مَآ ءَاتَيْتُمُوهُنَّ إِلَّآ أَن يَأْتِينَ بِفَٰحِشَةٍ مُّبَيِّنَةٍ ۚ ﴿١٩﴾ ﴾النساء.

**(٦) لایەنی دارایی و مالی:**

ئیسلام ئازادییەکی ڕەهای داوە بە هەموو کەسێك لە چۆنێتی تەصەڕوف کردن لە ماڵ و موڵکی خۆیدا، بەبێ جیاوازی ڕەگەز.

کەوابوو ئەم یەکسانییە لەم هەموو لایەن و بوارانەدا کە ئیسلام بڕیاری لەسەر داوە، و ئافرەتی موسوڵمان بۆی هەیە هەرکاتێك کە هەستی کرد کە ئەم

---

١) متفق عليه، البخاري ٤٨٤٣، و مسلم ١٤١٩.

مافە پێشێل دەکرێت لەلایەن هەر کەسێکەوە، ئەوا بۆی هەیە، نەك تەنها ئەو، بەڵکو پیاویش ئەگەر هەستی بە پێشێلکاری کرد، هەردووکیان بۆیان هەیە داوای خۆیان بکەن بۆ گەڕاندنەوەی بارودۆخەکە بۆ سەر حاڵەتی سروشتی خۆی، وە ئەگەر پێشێلکاریییەکانیش لەلایەن هەر کەسێکەوە بێت، ئەوا ئەو کەسە خۆی بەرپرسیارە، نەك ئاینی ئیسلام، چونکە وەك وتمان: ئیسلام وەك بەرنامە و ئاین مافی هەموو کەسێکی داوە، بەڵام ئەگەر پێشێلکاری و زەوتکردن لە لایەن هەر کەس و کۆمەڵەیەکەوە بکرێت، ئەوە ئیسلام لێی بەرپرسیار نیە، چونکە بەرنامەی خودای کاربەجێیە، و هەر ئەویش بەرژەوەندی مرۆڤەکان باشتر دەزانێت، و ستەمیش لە هیچ کەسێك ناکات.

ئەوەندەم ماوە کە بڵێم:

سوپاس و ستایشی خوای گەورە دەکەم لە سەرەتا و لە کۆتایی هەموو کارەکانمدا، خوایە ئەم بەرهەمە بکەیت بە بەشێك لەو کردەوانەی کە لە ماوەی تەمەنمدا کردوومن، و جەنابیشت لێیان ڕازیت، و بە توێشووی دواڕۆژم وەرت گرتبێت، مایەی سوودگەیاندن بێت بە موسوڵمانان، لە خۆم و باوك و دایك و هەموو خۆشەویستەکانم خۆشبیت، و دەپاڕێمەوە لە بەردەم دەرگای پڕسۆز و میهرت، کە هەمیشە ئەو دەرگایەت لە ڕووماندا والا بێت، و پاشەڕۆژمان بە خێر بگێڕیت، بەم پاڕانەوانەی حەزرەتی پێغەمبەر ڕوو دەکەمە بارەگای بە کەرەمت، کە کۆتایی ئەم نوسراوە بێت، بە ئومێدی وەرگرتن و پیێ ڕازی بوون:

اللهم إني أعوذ بك من من علم لا ينفع، ومن قلب لا يخشع، ومن نفس لا تشبع، ومن دعاء لا يسمع، أعوذ بك من هؤلاء الأربع.[1]

١) الترمذي ٣٤٨٢، النسائي ٥٤٧٠، أحمد ١٤٠٥٥، المستدرك ٣٥٦.

اللهم أصلح لي ديني الذي هو عصمة أمري وأصلح لي دنياي التي فيها معاشي وأصلح لي آخرتي التي فيها معادي واجعل الحياة زيادة لي في كل خير واجعل الموت راحة لي من كل شر.[١]

يا حي يا قيوم برحمتك أستغيث أصلح لي شأني كله و لا تكلني إلى نفسي طرفة عين.[٢]

اللهم اغفر لي ما قدمت وما أخرت وما أسررت وما أعلنت وما أنت أعلم به مني اللهم ارزقني من طاعتك ما يحول بيني وبين معصيتك وارزقني من خشيتك ما تبلغني به من رحمتك وارزقني من اليقين ما تهون به علي مصائب الدنيا وبارك في سمعي وبصري واجعلهما الوارث مني..... ولا تجعل مصيبتي في ديني ولا تجعل الدنيا أكبر همي ولا مبلغ علمي.[٣]

اللهم عافني في جسدي وعافني في بصري واجعله الوارث مني لا إله إلا الله الحليم الكريم سبحان الله رب العرش العظيم الحمد لله رب العالمين.[٤]

و صلى الله على أكرم الأكرمين، سيد المرسلين، شفيع المذنبين، محبوب رب العالمين، و آله و صحبه أجمعين، و علينا معهم. آمين.

أمجد محمد زاهد شيخ محمد

دەربەندیخان / ٢٨ ی رەمەزان

٢٨ / ٩ / ٢٠٠٨

---

٢) مسلم ٢٧٢٠.

٣) المستدرك ٢٠٠٠، المعجم الصغير ٤٤٤، النسائي الكبرى ١٠٤٠٥.

٤) المعجم الصغير ٨٦٦.

٥) الترمذي ٣٤٨٠، المستدرك ١٩٤١، مسند أبي يعلى ٤٦٩٠، مصنف ابن أبي شيبة ٢٩٣١٤.

# لیستی سەرچاوەکان

(١) القرآن الكريم.

(٢) کتێبەکانی فەرموودە :

◊ الآحاد والمثاني، تأليف: أحمد بن عمرو بن الضحاك أبو بكر الشيباني، دار النشر: دار الراية - الرياض - ١٤١١ - ١٩٩١، الطبعة: الأولى، تحقيق: د. باسم فيصل أحمد الجوابرة .

◊ الجامع الصحيح سنن الترمذي / محمد بن عيسى أبو عيسى الترمذي السلمي / تحقيق: أحمد محمد شاكر وآخرون / دار إحياء التراث العربي – بيروت / عدد الأجزاء: ٥ / الأحاديث مذيلة بأحكام الألباني عليها.

◊ الجامع الصحيح المختصر / محمد بن إسماعيل أبو عبدالله البخاري الجعفي / تحقيق: د. مصطفى ديب البغا أستاذ الحديث وعلومه في كلية الشريعة - جامعة دمشق / دار ابن كثير، اليمامة – بيروت / الطبعة الثالثة، ١٤٠٧ – ١٩٨٧ / عدد الأجزاء: ٦.

◊ حلية الأولياء وطبقات الأصفياء / أبو نعيم أحمد بن عبد الله الأصبهاني / دار الكتاب العربي – بيروت / الطبعة الرابعة، ١٤٠٥ / عدد الأجزاء: ١٠.

◊ سنن ابن ماجه / محمد بن يزيد أبو عبدالله القزويني / تحقيق: محمد فؤاد عبد الباقي /دار الفكر – بيروت /عدد الأجزاء: ٢ / تعليق محمد فؤاد عبد الباقي / والأحاديث مذيلة بأحكام الألباني عليها.

◊ سنن أبي داود / سليمان بن الأشعث أبو داود السجستاني الأزدي / تحقيق: محمد محيي الدين عبد الحميد / دار الفكر / عدد الأجزاء: ٤ / مع الكتاب: تعليقات كَمَال يوسُفْ الحوُت / والأحاديث مذيلة بأحكام الألباني عليها.

◊ سنن البيهقي الكبرى / أحمد بن الحسين بن علي بن موسى أبو بكر البيهقي / تحقيق: محمد عبد القادر عطا / الناشر: مكتبة دار الباز - مكة المكرمة، ١٤١٤ – ١٩٩٤ / عدد الأجزاء: ١٠.

◊ سنن الدارقطني / علي بن عمر أبو الحسن الدارقطني البغدادي / تحقيق: السيد عبد الله هاشم يماني المدني / دار المعرفة - بيروت، ١٣٨٦ – ١٩٦٦ / عدد الأجزاء: ٤.

◊ سنن الدارمي / عبدالله بن عبدالرحمن أبو محمد الدارمي / تحقيق: فواز أحمد زمرلي ، خالد السبع العلمي / دار الكتاب العربي – بيروت / الطبعة الأولى، ١٤٠٧ / عدد الأجزاء: ٢ / الأحاديث مذيلة بأحكام حسين سليم أسد عليها.

◊ السنن الكبرى، تأليف: أحمد بن شعيب أبو عبد الرحمن النسائي، دار النشر: دار الكتب العلمية - بيروت - ١٤١١ - ١٩٩١، الطبعة: الأولى، تحقيق: د.عبد الغفار سليمان البنداري ، سيد كسروي حسن .

◊ شعب الإيمان / أبو بكر أحمد بن الحسين البيهقي / دار الكتب العلمية – بيروت / الطبعة الأولى ، ١٤١٠ / تحقيق : محمد السعيد بسيوني زغلول / عدد الأجزاء : ٧ .

◊ صحيح ابن حبان بترتيب ابن بلبان / محمد بن حبان بن أحمد أبو حاتم التميمي البستي / تحقيق: شعيب الأرنؤوط / مؤسسة الرسالة – بيروت / الطبعة الثانية، ١٤١٤ – ١٩٩٣ / عدد الأجزاء: ١٨ / الأحاديث مذيلة بأحكام شعيب الأرنؤوط عليها.

◊ صحيح مسلم / مسلم بن الحجاج أبو الحسين القشيري النيسابوري / تحقيق: محمد فؤاد عبد الباقي / دار إحياء التراث العربي – بيروت / عدد الأجزاء: ٥ / مع الكتاب: تعليق محمد فؤاد عبد الباقي.

◊ المجتبى من السنن / أحمد بن شعيب أبو عبد الرحمن النسائي / تحقيق: عبدالفتاح أبو غدة / مكتب المطبوعات الإسلامية – حلب / الطبعة الثانية، ١٤٠٦ – ١٩٨٦ / عدد الأجزاء: ٨ / الأحاديث مذيلة بأحكام الألباني عليها.

◊ المستدرك على الصحيحين / محمد بن عبدالله أبو عبدالله الحاكم النيسابوري / تحقيق: مصطفى عبد القادر عطا /دار الكتب العلمية – بيروت / الطبعة الأولى، ١٤١١ – ١٩٩٠ / عدد الأجزاء: ٤ / مع الكتاب: تعليقات الذهبي في التلخيص.

◊ مسند ابن الجعد، تأليف: علي بن الجعد بن عبيد أبو الحسن الجوهري البغدادي، دار النشر: مؤسسة نادر - بيروت - ١٤١٠ - ١٩٩٠، الطبعة: الأولى، تحقيق: عامر أحمد حيدر .

◊ مسند أبي يعلى / أحمد بن علي بن المثنى أبو يعلى الموصلي التميمي / تحقيق: حسين سليم أسد / دار المأمون للتراث – دمشق / الطبعة الأولى، ١٤٠٤ – ١٩٨٤ / عدد الأجزاء: ١٣ / الأحاديث مذيلة بأحكام حسين سليم أسد عليها.

◊ مسند الإمام أحمد بن حنبل / أحمد بن حنبل أبو عبدالله الشيباني / مؤسسة قرطبة – القاهرة / عدد الأجزاء: ٦ / الأحاديث مذيلة بأحكام شعيب الأرنؤوط عليها.

◊ مسند أبي داود الطيالسي، تأليف: سليمان بن داود أبو داود الفارسي البصري الطيالسي، دار النشر: دار المعرفة - بيروت - .

◊ مصنف عبد الرزاق / أبو بكر عبد الرزاق بن همام الصنعاني / تحقيق: حبيب الرحمن الأعظمي / المكتب الإسلامي – بيروت / الطبعة الثانية، ١٤٠٣ / عدد الأجزاء: ١١.

◊ المصنف في الأحاديث والآثار / أبو بكر عبد الله بن محمد بن أبي شيبة الكوفي / تحقيق: كمال يوسف الحوت / مكتبة الرشد – الرياض / الطبعة الأولى، ١٤٠٩ / عدد الأجزاء: ٧.

◊ المعجم الأوسط / أبو القاسم سليمان بن أحمد الطبراني / تحقيق: طارق بن عوض الله بن محمد ،عبد المحسن بن إبراهيم الحسيني / دار الحرمين - القاهرة، ١٤١٥ / عدد الأجزاء: ١٠.

◊ المعجم الكبير / سليمان بن أحمد بن أيوب أبو القاسم الطبراني / تحقيق: حمدي بن عبدالمجيد السلفي / مكتبة العلوم والحكم – الموصل / الطبعة الثانية، ١٤٠٤ – ١٩٨٣ / عدد الأجزاء: ٢٠.

◊ موطأ الإمام مالك / مالك بن أنس أبو عبدالله الأصبحي / رواية يحيى الليثي / تحقيق: محمد فؤاد عبد الباقي / دار إحياء التراث العربي – مصر / عدد الأجزاء: ٢.

(٣) تەفسیرەکان:

◊ تفسير القرآن العظيم، إسماعيل بن كثير الدمشقي / دار إحياء التراث العربي – بيروت / ١٩٦٩ – ١٣٨٨.

◊ الدر المنثور / عبد الرحمن بن الكمال جلال الدين السيوطي / دار الفكر - بيروت، ١٩٩٣ / عدد الأجزاء: ٨.

(٤) کتێبەکانی شەرحی فەرمودە:

◊ الاستذكار / أبو عمر يوسف بن عبد الله بن عبد البر النمري / دار الكتب العلمية – بيروت / الطبعة الأولى ، ١٤٢١ – ٢٠٠٠ / تحقيق : سالم محمد عطا ، محمد علي معوض / عدد الأجزاء : ٨

◊ عمدة القاري شرح صحيح البخاري / طبعة قديمة.

◊ عون المعبود شرح سنن أبي داود، تأليف: محمد شمس الحق العظيم آبادي، دار النشر: دار الكتب العلمية - بيروت - ١٩٩٥م، الطبعة: الثانية .

◊ فتح الباري شرح صحيح البخاري، أحمد بن علي بن حجر أبو الفضل العسقلاني الشافعي / تحقيق: أحمد بن علي بن حجر أبو الفضل العسقلاني الشافعي / دار المعرفة - بيروت، ١٣٧٩ / عدد الأجزاء: ١٣

◊ فيض القدير شرح الجامع الصغير، تأليف: عبد الرؤوف المناوي، دار النشر: المكتبة التجارية الكبرى - مصر - ١٣٥٦هـ، الطبعة: الأولى .

◊ المنهاج شرح صحيح مسلم بن الحجاج / أبو زكريا يحيى بن شرف بن مري النووي / دار إحياء التراث العربي – بيروت / الطبعة الثانية، ١٣٩٢ / عدد الأجزاء: ١٨.

(٥) کتێبە فیقهیەکان:

◊ تحفة الطلاب بشرح تحرير تنقيح اللباب، قاضي زكريا الأنصاري / و عليه : المختصر الحاوي لجواهر حاشية الشرقاوي ، تحقيق و إعداد: خلف مفضي جبر المطلق / دار الفكر _ دمشق / الطبعة الأولى / ١٤٢٧ _ ٢٠٠٦ .

◊ تحفة المحتاج بشرح المنهاج، أحمد بن حجر الهيتمي، مع حاشيتي الشرواني و ابن قاسم العبادي / دار إحياء التراث العربي / مؤسسة التأريخ العربي – بيروت – لبنان.

◊ حاشية إعانة الطالبين على حل ألفاظ فتح المعين لزين الدين المليباري : أبو بكر الدمياطي المصري / مطبعة : مصطفى الباني الحليي و أولاده بمصر / ط ٢ / ١٣٥٦ _ ١٩٣٨ .

◊ حاشية الباجوري على شرح الشنشوري على متن الرحبية / المكتب الإسلامي _ بيروت _ دمشق _ عمان / ط ٢ / ١٤١٧ _ ١٩٩٧ .

◊ حاشية البجيرمي على منهج الطلاب / قاضي القضاة الشيخ زكريا الأنصاري ، ت ٩٢٦ هـ / مطبعة : مصطفى محمد _ صاحب المكتبة التجارية الكبرى بمصر .

◊ حاشية الجمل على شرح المنهج / سليمان بن عمر بن منصور الشافعي / دار الكتب العلمية / بيروت _ لبنان / ط ١ / ١٤١٧ _ ١٩٩٦ .

◊ شرح الرحبية ، الشيخ محمد الدمشقي المصري الشافعي / و معه كتاب : الدرة البهية بتحقيق مباحث الرحبية ، محمد محي الدين عبد الحميد / مكتبة و مطبعة : محمد علي صبيح و أولاده / ميدان الأزهر / م. السعادة _ مصر .

◊ شرح المحلي على منهاج الطالبين، جلال الدين المحلي، مع حاشيتي القليوبي و عميرة / دار إحياء الكتب العربية – مصر / ط ١ / ١٩٢١ – ١٣٤١.

◊ شرح المنظومة الرحبية في علم المواريث / للإمام موفق الدين الرحبي ، و يليه : الكنوز الملية أسئلة و أجوبة للشيخ عبد العزيز المحمد السلمان / دار ابن الجوزي _ القاهرة / ١٤٢٩ _ ٢٠٠٨ ، ضمن سلسلة شرح المتون العلمية .

◊ فتح الجواد بشرح الأرشاد، ابن حجر الهيتمي / منشورات محمد علي بيضون / / دار الكتب العلمية / بيروت _ لبنان / ط ١ / ١٤٢٦ _ ٢٠٠٥ .

◊ الفقه الإسلامي و أدلته، الدكتور وهبة الزحيلي / دار الفكر – دمشق – سورية / دار الفكر المعاصر – بيروت – لبنان / ط ٤ / ١٩٩٧ – ١٤١٨.

◊ اللمع المغيث في علم المواريث ، الدكتور أحمد مصطفى سليمان البرياني / مطبعة جامعة صلاح الدين _ أربيل / ٢٠٠٧ .

◊ المبسوط، محمد بن أحمد بن أبي سهل السرخسي، دار المعرفة / بيروت / عدد الأجزاء: ثلاثون جزءاً.

◊ المجموع شرح المهذب، أبي زكريا محي الدين النووي – محمد نجيب المطيعي / دار إحياء التراث العربي للطباعة و النشر و التوزيع / ط ١٩٩٥ – ١٤٢٨.

◊ المحلى، ابن حزم الأندلسي – ت: أحمد محمد شاكر/ دار إحياء التراث العربي – بيروت – لبنان / ط ٢ / ٢٠٠١ – ١٤٢٢.

◊ المغني في فقه الإمام أحمد بن حنبل الشيباني / عبد الله بن أحمد بن قدامة المقدسي أبو محمد /دار الفكر – بيروت / الطبعة الأولى، ١٤٠٥ / عدد الأجزاء: ١٠.

◊ مغني المحتاج إلى معرفة معاني ألفاظ المنهاج، محمد الشربيني الخطيب / دار إحياء التراث العربي – بيروت – لبنان / ط ١٩٥٨.

◊ المفصل في أحكام المرأة و البيت المسلم / الدكتور عبد الكريم زيدان .

◊ المهذب بشرح المجموع، الشيرازي / دار إحياء التراث العربي للطباعة و النشر و التوزيع / ط ١٩٩٥ – ١٤٢٨.

◊ الموسوعة الفقهية / وزارة الأوقاف و الشؤون الإسلامية الكويتية / ط ٥ / ١٤٢٥ _ ٢٠٠٥ .

◊ الميراث المقارن ، محمد عبد الرحيم الكشكي / منشورات دار النذير للطباعة و النشر _ بغداد / ط ٣ / ١٣٨٩ _ ١٩٦٩ .

◊ نهاية المحتاج إلى شرح المنهاج، شمس الدين الرملي، مع حاشيتي الشبراملسي و الرشيدي / دار إحياء التراث العربي / مؤسسة التأريخ العربي / بيروت – لبنان.

◊ شەریعەتی ئیسلام : مەلا عبد الكريمی مدرس / چاپی یەکەم / چاپخانەی سلمان الأعظمي _ بغداد / ١٣٩٠ _ ١٩٧٠ .

◊ بەشکردنی میرات ، ڕوونکردنەوەی قطر العارض في علم الفرائض للشيخ معروف النودهي ، عبد الله عبد العزيز هەرتەلی / چاپی یەکەم / چاپخانەی وەزارەتی ڕۆشنبیری _ هەولێر / ١٤٢٢ _ ٢٠٠١ .

(٦) هەندێك سەرچاوەی تریش کە لە جێگەی خۆیاندا ئاماژەم پێداون .

# ناوەڕۆك